٢

# شانازی مرۆڤایەتی

محمد صلى الله عليه وسلم

(ئەمانەت - تەبلیغ - فەتانەت)

# نووری نەمر

محمد فتح الله گولەن



# شانازیی مرۆڤایەتی

# نووری نەمر

# ٢

(ئەمانەت - تەبلیغ - فەتانەت)

محمد فتح الله گولەن

# شانازی مرۆڤایەتی

# نووری ئەمر

## ٢

## (ئەمانەت - تەبلیغ - فەتانەت)


نووسینی

**محمد فتح الله گولەن**



وەرگێڕانی

**دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی گانی عیرفان**

چاپی یەکەم

**تەممووز ٢٠١٣**

**تیراژ: ٥٠٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردنی (٢٢١٨)ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێبەخشراوە**

**شوێنی چاپ**

Neşe Basım-Yayım

Neşe Matbaacılık- İstanbul - TURKEY
+90 212 886 8330
www.nesematbaacilik.com





**دەزگای چاپ و پەخشی گانی عیرفان**
www.irfanpublishing.com

# پێڕستی بابەتەکان


پێشەکی ........................................ ١٠

ئاکاری پێغەمبەران

دووەم: ئەمانەت-ئەمینی ........................................ ٢٤

ئەمنیەت لە پێغەمبەری خوادا ........................................ ٢٧

أ) ئەمنیەتی سەروەرمان بەرامبەر ئەرکی پێغەمبەرێتی .......... ٢٧

ب) بەرامبەر هەموو بوونەوەران ئەمین بوو ........................ ٣١

ج) بانگهێشت کردنی ئوممەتەکەی بەرەو ئەمنیەت ............ ٣٦

د) ئەمنیەت لە کاتی هیجرەتدا ........................ ٤٢

هـ) ئەمنیەت لە مەیدانی جەنگدا ........................ ٤٣

و) تەسلیمیەتی سەرسوورهێن ........................ ٤٤

ی) ئەی خونچەکانی ئومێد! ........................ ٥٢

سێیەم: تەبلیغ ........................................ ٥٣

أ) سێ بنەمای تەبلیغ ........................ ٥٥

١. گشتگیری ........................ ٥٦

٢. چاوەڕێ نەکردنی پاداشت ........................ ٥٨

٣. بەجێهێشتنی ئەنجام بۆ خوای گەورە ........................ ٥٨

ب) شێوازی تەبلیغ ........................ ٥٩

١. بانگەواز بەشێك بوو لە سروشتی ........................ ٦٦

٢. سوور بوون لەسەر تەبلیغ ........................ ٦٨

بانگەوازی ئەبوتالیب ........................ ٦٨

بانگەوازی وەحشی ........................ ٧٠

بانگەوازی عیکریمە ........................................ ٧٥
٣. دەردی تەبلیغ خەوی زڕاندبوو ............................ ٧٨
٤. عەشقی تەبلیغ لای هاوەڵان .............................. ٨١
ج) پەیام بۆ سەرۆك دەوڵەتان ............................... ٨٤
١. نەجاشی .............................................. ٨٤
٢. هەرقل ................................................ ٨٦
٣. ئەوانی تر ............................................ ٨٩
د) حودەیبیە لە ڕوانگەی تەبلیغەوە .......................... ٩٠
هـ) تاك لە ڕوانگەی تەبلیغەوە .............................. ٩١
و) بەهرەمەندیی لوتفی خوایی .............................. ٩٣
ی) چەند تایبەتمەندییەکی گرنگی تەبلیغ ...................... ٩٧
١. باش ناسینی تاکەکان .................................... ٩٨
٢. بەکردەوە کردنی ئەو شتانەی بانگەوازیان بۆ دەکرێت .......... ١٠٣
٣. چاوەڕێ نەکردنی پاداشت ................................. ١٠٧
**چوارەم: فەتانەت** ...................................... ١١٣
أ) فەتانەتی پێغەمبەرمان .................................. ١١٥
ب) چەند نموونەیەك ........................................ ١١٨
نۆژەنکردنەوەی کەعبە ...................................... ١١٨
چاك ناسینی دوژنراوەکانی .................................. ١٢٠
قسەکردن بەگوێرەی دوژنراو ................................. ١٢٢
وتارەکەی حونەین .......................................... ١٢٥
ج) گوفتارەکانی پێغەمبەرمان لە ڕوانگەی فەتانەتەوە ............ ١٣٢

شیکاری چەپکێک فەرموودە ........................ ١٤٢
١. چەند ترۆپکەپەیڤێك سەبارەت بە تەوحید ........ ١٤٢
٢. مرۆڤ ڕێبوارە ................................... ١٤٣
٣. سەرەنجامی ڕاستی و درۆ .......................... ١٤٤
٤. مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدایە کە خۆشی دەوێت ............ ١٤٨
٥. تەقوا ........................................... ١٤٩
٦. خۆتان چۆن بن، وەها فەرمانڕەوایی دەکرێن ........ ١٥٠
٧. کار و کردەوەکان بەگوێرەی نییەتن ............... ١٥٤
نییەت ........................................... ١٥٥
هیجرەت ......................................... ١٥٨
هیجرەت لە گوناه ................................ ١٥٩
هیجرەت بەرەو ڕەحمەتی ئیلاهی ................... ١٦٠
٨. بەڵای زمان و دەست .............................. ١٦٣
ئیمانداری نموونەیی ............................... ١٦٣
سیلم و موسوڵمان ................................ ١٦٤
بۆچی دەست و زمان؟ .............................. ١٦٥
٩. وازهێنان لەوەی پەیوەندی پێتەوە نییە،
لە جوانی ئیسلامەتییەوەیە ......................... ١٦٨
جددییەتی ناخ لە ڕواڵەتدا ڕەنگ دەداتەوە .......... ١٦٩
هەستی ئیحسان و جددییەت .......................... ١٧٠
ئیتقان لە هەموو کارێکدا ........................... ١٧١
"ما لا یعني" چییە؟ ................................. ١٧٢

١٠. ئارامگری ........................ ١٧٣
سەردانی گۆڕ ........................ ١٧٣
جۆرەکانی ئارامگری ........................ ١٧٤
حاڵەت گۆڕین ........................ ١٧٥
١١. دەستی باڵا (بەخشەر) ........................ ١٧٨
هەندێ جار وەرگر باشترە ........................ ١٨٠
ئامۆژگارییەکان........................ ١٨١
پێوەری نێودەوڵەتی ........................ ١٨٢
١٢. ئەو سێ تاقمەی لە قیامەتدا گرنگییان پێنادرێت ........................ ١٨٢
پوختەواتا ڕۆڵی ڕوانینگا دەبینێ ........................ ١٨٣
سێ بێبەشی ........................ ١٨٤
بێبەش بوون لە ئاخاوتن ........................ ١٨٤
بێبەش بوون لە نەزەری ئیلاهی ........................ ١٨٥
بێبەش بوون لە تەزکیە ........................ ١٨٦
عاقیبەت: سزایەکی بەسوێ ........................ ١٨٦
خۆ بەزلزانی و لووتبەرزی ........................ ١٨٧
منەتکار ........................ ١٨٩
سزایەك لە ڕەگەزی کردار ........................ ١٩١
١٣. بەڵای زمان و عیففەت ........................ ١٩٢
قسەکردن نیعمەتە ........................ ١٩٣
ئەدەب لە قسەکردندا ........................ ١٩٤
نێوان دامێن ........................ ١٩٥
ویلایەتی ستوونی ........................ ١٩٧

١٤. ئەو کردەوانەی هەڵەکان دەسڕنەوە و پلەکان بەرز دەکەنەوە ....... ٢٠٠
ئامانج نوێژە ........................................ ٢٠٢
ئامادەکاری بۆ نوێژ ........................................ ٢٠٣
سڕینەوەی هەڵەکان ........................................ ٢٠٦
ڕیباط ........................................ ٢٠٧
١٥. مژدەگەلێکی چاوەڕوانەکراو بۆ بەندە صالحەکان ............ ٢١٢
١٦. بەهەشت بە ناڕەحەتی دەورەدراوە و، دۆزەخیش بە شەهوەت ..... ٢١٦
١٧. سێ ماف: مافی خوا، مافی دەوڵەت، مافی دین ........... ٢٢١
١٨. دووجار گەستران لە یەك کونەوە ........................ ٢٢٤
١٩. مرۆڤەکان وەك کانزان ........................................ ٢٢٥
٢٠. ستەم بێ سزا نامێنێتەوە ........................................ ٢٢٧
٢١. حەوت کۆمەڵ لە سێبەری عەرشدا ........................ ٢٢٩
٢٢. دنیا سێبەرێکە ........................................ ٢٣٣
٢٣. پێنج شت کە نەدراوە بەوانەی پێشووتر ........................ ٢٣٣
٢٤. ئیماندار مرۆڤی بەرپرسیارێتییە ........................ ٢٣٨
٢٥. چەند حەرام و مەکرووهێك ........................................ ٢٤٠
یاخی بوون لە دایك ........................................ ٢٤١
زیندەبەچاڵ کردنی کچان ........................................ ٢٤١
ناپاکیی لە ئەمانەتدا ........................................ ٢٤٢
قسە و قسەڵۆك ........................................ ٢٤٣
پرسیاری زۆر ........................................ ٢٤٤
بەفیڕۆدانی سەروەت و سامان ........................................ ٢٤٥
٢٦. ئیحسان ........................................ ٢٤٦

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

## پێشەكی

باسكردنی كەسایەتیی بەرز و ناوازەی حەزرەتی محمد المصطفى (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، زیاد لە باسكردنیش، پێشكەش كردنی وەك چارەیەك بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی و، ئیكسیرێك بۆ دەردە ناسۆرەكانی.. هەروەها ناساندنی ژیانی موبارەكی بە شێوەیەك كە شایستەی ئەو زاتە مەزنە بێت، لەو بابەتە گرنگانەیە كە وەك زۆر كەسی تر، دنیای هزر و هەستی منیشی خستبووە ژێر فشارەوە و لە هەموو ڕوویەكەوە بووبووە خواست و خولیایەكی بەرنەگیراو...

ئەو مایەی شانازی مرۆڤایەتییە. ئەوەتا چواردە سەدەیە لە سەرانسەری دنیادا، گەورەترین بیرمەند و كەڵەفەیلەسوف و ئەو زانا و ڕووناكبیرانەش كە هەر یەكەیان ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هزر و بیرمانن، لە دوایەوە دەستەنەزەر وەستاون و، لە ڕوویدا دەڵێن: "تۆ ئەو مرۆڤەیت كە شانازی بە شوێنكەوتەییتەوە دەكەین."

بۆ گەورەیی ئەو ئەوەندە بەسە كە سەرباری ئەو هەموو تێكدان و كاولكارییە ماددی و مەعنەوییانەی لەم چەرخەدا كراون، كەچی هێشتا لە منارەكانەوە زایەڵەی "أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله" دەبیستین و، شاباڵ گرتەی ڕۆحی ڕەوانی موحەممەدی بە هەموو لایەكدا دەبینین و، لەگەڵ ڕۆحانییەكاندا ڕۆژی پێنج جار ئێمەش دێینە جۆش و خرۆش.. دیسانەوە سەبارەت بە مەزنی و شكۆی ئەو دەتوانین بڵێین: سەرەڕای هەوڵی سەروبڕی دوژمنانی دین لە ناوەوە و دەرەوە لەپێناو گومڕاكردن و لەڕێ لادانی نەوەی نوێ، كەچی وا ئەمڕۆ چەندەها لاوی تازە پێگەیشتوو، هەرچەند لە قۆناغێكی زەمەنی ئەوتۆشدان كە دەركككردنیان بە "حەقیقەتی ئەحمەدی" وەك پێویست سەخت و دژوارە، چەشنی بەرەو پیرچوونی پەروانە بۆ ڕووناكی، بەرەو حەزرەتی موحەممەد باڵ دەگرن.

بەم کارەشیان هەڵوێستێك دەنوێنن کە لە دنیادا هاوتای نییە. دەستی زەمەن کۆتاتر بوو لەوەی بتوانێت هیچ حەقیقەتێکی تایبەت بەو لە ناخماندا کۆن و ڕەنگپەڕ بکات. بەڵێ، ئەو هێشتا تەڕو تازەیە لە سینەماندا. هەروەك زۆرجار بە دۆستەکانیشم دەڵێم، هەرکات دەچمە مەدینەی مونەووەرە، بۆن و بەرامەی ئەو سەروەرە بە جۆرێ دەمپێچێت، هەر دەڵێی هەنگاوێك لەولاترەوە بەخۆی شاد دەبم و بە دەنگە ژیانبەخشەکەیەوە پێم دەڵێ: "مَرْحَباً، أَهْلاً وَسَهْلاً" و بەخێرهاتنم دەکات. جا ئیتر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە نێوماندا تا ئەو ڕادەیە زیندە و تازەیە، هەر واش بە تازەیی و پاراویی دەمێنێتەوە.

بەڵێ، زەمەن پیر دەبێت و بەساڵا دەچێت. هەروەك چۆن هەندێك فیکر و بۆچوونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بەها دەکەون. کەچی حەزرەتی موحەممەد بە وێنەی ئەو خونچەیەی کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاڵتر و پاراوتر دەبێ، هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە.

پێم وایە ئەگەر هێندەی کەسانی دی کە شتانی تر باس دەکەن بمانتوانیبایە پێغەمبەری نازدار باس بکەین - کە بەداخەوە نەمانتوانیوە - بەو ئەندازەیەی کەسانی تر باس دەکرێن و برەویان پێ دەدرێت، زەمینە بسازایە بۆ ڕۆشنایی خستنە سەر لایەنەکانی کەسایەتیی ئەو سەروەرە، هونەر و گشت یەکە و دامەزراوەکانی ژیان بۆ ناساندنی ئەو سەفەربەر بکرانایە، ئەوا ئەو کات، لە دەروونی نەوەکانی ئەمڕۆدا تەنها ئەو تەختی دادەنا و دڵەکانیش تەنها بۆ ئەو لێیان دەدا.. سەرەڕای هەموو ئەمانە، وا ئێستا لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای دنیادا، ڕۆژ دوای ڕۆژ مرۆڤەکان هەریەکە و بە گۆزەکەی دەستیەوە، بەرەو ئەو سەرچاوە سازگار و خاوێنە ڕادەکەن کە بە "منهل العذب المورود" ناوی دەبەم و کۆششی ئەوە دەکەن بگەنە مەنزڵی ئەو سوڵتانەی کە تاج لەسەری خۆرەکان دەنێت.

بەڵێ، ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا، لە پێشی هەمووشیانەوە ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیادا تێبینیی بووژانەوەیەك دەکەین ڕووەو ئەو. لە زۆر جێشدا موسوڵمانان بە تەشییەکەی دەستیان سەرگەرمی ڕستنی بنەماکانی بەرنامەکەی ئەون و نەخش و نیگاری ناسك و دڵڕفێن دەربارەی ئیسلام دەچنن. هەر دەڵێی ڕۆحیەتی "عەصری سەعادەت" سەرلەنوێ لە نێو موسوڵماناندا زیندووبووەتەوە. بارودۆخی جیهانی

ئیسلامیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمەدا نییە... ئەوەتا لەبری ئەوانەی کە یەك دوو سەدە لەمەوبەر بەبێ هیچ داوەرییەکی ژیریی و هەروا بە ساکاری هاتبوونە ڕیزی موسوڵمانانەوە، ئەمڕۆ چینێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار هاتووەتە گۆڕێ کە لێکۆڵینەوەی زانستیانەی لایەنەکانی ئیسلام دەکات و لە ژێر شەبەنگی پرشنگداری زانستدا شوێن حەزرەتی موحەممەد (عَلَيهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) کەوتووە... ئەوانەش کە تا دوێنێ توێژی خوێندەوارانیان بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنا و، زانکۆ و مەڵبەندەکانی فێربوونیان کردبووە شوێنکەوتەی تاقمێك "...یزم" و، دەزگا ئیشتیمانیەکانیشیان بۆ بەرژەوەندی کوفر وەگەڕخستبوو، لەمەودوا هەروەك توانەوەی شەختە سەهۆڵینەکان، یەك لەدوای یەك دەتوێنەوە و بەخێرایی بەرەو رسول الله (عَلَيهِ أَفضَلُ الصَّلاَةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) دەکەونە ڕێ.

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و وێڵی لقێکن کە خۆیانی پێوە ڕاگیربکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و، لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یا درەنگ، مایەپووچی و بێ ئاکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و بە پرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد (عَلَيهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) ڕادەکەن، ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە. ئەوە "مۆریس بۆکای" و "ڕۆجێ گارودی" و چەندەهای تری نەناسراویش...

بەڵام داخۆ ئێمە وەك پێویست ئەو "سوڵتانی دڵان"ەمان ناسیوە کە سوڵتانەکان فێری سوڵتانداریی دەکات؟ جا بۆچی ئێوە سەغڵەت بکەم! ئایا منێك کە لە پێنج ساڵییەوە سەرم لە سوجدەدایە و خۆم بە "قطمیر"[1]ی گەردن بەستراوی دەرگانەکەی دەزانم، توانیومە بە تەواوی بیناسێنم؟ یاخود تا چەند سەرکەوتوو بووم لە گەیاندنی ئەوەی کە دەیزانم؟ جا بۆیە لێرەدا ڕووی گوفتارم دەکەمە هەموو ئەوانەی وان لە مەقامی ناساندنی ئەودا و، خۆشم دەخەمە ڕیزیانەوە و، دەڵێم: ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تەختی دڵانە، بە شێوەیەك شایانی قەدر و قیمەتی بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

١ قطمیر ئەو ناوەیە کە لە سەگەکەی "أصحاب الكهف" نراوە.

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. جا ئەو دەم، بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە دەکەوتە پەرواز و لە پێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی، کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکا...

لەکاتێکدا ئادەمیزاد هێندەی ئاشنایی و ناسینی، خۆشەویستی ئاڕاستەی شتان دەکات، بەرامبەر ئەو شتانەش کە نایزانێت و ئاشنایی نییە، هەردەم جۆرێك لە دوژمنایەتی نواندووە. هەر بۆیە ئەو خاڵەی کە دوژمنان بە درێژایی تەمەنیان هەوڵەکانیانی تیادا چڕدەکەنەوە، بریتییە لە سڕینەوەی "نامی جەلیلی موحەممەدی" لە یادگەکاندا و، گۆشکردنی نەوەی نوێ لەسەر دوژمنایەتی کردنی فەخری کائینات (عَلَيهِ أَلفُ صَلَاةٍ وَسَلَام). بەڵام ئەوە چ درەوشانەوەیەکی لوتف ئامێزە کە سەرەڕای خواستی دوژمنان بۆ ڕیشەکەن کردنی ناوی ئەو لە دەروونەکاندا، کەچی وا ئەمڕۆ تێکڕای بەربەستەکانی گەیشتن بەو تەی کراون! نەخوازەڵا لاوان، کە وەك دڵخۆشیی ئەو کەسەی لە بیاباندا خەریك بوویێت لە تینواندا بمرێت، کەچی لە پڕێکدا و بە شێوەیەك کە هەرگیز چاوەڕوانی نەکردبێت، لە پەنا سەریدا ئاوێکی سازگاری کەوسەرئاسای دەستکەوتبێت، ئاوەها بەو چەشنە خۆیان هەڵدەدەنە ئامێزی پڕ سۆزی ئەو نازدارەوە. بێگومان ئەو سینە پڕ سۆز و میهرەش لە ئامێزیان دەگرێت و هەرگیز ئەو کەسانە بێبەش ناکات کە بەرەو لای دێن.

نازانم، قەت سەرنجی ئەو کەسانەتان داوە کە لە ڕۆژانی هەینیدا مزگەوتەکان سەرریژ دەکەن؟ ئەگەر بەدیققەتەوە سەرنجتان دابێت، ئەوا بینیوتانە کە زۆربەیان لە گەنجانن. داخۆ دەبێت ئەو پاڵنەرە چی بێت کە لەبەرامبەر پەلکێشکاری بەرنامە بۆ داڕێژراوی نەوەکان بۆ نێو گێژاوی ترسناکی گومڕایی و سەرکەشیدا، وای لەو گەنجانە کردبێ کە بەبێ گوێدانە ساردوسڕی زستان و، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵدەلەرزن لە سەرمادا، دەستنوێژ بگرن و لە ناهەموارترین هەلومەرجدا بەرەو مزگەوتەکان هەنگاو

بنێن؟ گەر پێتان باش بێ من وەڵام دەدەمەوە: ئەوە جازیبەی قودسیی حەزرەتی موحەممەدە (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ)...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکیشدا ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیوە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و بە وێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و، بە خۆیان دەڵێن: "ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟" بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بووبێت و هەموو شتێك کۆتایی هاتبێت...

جیهان بە هەڵەداوان بەرەو لای ئەو دێت. ئەوەتا ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن و، ئەو دەروونانەش کە بەڕووی جیهانی فیکردا والآن، شوێنی دەکەون و، زۆرێکیش لەوانەی کە تا ڕۆژانێك لەبەرەی دوژمنانیدا بوون، دەبنە دۆستی زۆر نزیك و دەچنە داڵدەی ئەوەوە، هەروەك بەڕاستیش چوون... ئیدی ئەمڕۆ تەنانەت بە پێوانە و کێشانەکانی بەرەی بەرامبەریش حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) سەنگی خۆی هەیە و ئەوانیش دان دەنێن بە قەدر و گەورەییەکەیدا... پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: "بە دەکەس لە ئوممەتەکەم کێشرام، من سەنگینتر دەرچووم. ئەوجا بە سەد، لەپاشان بە هەزار کەس کێشرام، دیسان هەر من سەنگینتر بووم. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەو دوو مەلائیکەتەی بەم کارە ڕاسپێررابوون، وتیان: وازبێنە، خۆ ئەگەر بە هەموو ئوممەتەکەشی بکێشرێ، هێشتا هەر ئەم قورستر دەبێت."[1] جا خۆ ئەوەش هاتە دی. پێغەمبەری خوا یەکێك لەو خەونانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دیویەتی: "لە تایەکی تەرازوودا من و لە تاکەی تریشیدا هەموو ئوممەتەکەم دانرا، من سەنگینتر بووم."[2]

بەڵێ، ئەگەر سەرجەم ئەصحاب و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین و ئەوانەی دوای

١ الدارمي، المقدمة ٣؛ بزار، المسند ٤٣٧/٩؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٢٥٥/٨.
٢ أحمد بن حنبل، المسند ٧٦/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٥٨/٩.

ئەوانیش و ئەو کەسایەتییە مەزنانەش کە تا ڕۆژی قیامەت دێن و ئەو خواناسانەش کە ڕێچکەی چوونە نێو دڵانیان دۆزیوەتەوە و تێکڕای ئەولیا و ئەصفیا و موقەررەبین، هەر هەموویان لە تای تەرازوویەکدا دابنرێن، ئەوا دیسان سوڵتانی دڵان، نووری چاوان قورستر دەبێت. ئاخر چۆن نا! لە کاتێکدا بوون لەبەر حورمەتی ڕووی ئەو بەدی هێنراوە.

پێغەمبەری خوا هۆی بەدیهاتنی بوونەوەرانە. لە وتەیەکدا کە وەك فەرمووده ناوبانگی دەرکردووە، بەم جۆرە باسکراوە: لَوْلَاكَ لَوْلَاكَ مَا خَلَقْتُ الْأَفْلَاكَ "ئەگەر تۆ نەبوویتایە، بوونم بەدی نەدەهێنا."[١] بەڵێ، نووسینی کتێبێك کە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت، کارێکی بێهودەیە. خوای گەورەش لە هەموو کارێکی بێهودە و بەهەوانتە پاك و بێگەردە. بەم جۆرە، زۆر پێویست بوو کە ڕابەرێکی دەنگ زوڵاڵی وەك سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی عالی مەقام (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) واتای دێڕەکانی گەردوون ڕوون بکاتەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە بوونی ڕاڤەکار و ڕاگەیەنەرێك زۆر پێویست بوو تا ئەوەی بێت و ڕاستییەکانی پشت پەردەی بوون ئاشکرا بکات. هەروەها ئەو مرۆڤەی کە گەردوونی بێ بن، بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ناویەوە بۆ خزمەتی ڕام کراوە، ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە لە کوێوە هاتووە.. بۆ کوێ دەڕوات.. و نامزەدی چ شتێکە... کەوابێ، ئەگەر ئەو نەبووایە، گەردوونیش و مرۆڤیش هیچ مانایەکیان نەدەبوو... بەڵێ، حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەو مرۆڤەیە کە واتای بۆ شتان گەڕاندەوە. ئەو لە نازدارترین خۆشەویست خۆشەویستترە لامان.

لێرەدا - لەگەڵ دان نانم بەوەی کە خۆم بە گوناهبارترینی باوەڕداران دەزانم - هەستێکم هەیە، بێ باسکردنی تێناپەڕم. نیازیشم لە گێڕانەوەی ئەوەیە کە: ئەگەر من تا ئەو ڕادەیە پێغەمبەری خوام خۆشبوێت، کێ دەزانێ مەشخەڵی ئەوینی ئەو لەو دڵانەدا کە لێهاتنیان هەیە، تا چ پلەیەك بڵێسەی سەندووە!.. بۆیە دەبێت لەم سۆنگەیەوە بڕوانرێتە ئەو حاڵەتە ڕۆحییەی دەیگێڕمەوە. دەنا، پێم شەرمە لە حوزوورتاندا باسی شتێك بکەم کە پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت.

ئەو کاتەی خوای گەورە بە نسیبی کردم کە دەموچاوی گوناهکارم بسووم بەو خاکە

١ علي القاري، الأسرار المرفوعة ٣٨٥؛ عجلوني، كشف الخفاء ٢/٢١٤.

موبارەکەدا، شارەکەی پێغەمبەری خوا هێندە درەوشاوە بوو لەلام و چێژێکی ڕۆحیی وام چەشت، کە ئەگەر لەو کاتەدا - بە فەرزی مەحاڵ - لە هەموو دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگهێشت بکرامایە، باوەڕ بکەن نەدەچووم بۆ هیچ کامێکیان و، مانەوەم لە شارەکەی رسول الله دا پەسەند دەکرد. لەڕاستیدا بەهەشت ئاوات و ئارەزووی هەموومانە، تاکە موسوڵمانێکیش نییە کە ئەم ئاواتەی نەبێت. ئەی مەگەر هەموو بەیانی و ئێوارانێك لە دوعاکانماندا لە پەروەردگار ناپاڕێینەوە کە پەنامان بدات لە دۆزەخ و بمانخاتە بەهەشتەکەیەوە؟ لەگەڵ قبووڵکردنی هەموو ئەمانەدا، دەڵێم: ئەگەر لەو کاتەدا بانگ بکرامایە بۆ بەدەست هێنانی ئەو پایە بەرزەی کە لە دواڕۆژدا بەدەست دێت، لەوانەیە مۆڵەتم لە پەروەردگارم بخواستایە و عەرزی ئارەزووی مانەوەم بکردایە لە رەوزەی پاکی رسول الله دا. تکا دەکەم وا گومان نەبەن کە بەمانە شایستەیی و لێهاتوویی خۆم بۆ ئەو مەقامە بەرزانە دەربڕیبێت. بەڵکو تەنها ویستوومە ئاماژەیەك بۆ ئەو خۆشەویستییە بکەم کە بۆ پێغەمبەری خوام هەیە. ئەگەرنا، بەدرێژایی ژیانم لەو کەسانە بووم کە دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە کە خوای گەورە شەرەفمەندیان بکات بەوەی کە ببنە کۆیلەی گەردن بەندی بچوکترین هاوەڵی پێغەمبەری خوا. زۆرجاریش ئەم دوعایە ویردی سەر زوبانمان بووە: ''پەروەردگارا، بۆ ساتێکیش بێت، لە خولیای دەموچاو سوین بە تۆزی بەر پێیان بەدوورمان مەگرە.'' ئامین.

لە "ماڵی خوا"شدا ناخم لە هەمان جۆش و خرۆش تەژی بوو. لەوانەیە ئەمانە هەست و نەستی هاوبەشی هەموومان بێت. ماوەتەوە بڵێم، ئەوانەی پڕاوپڕی ئەم هەستانە دەژین، تەنها من و چەند کەسێکی هاوشێوەی من نین، بەڵکو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شەیدا و ئەوینداری وای هەیە، ئەم حاڵەتە ڕۆحیەی من گێڕامەوە، بەلای ئەوانەوە زۆر کرچ و کاڵ و سەرەتایی دەبێت.

جا مادەم باس گەیشتە ئێرە، پێم خۆشە بیرەوەرییەکی تریشتان عەرز بکەم: لەگەڵ کاك "عارف حیکمەت" کە ئەو کاتە ئەندام پەرلەمان بوو، لە حەج پێکەوە بووین. کاك عارف پەیمانی دابوو کە: ''ئەگەر بچمە مەدینە، شەرت بێ وەك گوێدرێژ لە خۆڵەکەیدا خۆم بگەوزێنم.'' جا هەر کە پێی نایە خاکی مەدینەوە، پەیمانەکەی هێنایە

جێ و، ئەو ڕۆحە بەرزە خۆی لە خۆڵدا گەوزاند و تەپاوتلی تیا دەکرد. لێرە و لەوێ هەرکات ئەو دیمەنەم دێتەوە یاد، خۆم پێناگیرێ و چاوانم پڕ دەبن لە فرمێسك.

حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەرێکە. بەڵام پێغەمبەرێك کە گشت پێغەمبەرانی پێش خۆی لە منارەی پێغەمبەرایەتییانەوە مزگێنی هاتنیان داوە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەو پەیمانەمان بۆ تۆمار دەکات کە لە سەرجەم پێغەمبەرانی وەرگرتووە سەبارەت بە باوەڕهێنان و پشتیوانی کردنی ئەو پێغەمبەرەی کە خۆیان مژدەی هاتنیان داوە:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ (آل-عمران: ٨١)

"(یادیان بێنە) کاتێك خوا پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت، کاتێك کتێب و دانایی پێبەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردن و بەڕاستدانەری ئەوەی ئێوەش بوو، ئەوە دەبێت باوەڕی پێ بهێنن و پشتگیری بکەن. ئینجا خوا فەرمووی: ئایا بڕیارتاندا و پەیمانی منتان بەو جۆرە وەرگرت کە پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بڕیارماندا (و هەروا دەکەین). ئەوسا خوا پێی فەرموون: دە بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان."

ئیتر ئەو پێغەمبەرانەش لەو پەیمانەیاندا کە بە پەروەردگاریان دابوو، ڕاستگۆ بوون و لە هەموو جووڵە و کردەیەکیاندا لەو چوارچێوەیەدا مانەوە. ئەوەتا کاتێك سەرووەرمان میعراجی کرد، هەموویان بە ڕۆحیانەت لەدوایەوە نوێژیان کرد.[1] بەڵێ، وەك بڵێی هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام) لە پێشەکی هەمووشیانەوە، حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی نوح و حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا دەیانویست ببنە بانگبێژ و قامەتخوێنی. حەزرەتی مەسیح لە ئینجیلدا ئەو پێغەمبەرە قەدربەرزەی دەخستە بەرچاو و، دەیوت: "من

١ مسلم، الإيمان ٢٧٨.

دەرۆم تا سەرداری زەمان بێت.[1] بەڵێ، ئەو دەمەی بەرەو ئاسمان بڵند بووەوە، دامێنی ئاسمانەکان پڕ بوون لە گەوهەر و، ئەستێرەکان بەوێنەی بەردی سەرڕێ، لەژێر پێیدا ڕاخران. کاتێکیش خۆر گەیشتە ئاسۆکەی حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، خولیا و سەودای سەری بووبووە ئەوەی ببێتە گەوهەرێك لە تاجەکەی موستەفادا. بەڵێ، هەموو ئەمانە وەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەرایەتییەکەیدا پەرواز ببوون و دەسووڕانەوە. ئیتر لەمانەوە چی دەربچێت!

لەتاو شەمعەی نووری ئەحمەد جبریل بووە پەروانە

لەتاو جەماڵی نووری موحەممەد مەلەك پەروانەئاسا

سەرگەرمی سووڕانە...

هاودەم لەتەك ئەمانەشدا، لە ڕوانگەی خەسڵەتە ئادەمییەکانیشەوە لە لوتکەدا بوو و ڕابەرایەتی و پێشەنگیی ئێمەی ئادەمیی دەکرد. بۆ نموونە، پێغەمبەری خوا سەرۆك خێزانێکی کامڵی بێ هاوتا بوو. ئەوەتا لە ماوەیەکی دیاریکراوی ژیانیدا، نۆ دانە ئافرەت لە ژێر نیکاح و بەڕێوەبردنی ئەودا بوون.[2] لەگەڵ ئەمەشدا بواری نەدا لە نێوانیاندا هیچ جۆرە دەمەقاڵێ و بارگرژییەك ڕوبدا. جا ئەگەر ئەو ڕۆڵانەی لەو خانەیەدا - کە ئیکسیری نبووەتی تنۆك تنۆك لێدەچۆڕی - گۆش و پەروەردە کران، هەریەکەو بەسەر سەدەیەکدا دابەش بکرانایە، ئەوا دەبوونە موجتەهید و موجەددیدانێك کە بەس بن بۆ ڕۆشن کردنەوەی ئەو سەدەیە. داخۆ دەبێت چەند کەس لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوایان ناسیبێت!..

حەزرەتی فەخری عالەم (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لە هەمان کاتدا سەرکردەیەکی سەربازیی بێ وێنەش بوو. ئەوەتا بە مشتێك مرۆڤەوە کە وەك خەرمانەی مانگ دەوریان دابوو، جەنگی بەرڕووی جیهاندا ڕاگەیاند و تەخت و سەرای چەندین گەورە سوڵتانی یەکسانی خاك کرد و چەندینی تریشیانی کردە بەندەی بەر دەرگانەکەی. ئەمە

١ یوحنا، باب ١٦، ڕستەی ٧-١٥.
٢ البخاري، النكاح ٤، ١٠٢.

لەکاتێکدا کە بە ڕواڵەت هونەر و زانستی جەنگی لە کەسەوە فێرنەبووبوو.

ئینجا پێغەمبەری نازدار (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ)، ئەو مرۆڤە مەزنە بوو کە زانستەکان لای ئەو دەگەیشتنە پایان. دەتوت لە شاشەیەکدا تەماشای ئەو ڕووداوانە دەکات کە تا ڕۆژی قیامەت دێنە سەر شانۆی بوون، یان هەروەك ئەوەی لە تۆمارێکی غەیبیدا بیانخوێنێتەوە، ئاوا لە یەك بە یەکیان دەدوا. تەنانەت دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیەش بەسەر کۆچکردنیدا بۆ خانەی جاویدانی، کەچی وا ئەمڕۆ هەموو لایەکمان لەو کۆتا خاڵەدا کە زانست و تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەردەم پێی گەیشتووە، ئەو بەیداخە شەکاوەیە دەبینین کە رسول الله (صَلَوَاتُ اللهِوَسَلَامُهُعَلَيْهِ) چواردە سەدە لەمەوپێش هەڵی کردووە.. ئیدی ئەوانەیان کە خوای گەورە هیدایەتی لەچارە نووسیون، "کەلیمەی قودسییەی تەییبە" دەهێنن و، هەر یەکێکیان دەبێتە ئەڵقەیەکی نوورین لە زنجیرە کاروانی موسوڵماناندا. ئەمەش نموونەیەك لە نێو هەزاران نموونەدا:

لە کاسێتێکی ڤیدیۆییدا تەماشای دکتۆرێکی بەرەگەز کەنەدیم کرد کە ناوی "کیث مۆر" بوو. ئەم دکتۆرە، پسپۆڕی زانستی کۆرپەلەزانی و پرۆفیسۆری توێکاریە لە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی "تۆرۆنتۆ". مۆر کاتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە گوێبیستی قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە دەبێت لە سکی دایکدا، کە ڕاستییەکی زانستییە و تەنها لە ڕێگەی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی ئەم سەردەمەوە دۆزراوەتەوە، یەکسەر "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلٰهَ إِلَّا الله وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله" دەڵێت و، تەسلیمییەتی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا دەردەبڕێت. هەروەها زانایەکی فیسیۆلۆجی یابانییش کاتێك ئایەتەکانی قورئان سەبارەت بە بوارەکەی خۆیەوە دەبینێت، "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلٰهَ إِلَّا الله" - هەرچەندە لەسەر زاریشی گران بوو- دەڵێت و، ساتێك دوودڵ نابێت لەوەی کە بێتە ناو ئیسلامەوە.

بەڵێ، هەروەك ئاشکرایە، لەو شوێنەدا کە زانستەکان دەچەقن و پەکیان دەکەوێت، قورئانی پیرۆز چەندین دەروازەیان بەڕوودا والا دەکات. کۆتا خاڵیش کە زانست و زانیاری پێی بگات، لەگەڵ خاڵی دەستپێکی پێغەمبەری خوادا یەکدەگرێتەوە. باشە، بەڵام کێ ئەمانەی فێرکردووە؟ ئەو وانەی لە زاتی "العَلِيم" و "الخَبِير"ەوە وەگرتبوو

و، "موعەللیمی ئەزەلی" لەودیو ڕەحلەی تەدریسەکەیەوە بوو. هەربۆیە دەستی زەمەن نەگەیشتە چمکی مەعریفەتەکەی تا کۆنی بکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، پاراوتر و نوێتر دەبووەوە. هەتا دنیاش دنیا بێت، هەر لە تازەبوونەوەدا دەبێت.

ئینجا حەزرەتی حبیب الله (صَلَّیَاللّٰهُعَلَیۡهِوَعَلَیٰآلِهِوَصَحۡبِهِوَسَلَّمْ) بە شێوەیەك کە بۆ هیچ کەسێکی تر نەڕەخسابێت، لەلایەن هاوەڵەکانیەوە خۆشدەویسترا. بۆ نموونە: لە کۆتایی ڕووداوی "ماء الرجیع"دا، کاتێك کافرانی دڵ پڕ لە قین "خوبەیبی کوڕی عەدی"یان ڕاپێچی پەتی سێدارە دەکرد، ئەم پرسیارەیان ئاڕاستە کرد: "ئایا پێت خۆش بوو ئێستا موحەممەد لە جێگەی تۆدا بووایە و تۆش لەناو ماڵ و منالی خۆتدا بە ئاسوودەیی ژیانت بەسەر ببردایە؟" وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون و یەکلایی و بێ پەروا بوو:

"نەخێر، وەڵڵاهی لەپای ڕزگاربوونی مندا، ڕازی نابم تەنانەت دڕکێکیش بچێت بە پێی پێغەمبەری خوادا."

جا لەپاش نواندنی ئەم تابلۆ مەردانەیە لەسەر سەکۆی سێدارە، حەزرەتی خوبەیب (رَضِیَاللّٰهُعَنْهُ) دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و، دەڵێت: "خوایە گیان، بەبێ ماڵئاوایی کردن لە خۆشەویستەکەت هاتم بۆ ئێرە. دەسا سەلامی منی پێ بگەیەنە." پێغەمبەری خوا کە لەو کاتەدا لەنێو ئەصحابدا دانیشتبوو و قسەی دەکرد، لە پڕ هەستایە سەرپێ و، فەرمووی: "سەلامی خوا لە تۆش ئەی خوبەیب." کاتێکیش هاوەڵان پرسیاریان کرد، پێغەمبەری نازدار (عَلَیۡهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) بەچاوی پڕ فرمێسکەوە وەڵامی دانەوە: "موشریکەکان خوبەیبیان شەهید کرد. لە دواساتەکانیدا سەلامی بۆ ناردم، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە."[1]

دیمەنێکی تر کە تا ئێستاش دڵگوشادی دەبەخشێتە دەروونی هەموو ئیماندارێك: کاتێک حەزرەتی "سومەیرا" لە غەزای ئوحوددا دەنگۆی شەهیدکردنی پێغەمبەری خوا دەبیستێت، دەستبەجێ خۆی دەگەیەنێتە دامێنی چیای ئوحود... جا کە لەوێ پێی دەڵێن: "باوکت".."مێردەکەت".." کوڕەکانت" شەهیدبوون و، تەرمەکانیانی پیشان

١ سعید بن منصور، السنن ٣٤٩/٢؛ الطبراني، المعجم الكبیر ٢٦٠/٥؛ إبن كثیر، البدایة و النهایة ٦٦/٤.

دەدرێت، ئەم شێرەژنە گوێ بە هیچ کام لەمانە نادات و، بەملاو ئەولادا هەر بەدوای پێغەمبەری خوادا دەگەڕێت و لەبەر خۆیەوە ورتەی دێت و، دەڵێت: "رسول الله چی بەسەر هاتووە؟" ئینجا کە شوێنی پێغەمبەری خوای پێ نیشان دەدەن، بە ڕاکردن بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات و لەبەردەم پێغەمبەری خوادا خۆی دەدات بە زەویدا و، دەڵێت: كُلُّ مُصِيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ "ئیتر هەر ئەوەندەی کە تۆ لە ژیاندایت، هەرچی بەڵاو موسیبەت هەیە، سووك و بێ ئەرزشە."[1] بەڵێ، رسول الله (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) تا بەو شێوەیە جێی خۆی لە دڵ و دەروونەکاندا کردبووە.

نموونەیەکی تر: مەردی ئاسۆکان لەودیوی ئاسمانەکانەوە بانگهێشت کرابوو. ئیدی وادەی جێهێشتنی ئەو دۆستانەی کە بیست و سێ ساڵ پێکەوەییان هەبوو، هاتبووە پێش. هەر بۆیە لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا کەمێك بە دڵتەنگی و خەفەتەوە دەچووە لای هاوەڵانی. ئەم حاڵەتەی پێغەمبەری خوا هێندە کاری لە ئەصحاب دەکرد و هەستی دەبزواندن، کاتێك پێغەمبەر دەچووەوە خانەی سەعادەتی، دەتوت لە سینەی هەر یەکێکیاندا شنەی خەزان هەڵی کردووە. ئەوە بوو هاوەڵی بەڕێز موعاذی کوڕی جەبەل (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە لایەن پێغەمبەری خواوە ڕاسپێررابوو کە بچێت بۆ یەمەن. ئیتر ئەویش لەو نێوانەدا هاتوچۆی دەکرد. کاتێك دەڕۆیشت پەیامەکانی پێغەمبەری دەبرد. لە گەڕانەوەشدا ئەو مەسەلە و گرفتانەی دەهێنا کە چاوەڕوانی چارەسەر بوون. بەر لەوەی دوایەمین گەشتی ئەنجام بدات، چووە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، داوای دوعای لێدەکرد، ئینجا دەڕۆیشت. بەڵام ئەم جارەیان حەزرەت جیاواز لە جارانی پێشوو، پێی فەرموو: "لەسەر خێر بڕۆیت ئەی موعاذ، بەڵام ئەم جارەیان لەگەڕانەوەتدا لەوانەیە تەنها بتوانیت سەردانی مزگەوتەکەم و گۆڕەکەم بکەیت." ئەم چەند وشەیە، برووسکەیەك بوو و دای لە حەزرەتی موعاذ. لە پەلوپۆ کەوت و فرمێسك لە چاوانی داباریین، دەتوت ئەژنۆی شکاوە. چوون بۆ یەمەن بە لایەك، تەنانەت توانای نەبوو لە شوێنی خۆشی هەستێت.[2]

---

١ إبن هشام، الصراط النبوية ٥٠/٤؛ الطبري، تأريخ الأمم و الملوك ٧٤/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ١١٥/٦.

٢ أحمد بن حنبل، المسند ٢٣٥/٥؛ البزار، المسند ٩١/٧-٩٢؛ إبن حبان، الصحيح ٤١٤/٢؛ الطبراني،

لەلایەکی ترەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەروەك موو لە ماست دەربێنێت، ئاوەها بەئاسانی سەرجەم ئەو گرفت و کێشانەی چارەسەر دەکرد کە تایبەت بوون بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. "بێرنارد شۆ" کە سیازدە سەدە دوای ئەو هاتووە، تەنها یەکێکە لەو سەدان مرۆڤەی بەرەی بەرامبەر کە بەم وتانەی خوارەوەی ئەم ڕاستییەی قبووڵ کردووە: "مرۆڤایەتی چەندە ئاتاجی ئەو حەزرەتی موحەممەدەیە کە هەموو کێشە و گرفتە کەڵەکەبووەکانی ئەم چەرخەی بە وێنەی سانایی خواردنەوەی کوپێك قاوە چارەسەر دەکرد." فەزیلەت و گەورەیی ئەوەیە کە دوژمنیش دانی پێدا بنێت.

بەڵێ، ئەو کاتەی مرۆڤایەتی بۆ لای حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگەڕێتەوە، بە ئاسوودەیی و دڵنیایی شاد دەبێتەوە. ئیتر ئەوکات دەستی دەگات بە ئاسۆ پرشنگەکان و لە دەربەدەری و گاڵتەجاڕی دەستی ڕۆژگار و پەژموردەیی دنیاو ئاخیرەت ڕزگاری دەبێ و بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرزدەبێتەوە. تەنانەت لەگەڵ کۆسپ و ڕێگریی هەموو هێزە نەیارەکانیشدا، سروەی ئەم دووەمین بوژانەوەیە هەڵیکردووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾ (الصف: ٨-٩)

"ئەوانە دەیانەوێت بە فوو، بە قەڵەی دەم نووری خوا بکوژێننەوە!! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی (ئاینی خۆی) تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت، هەرچەندە کافر و بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئاینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە هاوبەش پەیداکارانیش پێیان ناخۆش بێت."

بەڵێ، خوای گەورە دینەکەی خۆی سەردەخات، سینەو دڵە ئاتاجەکانیش کەمەندکێشی دەبن و بەختەوەری و دڵنیایی خۆیان لەودا دەبیننەوە و دەگەنە ئاستێك،

---

المعجم الكبير ١٢١/٢٠.

هەر لە دنیادا وا دەزانن چوونەتە بەهەشتەوە. جا کافر و ستەمکارانی دنیای ئەولا و مونافیقانی ئاسیاش کە ئیستیثماری مرۆڤەکان دەکەن و، بێناگایانی ناوخۆشمان، پێیان خۆش بێت یان نا، ڕۆژێك دێت کە ئەو شاهی شاهانەی لە لایەن پێغەمبەرانەوە بە "سوڵتانی ئەنبیا" ناسراوە و، ڕۆژی پێنج جار ناوی پڕشکۆی بە گوێی جیهاندا دەدرێت، دەچێتە نێو گشت دڵەکانەوە و دەبێتە خۆشەویست و لەدڵدا هەڵگیراوی هەموو لایەك.

ئەو کانگای دڵنیایی و ئارامیشە. ئێمە باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی کە ئەو پەیامەی ئەو هێناویەتی، لەهەمان کاتدا سەرچاوەی ئاسودەیی و دڵنیاییشە. مێژووش گەورەترین شاهیدی ئەم ڕاستییەیە. تاکە ڕێگەی دووبارە چەشتنەوەی ئەم ئارامییەش بە مرۆڤایەتی، بریتییە لە ناساندنی ئەو سەروەرە و، ئەو نوورەی کە هێناویەتی. چونکە هەرکات مرۆڤایەتی چاکتر ئەو پێغەمبەرەی ناسی، خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبێ و، لە سایەی ئەو خۆشەویستییەشدا سیمای کۆمەڵگە دەگۆڕرێت.[1]

جا لە چوارچێوەی ئەم پێشەکییەدا کە پێشینان بە "دیباجە" ناویان دەبرد، پشت ئەستوور بە لوتف و کەرەمی پەروەردگار، هەوڵماندا بەکورتی، چەند شتێکی پێڕست ئاسا دەربارەی ڕەهەندە جیاوازەکانی سەروەری هەردوو جیهان، مایەی شانازی بوونەوەران عەرز بکەین.

لە ڕاستیدا هەر وتەیەك باس لەو بکات جوان و شیرینە. ئەوەش کە جوان و پەسەند نییە، دەبێت بدرێتە پاڵ دەربڕین و شێوازەکەی. جا ئەگەر لە دەربڕین و شێوازدا کەموکورتییەك هەبێت، ئەوا بەتەواوی بۆ من دەگەڕێتەوە. ئەوەشی تایبەتە بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ)، تەنها و تەنها جوانییە.

---

[1] حەزرەتی عەلی (رَضِيَاللهُعَنۡهُ) بەم شێوەیە باسی پێغەمبەری خوای دەکرد: مَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ "هەرکەس - ئاکارە بەرزەکانی - بزانیایە و تێکەڵاوی بکردایە، ئەوی - لە هەموو شتێك - خۆشتر دەویست." الترمذي، المناقب ٨؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٢٨/٦؛ البيهقي، الشعب الأيمان ١٥٠/٢.

# ئاكاری پێغەمبەران

## ئەمانەت ـ ئەمینی

دووەم ئاكاری پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام) بریتیه له "ئەمانەت".

ئەم وشەیە، وشەیەكی عەرەبییە و لە هەمان چاوگی وشەی "إیمان"ەوە دروست بووە. "مُؤْمِن"یش واتە ئەو كەسەی ئارامی و ئاسایش (ئەمنیەت) بەرقەرار دەكات. پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام) هەروەك لە ڕووی ئیمانەوە لە لوتكەدان، ئاوەهاش لە بەرقەراركردنی ئاسایش و ئەمنیەتدا پێشەنگن. قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا ئاماژە بۆ ئەم تایبەتمەندییەیان دەكات. ئێستاش با بچینە گوڵزاری چەند دانەیەكیان:

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۞ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ۞ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ (الشعراء : ١٠٥-١٠٨)

"قەومی "نوح"یش بەرنامەی هەر هەموو پێغەمبەرانیان بە درۆ زانی. كاتێك "نوح"ی برایان پێی وتن: باشە ئەوە ئێوە ناترسن (لەوەی بێ فەرمانی پەروەردگار بكەن)؟ دڵنیا بن كە من نێرراوێكی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان. كەوابوو لە خوا بترسن و فەرمانبەرداریی من بكەن."

بەڵێ، حەزرەتی نوح بەم جۆرە لەگەڵ قەومەكەیدا دەدوا: "ئایا هێشتا هەر "إتقاء" ناكەن و پارێزكار نابن؟ دڵنیابن كە من پێغەمبەرێكم ئەمنیەت بەخش دەكەم و دارای سیفەتی ئەمانەتم و دانابەزمە پلەی خیانەت كردنەوە." ئیتر هەروەك دەبینن، ئەم سیفەتە ـ سیفەتی ئەمانەت ـ كە یەكێكە لە تایبەتمەندییەكانی پێغەمبەرایەتی، لە زمانی پێغەمبەرێكەوە بەم جۆرە باس دەكرێت. هەروەها:

﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۞ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾

(الشعراء : ١٢٣-١٢٥)

"قەومی عادیش بەرنامەی هەر هەموو پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی. ئەوەبوو "هود"ی برایان پێی وتن: ئایا ئێوە (لە پەروەردگار) ناترسن؟ بزانن کە من بەڕاستی نێرراوێکی ئەمین ومتمانە پێکراوم بۆتان."

ئەم ئایەتە پیرۆزەش جەخت لەسەر هەمان واتا دەکاتەوە:

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۞ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ۞ ﴾

(الشعراء : ١٤١-١٤٣)

"قەومی ثەمودیش بەرنامەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی. ئەوەبوو "صالح"ی برایان پێی وتن: ئایا ئێوە (لە خوا) ناترسن؟ بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆتان."

هەروەها:

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ۞ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ۞ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾

(الشعراء : ١٦٠-١٦٢)

"قەومی "لوط"یش بەرنامەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی. کاتێك "لوط"ی برایان پێی وتن: ئایا ئێوە (لە خوا) ناترسن؟ دڵنیابن کە من نێرراوێکی ئەمینم بۆتان."

دەتوانین نموونەی زیاتر لەم بارەیەوە بهێنینەوە. ئەمە لەپاڵ ئەوەدا کە چەندین ئایەتی تر بە واتای "ئیشاری" ئاماژە بۆ هەمان ناوەرۆك دەکەن. بەڵام بە مەبەستی دەستخستنی بیرۆکەیەك سەبارەت بە بابەتەکە، تەنها بەوانەی سەرەوە وازدێنین.

وەك چۆن "المُؤْمِن" یەکێکە لەناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ)، هەرواش لە گرنگترین ناوی ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بەو زاتە هەیە. جا ئایا بۆچی بە خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) دەوترێت "المُؤْمِن"؟ بێگومان لەبەر ئەوەیە کە ئەو زاتە سەرچاوەی دڵنیایی و ئارامی و متمانەیە. وە هەر ئەویشە دڵنیایی و بڕوامان پێ دەبەخشێت. هەمیشە دڵنیایی و ئارامی لەوەوە، تنۆك تنۆك یان لە شێوەی تاڤگەدا

بەرەو ئێمە بەخوڕ دێ. هەر ئەو زاتەشە کە پێغەمبەرانی دڵنیا و بڕوادار کردووە و بە سیفەتی ئەمنیەت سەرفرازی کردوون. جا کەوابێ ئەو شتەی ناوی ئەمنیەت و دڵنیایی و ئەمانەت و ئیمانمان لێناوە، ئێمە بە پێغەمبەرانەوە و، پێغەمبەرانیش - بە ڕادەیەکی مەزن - بە خوای گەورەوە وابەستە دەکات. سەرەنجام، تێکڕای ئەم وابەستەییە بەرەو پەیوەندی خالق و مەخلووق دەمانبات. هەموو ئەمانە واتاگەلێکن لە داتاشراوەکانی وشەی ئەمانەتدا بوونیان هەیە. بێگومان لایەنێکی گرنگی بابەتەکە بریتییە لە دەرککردن بەم پەیوەندییە.

هەروەک گرنگترین سیفەتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام) بە گشتی و پێغەمبەری نازدارمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە تایبەتی، ئەمانەتە، هەر بەو جۆرە، گرنگترین پەسنی جوبرەئیلی ئەمینیش بریتییە لە ئەمانەت. قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە بۆمان باس دەکات: ﴿ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴾ (التكوير : ٢١) "ئەو گوێڕایەڵیکراو و نێرراوێکی ئەمینە." بەڵێ، جوبرەئیل (عَلَيْهِ السَّلام) گوێڕایەڵی پەروەردگارە و لە ڕووگەی فەرمانبەرییەکەشیەوە نێرراوێکی متمانە پێکراو و ئەمینە. ئیدی بەم چەشنە، قورئانی پیرۆز لە کانگای ئەم متمانەپێکراو و ئەمینانەوە هاتووە. ئەوەتا خوای گەورە "الْمُؤْمِن"ە، گوتارەکەشی گوتارێکە ئەمنیەت و دڵنیایی لێوە پەخش دەبێت. ئەوجا قورئان لەڕێگەی جوبرەئیلەوە - کە خوای گەورە بە ئەمین ناوی دەبات - هاتووە. دوا جاریش ئەم قورئانە بۆ ئەو پێغەمبەرە ئەمینە و لەویشەوە بۆ ئوممەتەکەی، کە کۆمەڵێکی قودسین و دەستنیشانکراوی بەدەستهێنانی ئەمنیەتەکەی ئەون، نازڵ بووە.

بەدڵنیاییەوە هەرکەسەو بەگوێرەی ئاستی خۆی سوودی لە قورئانی پیرۆز وەرگرتووە. جوبرەئیلیش یەکێکە لەو سوودمەندانە. ئەوەتا ڕۆژێکیان خۆی بە پێغەمبەری خوای فەرمووە: "هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە لە قورئاندا بە "ئەمین" ناوی بردم، لە عاقیبەتم دەترسام. بەڵام دوای ئەو ئایەتە ﴿ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴾ ، سەرتاپا دڵنیایی دایپۆشیم."[١]

١ قاضي عياض، الشفاء ١/١٧.

## ئەمنیەت لە پێغەمبەری خوادا

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەر لە هەموو شتێك لە بەرامبەر ئەو پەیامانەی لە پەروەردگاریەوە بۆی دەهاتن، تابڵێی ئەمین بوو. هەرگیز ڕێی تێناچێت هێندەی تۆزقاڵێک ناپاکی لە ئەمانەتەکەیدا کردبێت. پاشان بەرامبەر بە سەرجەم بوونەوەرانیش ئەمینە و هەموان متمانەیان پێیەتی. ئاخر چونکە لە سەرەتادا ئەمنیەتی خۆی بەرووی هەموو لایەکدا پیشانداوە و ڕێنموونی کردوون بۆ متمانە و دڵنیایی. دواتر ڕادەی گرنگی ئەم بابەتەی بۆ ئێمەش ڕوون کردووەتەوە، وای لێ کردووین ئێمەش باوەڕ بەو ڕاستییە بکەین. جا با ئێستا یەك بە یەك هەڵوێستە لەسەر ئەم لایەنانە بکەین:

## أ) ئەمنیەتی سەروەرمان بەرامبەر ئەرکی پێغەمبەرایەتی

خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) پێغەمبەرەکەیی وەك مرۆڤێکی سپاردەپارێز و ئەمین هەڵبژاردووە. جا ئیتر ئەویش بە درێژایی ژیانی لە خەم و پەرۆشی ئەمەدا بووە. بە جۆرێك، کاتێك وەحی دەهات، لە ترسی ئەوەی نەبادا وشەیەکی لەدەست دەرچێ، دەکەوتە پەرۆشییەوە و بەر لەوەی حەزرەتی جوبرەئیل لە خوێندنەوەی بێتەوە، ئەو بێ وەستان دەیوتەوە تاوەکو بەتەواوی لەبەری بکات. تەنانەت لەم بارەیەوە هێندە بە پەرۆش و خەمخۆرییەوە ڕەفتاری دەکرد، تا ئەوەی قورئانی پیرۆز پێی فەرموو:

﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ۝ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ۝ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ۝ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴾ (القيامة : ١٦-١٩)

"(ئەی پێغەمبەر!) بەدەم قورئانەوە زمانی خۆت مەجوڵێنە بۆ ئەوەی بەزوویی (وەحی) لەبەر بکەیت. بێگومان کۆکردنەوەی (جێگیرکردنی لە دڵتدا) و پێخوێندنەوەی لەسەر ئێمەیە. دە کەوایە، کە (بە زمانی جوبرەئیل) خوێندمانەوە، تۆش شوێنی خوێندنەوەکەی ئەو بکەوە. دواتر گومانت نەبێ کە ڕوون کردنەوەکەشی هەر لەسەر ئێمەیە."

بەڵێ، قورئان وەك ئەمانەتێك بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) سپێررابوو.. بۆیە ئەو سەروەرە دەترسا لەوەی کە نەتوانێت بەرامبەر بەو ئەمانەتە پیرۆزە ئەمین بێت و لە تاوا دەلەرزی. تا ئەوەی پەروەردگاری دڵی دەدایەوە و دڵنیای دەکردەوە لەوەی کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لە ئەمانەتەکەیدا ئەمین دەکات.

پێغەمبەری خواش (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) تەمەنی موبارەکی لەنێو ئەو کۆشش و پەرۆشیەدا بەسەر برد. لە هەموو کەس زیاتر هەوڵی دەدا ئەمین بێت لە ئەمانەتەکەیدا و هەمیشە هەستی بە قورسایی ئەو ئەرکە سەنگینە دەکرد کە بە هەموو قورساییەکییەوە لەسەر شانی بوو. هەر بۆیە لە"حِجَّةِ الوَدَاعِ"دا کە بە واتای حەجی ماڵئاوایی کردن دێت لە ئوممەتەکەی، لەو ساتانەدا کە خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو، ئەویش بەو هەستەوە کە ژیانی ڕووی لە ئاوابوون ناوە، جارێکی تر ئەو بەرپرسیارێتییە قووڵەی بەرجەستە کردەوە و، بەدەنگێکی بەرز بە هاوەڵە ڕاستگۆکانی فەرموو: "بەم نزیکانە دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکەن" واتە، بەر لەو پرسیارە، من پرسیارتان لێ دەکەم: "ئایا پەیامەکەم گەیاندووە؟" لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەوانەی لەوێدا بوون بە دەنگێك کە زەمین و ئاسمانی دەزرنگاندەوە، وتیان: "بەڵێ، پەیامەکەت بەتەواوی گەیاند و ئەرکی سەرشانت بێ کەموکوڕی بەجێ گەیاند." لە پاش ئەم شایەتییە، سەروەری هەردوو جیهان دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و، فەرمووی: "پەروەردگارا بە شایەت بە!"[1]

بەڵێ، ئەمینی لە ئەمانەتدا، لە خوای گەورەوە دەستی پێ کردووە. ئەوجا بە حەزرەتی جوبرەئیلدا گوزەری کردووە و لە پێغەمبەری نازداردا (عَلَيْهِأَفْضَلُالصَّلَاةِ وَأَتَمُّالتَّسْلِيم) گیرساوەتەوە. پاشانیش لەوەوە بۆ ئوممەتەکەی گوازراوەتەوە. لە حەجی ماڵئاواییشدا بە شایەتییەك لە ئوممەتەوە، جارێکی تر بۆ لای خوای گەورە گەڕایەوە.

هەروەک کتێبە باوەڕپێکراوەکانی فەرمووده بۆمان دەگێڕنەوە، دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (رَضِيَاللهُعَنْهَا) دەربارەی هەست و شعووری ئەمانەت لە پێغەمبەری خوادا (عَلَيْهِأَفْضَلُالصَّلَاةِوَأَتَمُّالتَّسْلِيم) دەفەرموێ: "ئەگەر پێغەمبەری خوا - بە فەرزی

١ بخاري، حج ١٣٢؛ مسلم، حج ١٤٧؛ أبو داود، مناسك ٥٧.

مەحاڵ - ئایەتێکی بشاردایەتەوە لەو ئایەتانەی بۆی نازڵ دەبوون، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەم ئایەتەی دەشاردەوە"[1]:

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴾

(الأحزاب : ٣٧)

هۆکاری نازڵبوونی ئایەتەکەش ئەم ڕووداوەی خوارەوەیە:

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) هەستا بە بەستنی هاوسەرگیری لە نێوان زەیدی کوڕی حاریثی بەندەی ئازاد کراوی - کە خۆی گەورەی کردبوو و کردبووی بە کوڕی خۆی - لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش، کە کچی پووری خۆی بوو. بەڵام ئەم هاوسەرگیرییە بەو جۆرەی کە چاوەڕوان دەکرا، ئاسودەیی بەدوای خۆیدا نەهێنا. دایکی ئیمانداران، حەزرەتی زەینەب (رَضِيَٱللهُعَنْهَا) تەنها لەبەر گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر (عَلَيْهِٱلصَّلَاةُوَٱلسَّلَام) بەم هاوسەرگیرییە ڕازی بووبوو. جا لەبەر ئەوەی ئەم خێزانە هەر لەسەرەتاوە لەسەر بناغەی نابەدڵی دامەزرابوو، بۆیە خاتوو زەینەب نەیدەتوانی ڕێزی شایستە لە مێردەکەی بگرێت. جا خۆ خوای گەورە هەر لەزووەوە موورادی فەرمووبوو کە لە زەید جیاببێتەوە و بچێتە ڕیزی خێزانە پاکەکان (الأَزوَاجِ الطَّاهِرات) ی رسول اللهوە. بەڵام بەگوێرەی ئەو نەریتەی کە تا ئەو کاتە لە نێو عەرەبەکاندا باو بوو، هەر کەسێك بە یەکێکی بوتایە: "کوڕم" ئیدی ئەو کوڕە، هەر وەکو کوڕی ڕاستەقینەی ئەو کەسە سەیر دەکرا. بەم شێوەیە، هاوسەرەکەشی دەبوو بە بووکی ئەو کەسە. جا خۆ پێش ئەمەش دایکی زەینەب پێشنیازی ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا کردبوو کە کچەکەی بخوازێت. بەڵام سەروەرمان ئەو پێشنیارەی قبووڵ نەکردبوو. بەڵام ئەم جارەیان ڕاستەوخۆ خوای گەورە فەرمانی ئەم هاوسەرگیرییەی دەدا. هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو زەینەب بەلای پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُٱللهِوَسَلَامُهُعَلَيْهِ) زۆر سەخت و گران بوو، بەڵام فەرمانەکە لە ئاسمانەوە بوو...

١ بخاري، توحيد ٢٢؛ مسلم، إيمان ٢٨٨

جا بۆیە حەزرەتی عائیشەی دایکمان (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) ئاماژە بەم لایەنە دەکات و، دەفەرموێ: "ئەگەر پێغەمبەری خوا ئایەتێکی لەو وەحییە بشاردایەتەوە کە بۆی دەهات، ئەوا ئەو ئایەتەی دەشاردەوە کە ئەم هاوسەرگیرییەی لەخۆگرتبوو." بەڵام ئەو لە ئاست وەحیدا تا بڵێی ئەمین بوو. هەرگیز بەخەیاڵیدا نەدەهات کە تەنانەت بچووکترین شتیش ـ حاشا ـ بشارێتەوە. واتای ئایەتەکەش بەم جۆرەیە:

"یادی ئەوە بکەرەوە وەختێ دەتوت بەو کەسەی کە خوای گەورە نیعمەتی (هیدایەت و بوونە صەحابی رسول اللەی) پێ بەخشیوە و، تۆش ـ بە مامەڵەی جوان و ئازادکردنی لە کۆیلایەتی ـ چاکەت لەگەڵ کردووە: هاوسەرەکەت لای خوت بهێڵەوە و دەرهەق بەو لە خوا بترسە! بەڵام کە ئەمەشت دەوت، ئەو حەقیقەتەت لە ناختدا دەشاردەوە کە بەدڵنیاییەوە خوای گەورە ئاشکرای دەکرد. (بەم هۆیەوە) لە خەڵکی دەترسایت (نەوەك کاردانەوەیەکی وایان هەبێت کە زیان بەئیمانیان بگەیەنێت)، لە کاتێکدا ئەوە هەر خوای گەورەیە کە شایانی لێترسانە."

بەڵێ، ئەگەر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئایەتێکی بشاردایەتەوە - حاشا - ئەوا ئەم ئایەتە دەبوو. بەڵام وەك وتمان، ئەو ئەمین بوو لە ئەمانەتدا.. مەحاڵیش بوو هەرگیز شتێك بە پەنهانی بهێڵێتەوە.

ڕووداوێکی تر کە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ڕەهەندی ئەمانەت لای سەروەرمان:

ئەوە بوو لە غەزای بەدردا هەندێ لە کافرانی قورەیش بەدیل گیران. پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) سەبارەت بە چارەنوسی دیلەکان لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەردا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) ڕاوێژی کرد. حەزرەتی ئەبوبەکر ڕای وابوو کە لە بەرامبەر فیدیەدا دیلەکان ئازاد بکرێن. هەرچی حەزرەتی عومەریشە لەگەڵ ئەوەدا بوو کە هەموویان بە سزای خویان بگەیەنرێن. تەنانەت پێشنیاری ئەوەشی کرد کە هەرکەسەو خزم و نزیکەکانی خۆی بکوژێت. بەڵام پێغەمبەری خوا بۆچوونەکەی حەزرەتی ئەبوبەکری پەسەند کرد و لە بەرامبەر فیدیەدا دیلەکانی ئازادکرد. جا با پاشماوەی بەسەرهاتەکە لە حەزرەتی عومەرەوە ببیستین: "بۆ ڕۆژی دواتر کاتێك

چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا، دەبینم وا لەگەڵ ئەبوبەکردا هەردووکیان پێکەوە دەگرین. بەڵێ، هەردووکیان سەریان کز کردبوو و بەکوڵ دەگریان. هۆکارەکەیم پرسی. بەڵام هیچ کامیان توانای وەڵامدانەومیان نەبوو. پێداگریم کرد و وتم: چی دەبێ بە منیش بڵێن! ئاخر گەر شتێك هەیە شایانی گریان بێت، با منیش لەگەڵتان بگریم. لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا بەدەم گریانەوە فەرمووی: کەمێك پێش ئێستا ئەم ئایەتە نازڵبوو[1]:

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (الأنفال : ٦٧)

"بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە دیلی هەبێت، تا ئەو كاتەی بە تەواوی پایەدار و جێگیر دەبێ لە زەویدا. ئێوە ماڵ و شمەكی كاتیی دنیاتان دەوێ، كەچی خوای گەورە ئاخیرەتی دەوێ (كە هەتاهەتاییە بۆتان). خوای گەورە عەزیز (باڵادەست بەسەر هەموو شتێكدا) و حەكیم (خاوەن دانستی ڕەها)یە."

خۆ ئەگەر بچووکترین گریمانەی ئەوە هەبووایە کە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شتێك لە وەحی بشارێتەوە، ئەوا بە هەرحاڵ دووەم ئایەت کە دەبوو بیشارێتەوە، ئەم ئایەتە دەبوو. بەڵام پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە بەرامبەر وەحییەوە بە تەواوی مانا ئەمین بوو. لە بەشەکانی داهاتوودا کاتێك باس لە پاکی و بێگوناهی (العِصْمَة) پێغەمبەران دەکەین، سەر دەدەینەوە لە هەردوو ئایەتەکە و، هەوڵ دەدەین بە درێژی باس لەو لایەنانە بکەین کە پەیوەستن بە باسەکەوە.

## ب) بەرامبەر هەموو بوونەوەران ئەمین بوو

وەك چۆن پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە ئەرکی پێغەمبەرایەتییەکەیدا ئەمین بوو بەرامبەر بەو پەیامانەی لە پەروەردگاریەوە بۆی دەهات، هەر بەو جۆرەش ئەمنییەتەکەی هێندە لەناخیدا ڕەگ و بنجی داکوتابوو، سەرانسەری بوونەوەرانی گرتبووەوە.

1 مسلم، جهاد ٥٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٣٠-٣٣.

ئەوەتا جارێکیان کە لە ئیعتکافدا بوو، دایکی ئیمانداران حەزرەتی صەفییە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) هات بۆ سەردانی. لە پاش کەمێك دانیشتن، مۆڵەتی خواست بچێتەوە ماڵەوە. پێغەمبەری خواش بە مەبەستی بەڕێکردنی لەگەڵیدا چووە دەرەوە. هێشتا چەند هەنگاوێکیان نەنابوو کە یەك دوو صەحابی بێ وەستان بەلایاندا تێپەڕین. پێغەمبەری خواش دەستبەجێ ئەو دوو صەحابییەی وەستاند، ئەوجا ڕوخساری خاتوو صەفییەی هەڵدایەوە و، فەرمووی: "بڕوانن، ئەمە صەفییەی خێزانمە." ئەم هەڵوێستە لەسەر دڵی ئەو هاوەڵانە زۆر گران بوو، بۆیە یەکسەر وتیان: "پەنا بە خوا، ئاخر کێ بە خەیاڵیشیدا دێ گومانی خراپ بە تۆ بەرێ ئەی پێغەمبەری خوا؟!" بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە وێنەی گشت ڕەفتارەکانی تری، دەیویست بەم هەڵوێستەشی وانەیەك بڵێتەوە، بۆیە فەرمووی: "شەیتان بە نێو دەمارەکانی خوێنی ئادەمیزاددا بەردەوام دێت و دەچێت."[1] مادام شەیتان تا ئەم ڕادەیە نزیکە لەمرۆڤەوە، ئەوا بە ئاسانیش دەتوانێ گومان و ختووره بخاتە مێشکیەوە. جا ئێستا با گریمانەیەکی لە هەزاردا یەك، یان لە ملوێنێکیشدا یەك بێت بە مێشکدا، وەك ئەوەی: "داخۆ ئەو ئافرەتە کێ بوو کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوو؟!" ئەوا خوا پەنامان بدات ژیانی ئەبەدیی ئەو کەسە لەناودەبات و نووری ئیمانیش لە دەروونیدا خامۆش دەکات. جا لەبەر ئەمە، ئەو پێغەمبەرە مەزنە، کە نموونەی بەرجەستەبووی شەفەقەتە، دەستبەجێ دەگاتە فریا و، ئەستۆپاکی و ئەمنیەتی خۆی پیشان دەدا. لە هەمان کاتیشدا ئیمانی هاوەڵەکانی دەپاراست.

هەروەك دەبینن، تا ئەو ئاستە گرنگی بە ئەمنیەت و ئەمینی دەدا. جا مەگەر بەر لە پێغەمبەرایەتیش بە "ئەمین" نەناسرابوو؟[2] مەگەر تەنانەت ئەوانەش کە لە دواییدا بوونە دوژمنی سەرسەختی، هەر بەو سیفەتەوە ناویان نەدەبرد؟ خەڵکی هێندە لە ئەمینی ئەو دڵنیابوون، پێم وایە گەر بچویتایە بۆ لای ئەبوجەهل و پرسیاری ئەوەت لێ بکردایە کە بەنرخترین شتەکانی، بە شەرەف و ئابڕووشییەوە بە کێ دەسپێرێت،

---

[1] بخاري، إعتكاف ٨ ،بدء الخلق ١١؛ مسلم، سلام ٢٤-٢٥؛ طبراني، المجمع الكبير، ٧٢/٢٤.

[2] احمد بن حنبل، المسند ٤٢٥/٣؛ حاكم، المستدرك ٦٢٨/١؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٣٢٣/١؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٢١/١.

لە وەڵامدا دەیوت: "الأمین". بەڵێ، یەکەم کەس کە بە بیریدا دەهات "موحەممەدی ئەمین" دەبوو. بەڵێ بەو جۆرە بوو.. هەموو ژیانیشی بەم ڕۆحیەتە پڕ ئەمنیەتەوە بەسەربرد.

ئەوەندە ئەمین بوو، ئەوەتا کاتێك ئافرەتێك منداڵەکەی بانگ دەکرد: "تۆ وەرە، بزانە چیت دەدەمێ!" یەکسەر لێی دەپرسێ: "دەتویست چی بدەیتێ؟" ئافرەتەکەش لە وەڵامدا دەڵێ: "ئەی پێغەمبەری خوا، بەنیاز بووم هەندێ خورمای بدەمێ." لە بەرامبەر ئەمەدا سەروەرمان دەفەرموێ: "ئەگەر هیچ شتێکت پێنەبووایە بیدەیتێ، ئەوا درۆت لەگەڵدا دەکرد."[1]

پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ أكمَلُ التَّحَايَا) درۆی بە یەکێك لە نیشانەکانی دووڕوویی دادەنا و تا ئەوپەڕی سنوور خۆی لێ بەدوور دەگرت. درۆ یەکێکە لە نیشانەکانی مرۆڤی دووڕوو. دوو نیشانەکەی تریش بریتین لە: بەڵێن نەبردنە سەر و خیانەت کردن لە ئەمانەت.[2] نیفاق و دووڕوویی بە چ جۆرێك و تا چ ڕادەیەك لە پێغەمبەری خواوە دوور بوون، ناپاکی و خیانەتیش بەو ئەندازەیە دوور و پەرگیر بوون لەو زاتە...

ڕۆحیەتی ئەمنیەت لە پێغەمبەری سەروەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) تەنها لە بەرامبەر مرۆڤەکاندا ڕەنگی نەدەدایەوە، بەڵکو تەواوی بوونەوەران خۆیان لە هەرێمی ئەمنیەتەکەی ئەودا دەبینیەوە. ئەوە بوو جارێکیان یەکێك لە هاوەڵان بۆ ئەوەی ئەسپەکەی بهێنێتەوە، وای پیشان دەدا کە شتێکی لەدەستدا بێت. پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) بە بینینی ئەم دیمەنە زۆر ناڕەحەت بوو، بە ڕادەیەك گەیشتە ئەوەی ئەو هاوەڵە بانگ بکات و سەرزەنشتی بکات. بەڵێ، پێغەمبەری سەروەرمان بەم هەڵوێستەی، ئەو وانەیەی فێردەکردین کە ئەمین بوون، با لە بەرامبەر گیانلەبەرانیشەوە بێ، خەسڵەتێکە هەرگیز نابێ دەستبەرداری بین. جارێکی تریشیان لە کاتی گەڕانەوەیان لە یەکێك لە غەزاکان، یەك دوانێك لە هاوەڵان، بێچووە باڵندەیەکیان لە هێلانەکەی هێنابووە دەرەوە و دەستیان پیادەهێنا. لەو کاتەشدا دایکە باڵندەکە گەڕایەوە. کە بینی وا بێچووەکەی لە

---

١ أبو داود، أدب ٨٠؛ احمد بن حنبل، المسند ٤٤٧/٣.
٢ بخاري، إيمان ٢٤؛ مسلم، إيمان ١٠٧.

هێلانەکەدا نەماوە، کەوتە باڵەفڕکێ و ئۆقرەی لێ بڕا. وەختێ پێغەمبەری ڕەحمەت لەم حاڵەتە ئاگادار بووەوە، یەکسەر فەرمانیدا کە بێچووەکە بگەڕێنرێتەوە هێلانەکەی، تا چیدی دایکەباڵندەکە ئازار نەچێژێت. وەك بڵێی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئاماژە بەوە بکات کە ئەو ڕەفتارە، ڕەفتارێك نییە شایستەی ئەو کەسانە بێ کە وان لە مەقامی نوێنەرایەتی کردنی ئەمنیەت لەسەر زەویدا...[1]

تریفە نوورانییەکەی چواردەوریشی هێندە بە نووری درەوشاوەی ئەو مونەووەر بووبوون، هەر دەتوت ئەون.[2] ئەمینی ئوممەت، ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح یەکێکە لەوانە! لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا والی شام بوو. کاتێ هەرقل ویستی بە خۆی و سوپاکەیەوە بێت و هەوڵی داگیرکردنەوەی شام بدات، موسڵمانان لەبەر کەمی ژمارەیان توانای بەرگری کردنیان نەبوو. لە بەرامبەر ئەم دۆخە نالەبارەدا، ئەبوعوبەیدە دانیشتوانی شاری کۆکردەوە و، پێی ڕاگەیاندن کە: "تاوەکو ئەمڕۆ جیزیەمان لێ وەرگرتوون، لە بەرامبەریشیدا ئەرکی پارێزگاری کردنتانمان گرتبووە ئەستۆ. بەڵام لەم هەلومەرجەی ئێستادا توانای بەرگریکردنمان نییە. بۆیە ڕەوا نییە ئەو جیزیانەمان لەلا بمێنێتەوە." دوابەدوای ئەم قسانەش، چی جیزیە هەیە، گەڕێنرایەوە بۆ خاوەنەکانی.

قەشە و ڕاهیبەکان لە بەرامبەر ئەم دیمەنەدا توشی سەرسووڕمان هاتبوون. بۆیە بەجارێ ورۆژمیان بردە کڵێساکان و بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان کەوتنە نزا و پاڕانەوە. ئەوجا بە حەسرەتەوە سوپای موسوڵمانانیان بەڕێکرد بە هیوای ئەوەی کە جارێکی تر بگەڕێنەوە، دەیانوت: "پشت بە خوا دووبارە دەگەڕێنەوە و لە ستەمی هەرقل ڕزگارمان دەکەن."[3]

ئەبوو عوبەیدە ڕەببانییەك بوو ئەمنیەتی لێ دەباری و سیفەتی ئەمانەتی کردبووە

---

١ أبو داود، جهاد ١١٢، أدب ١٦٤؛ احمد بن جنبل، المسند ٤٠٤/١.

٢ ڕەحمەت لە عاریفی گەورەی نەتەوەکەمان، مەحوی شاعیر، کە وتوویەتی: بە نووری عەکسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەکیس بوویوون... غەریبی تازە هاتوو دەیوت ئەمە پێغەمبەرستانە.

٣ بلاذري، فتوح البلدان ١٤٣/١.

کالاّی بالاّی خۆی. تا ئەو ڕادەیەی کە تەنانەت جێی خۆی لە دڵی گاورەکانیشدا کردبووەوە. جا ئەگەر ئەمڕۆ ڕۆژئاوا گوێمان بۆ نەگرێت و بایەخ نەدات بە بانگەوازی ئەوانەی سەرگەرمی بانگەوازن، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەم کەموکورتییە بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە. گومان لەوەشدا نییە کە گەورەترین ناتەواوی ئێمە هەر لەم بابەتەدایە. بە هاتنی ئەو ڕۆژەش کە تیایدا سەرلەنوێ خۆمان بەم ئاکارە پۆشتە دەکەینەوە، دەبینە نموونەی ئەو نەتەوەیەی کە مرۆڤایەتی بەبێ دوودڵی متمانە و دڵنیایی خۆیی پێ دەسپێرێت. بەمەش، گەورەترین هەنگاومان ناوە بەرووی بەدەست هێنانەوەی پایەی شایستەی خۆمان لەنێو هاوکێشە جیهانییەکاندا.

دەکرێ لە ئەزموونی دەسەڵاتداریی و حوکمڕانی خەلافەتی عوسمانیشدا کاریگەری هەمان فەزای ئەمنیەت بەدی بکەین. ئەوەتا لە کاتی جەنگدا هەرکات بەروبوومێك یان میوەیەکیان لێ بکردایەتەوە لە درەختی ئەو باخ و بێستانانەی کە پێیدا تێ دەپەڕین، یەکسەر پارەکەشیان پێدا هەڵدەواسی. ئیدی ئەو مرۆڤە نەجیب و ڕەسەنانەی کە بووبوونە نموونەی بەرجەستەبووی ئەمنییەت، بەر لەوەی وڵاتان بە شمشێر فەتح بکەن، سەرەتا بەم ڕۆحیەتە پڕ ئەمنیەت و ڕەفتارە مەردانانەیان دڵەکانیان فەتح دەکرد. گەرنا، نە دەیانتوانی لە بەرامبەر ئەو زیهنیەتە ترسناکەی خاچپەرستاندا بچنە ئەوروپاوە، نە درێژەش بە بوونی خۆیان بدەن لەو ناوچانەدا. هەمان ئەو هەڵوێستەی ئەبو عوبەیدە لە شامدا نواندی، بۆ ماوەی چوار سەدەی ڕەبەق لە هەموو ناوچەکانی بەڵقان و ناوەوەی ئەوروپادا زیندوو ڕاگیرا. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە سەردەمی هەڵکشانە مەزنەکەدا، بە کەمترین قوربانی تاوەکو دەروازەکانی ڤیەننا فەتح کرا. هەر بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو لەو شوێنانەی کە بۆی ڕۆیشتبوون، بە درێژایی چەندین سەدە ئەمنییەت و ئارامییان تێدا بەرقەرار کرد. پێم وایە ئەو خوێنەی کە لە تورکیای نیوەی سەدەی ڕابردوودا بە مەبەستی بەرقەرارکردنی ئاسایش و ئارامی ڕژاوە، بە درێژایی پێنج سەدە و لە نێوان ئەو هەموو نەتەوە و ڕەگەزە جیاوازانەدا نەڕژاوە. بەڵێ، توێژینەوە و ئامارەکان ئەو ڕاستییە دەردەخەن کە تێکڕای قوربانیانی سەرجەم ئەو پێکدادانانەی کە لە ماوەی شەش سەد ساڵی حوکمڕانیی

خەلافەتی عوسمانیدا هاتووەتە کایەوە، ناگاتە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو لە تورکیادا بوونەتە سوتەمەنی توندوتیژی و نائارامییەکان. کەوابێ، بانگەشەکردنی ئەوەی کە فەتحەکانی ئەو سەردەمە دەرەنجامی بەکارهێنانی زەبر و هێز بووبن، بانگەشەیەکی بێ بنەما و دوور لە ڕاستییە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەگەر هۆکارەکانی گواستنەوەی ئەو ڕۆژگارە لەبەر چاو بگیرێت، دەردەکەوێت کە بەڕێوەبردنی دەوڵەتێکی لەو جۆرە، کە لە جوگرافیایەکی فراواندا فەرمانڕەوا بووە، شتێك نییە کە تەنها بە خۆسەپاندن و هێزی سەربازی دەستەبەر بوویێت.

بەڵێ، ئەگەر دڵ و دەروونەکانیان فەتح نەکردایە، چۆن دەیانتوانی ئەو هەموو خەڵکە، کە لە چەندین نەتەوە و نەژادی جیاواز پێکهاتبوون، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن و بەبێ سەر هەڵدانی گرفتێك کە شایەنی باس بێ، لە ژێر سایەی دەوڵەتێکدا بەڕێوە ببەن؟! هەر بۆیە ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەوێتە ئەستۆی گیانفیدایانی خۆشەویستی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، پەیڕەوکردنی هەمان شێواز و ڕێوشوێنە.

## ج) بانگهێشت کردنی ئوممەتەکەی بەرەو ئەمنیەت

سەرداری پێغەمبەران (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لەنێو کەشێکی پڕ دڵنیایی و ئەمنیەتدا پارێزگاری لەو پەیامانە دەکرد کە لە پەروەردگارەوە بۆی دەهاتن. ئەم بازنەیەشی هێندە فراوان گرتبوو، هەموو بوونەوەرانی تێدا جێ دەبووەوە. لە هەمان کاتدا ئەم پێغەمبەرە نازدارە (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام)، بانگی ئوممەتەکەشی دەکرد تا هەمان ئاکار بکەنە سەرمەشقی ژیانیان و، ئەمنیەت ببێتە پارچەیەکی دانەبڕاوی ژیانی کۆمەڵایەتیان. ئەستەم بوو لە پاڵیدا بچووکترین جۆری خیانەت، یان غەیبەت بکرێت. لە وەها حاڵەتێکیشدا، ڕاستەوخۆ بەرامبەرەکەی ئاگادار دەکردەوە و، ڕێی نەدەدا تۆز و گەردی غەیبەت لە ڕۆحی بنیشێت.

جارێکیان دایکی ئیمانداران، حەزرەتی عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) لە ئاست دیمەنێکدا وتی: "چەمکی کراسی ئەو ئافرەتە چەندە درێژە!" پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە بیستنی ئەم قسەیە، یەکسەر ئاگاداری کردەوە و، فەرمووی: "ئەی عائیشە!

غەیبەتی ئەو ئافرەتەت کرد و لە گۆشتەکەیت خوارد."[1] هەروەها لە بۆنەیەکی تردا بە هەمان شێوە ئەو هاوەڵەی ئاگادار کردەوە کە قسەی بە ماعیز وت.[2] هەموو ئەمانە لە کانگای ئەمنیەتی ئەو زاتەوە سەرچاوەیان گرتبوو. ئەوە بوو بەردەوام ئەم دوعایەی دەخوێند و ئامۆژگاری ئوممەتەکەشی دەکرد کە بیخوێنن:

اَللّٰهم إِنّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ البِطَانَةُ

"پەروەردگارا، پەنات پێ دەگرم لە برسێتی، چونکە بەڕاستی هاوڕێیەکی خراپە. وە پەناشت پێ دەگرم لە خیانەت، چونکە بەڕاستی هاودەمێکی بەدکارە."[3]

بەڵێ، پاراستنی ئەمانەت چەندە گرنگ بێ، دوورگیریش لە خیانەت ئەوەندە گرنگە. جا خۆ هەر یەکێکیشیان داخوازی ئەوی تریانە.

ئەم دەربڕینە داچڵەکێنەرەی خوارەوەش هەر تایبەتە بەو، دەرهەق بەو کەسانە فەرموویەتی کە پەیمان نابەنە سەر و دەستیان داوەتە خیانەت:

إِذَا جَمَعَ اللهُ الْأَوَّلِينَ وَ الآخِرِينَ يَومَ الْقِيَامَةِ يُرْفَعُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ فَقِيلَ هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ

"لە ڕۆژی دواییدا کاتێك خوای باڵادەست پێشینە و پاشینەکان کۆ دەکاتەوە، بۆ هەر خیانەتکارێك ئاڵایەك بەرز دەکرێتەوە و، دەوترێت: 'ئەمە ناپاکییەکەی فلانی کوڕی فیسارە'."[4]

پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دارای ڕۆحێکی ئەوتۆ بوو کە بە ڕووی هەموو خراپە و چەوتییەکدا داخراو و سەرمۆرکراو بوو. لە بەرامبەریشدا، بە

١ بڕوانە: ترمذي، قيامة ٥١؛ أبو داود، أدب ٣٥؛ احمد بن حنبل، المسند ١٨٩/٦.
٢ ابو داود، حدود ٢٣
٣ ابو داود، وتر ٣٢؛ نسائي، إستعاذة ١٩، ٢٠.
٤ بخاري، أدب ٩٩؛ مسلم، جهاد ٩-١٦ (لەفزی فەرموودەکە لە موسلیمەوە وەرگیراوە)

ڕووی بچووکترین چاکەدا، تەنانەت ئەوانەش کە بە لاوەکی دادەنرێن، دەروازەکانی ناخی خستبووە سەر پشت و، هەموو هەستان و دانیشتنێکی تەژی بوو لە هەستی چاکەخوازی. تەواوی ژیانی موبارەکی لەنێو کەشی دڵنیایی و متمانەدا بەسەر برد. جا بۆیە مرۆڤایەتیش متمانەی پێ کرد و پشتی پێ بەست. ئەو بەدبەختانەشی پشتیان تێکرد، هەڵخەڵەتان و هەر لە ڕێدا پەکیان کەوت. بەڵام ئەو، بە وێنەی فریشتەی پارێزەر هەمیشە لە خەمی ئوممەتەکەیدا بوو. ئەوەتا، هەرکێ، هەرکاتێ، لە هەر هەلومەرجێکدا لە دەرگای ئەو سەروەرەی دابێ، هەموو جارێك دەنگی "لبیك"ی لێوە بیستووە.

هەروەك چۆن حەزرەت مرۆڤێکی متمانە پێکراو بوو، خۆشی هەر بەو جۆرە متمانەی ڕەهای بە خوای گەورە هەبوو و لە هەموو جووڵەیەکیدا پشتی پێ دەبەست. متمانە و تەوەککول بریتییە لە عورووج و بڵندبوونەوەی ئەمانەت لە پێغەمبەرەوە بۆ خوای گەورە. نازڵ بوونی ئەمانەتیش لە لایەن خوای گەورەوە، لەسەر شێوەی ئەمنیەت و دڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا ڕەنگی دەدایەوە. جا بە یەکگرتنی کۆتاییەکانی ئەم دوو کەوانەیە، متمانە و دڵنیایی هەمەکی و سەرتاسەری بەرپا دەبوو.

سەرجەم پێغەمبەران(عَلَيْهِمُ السَّلام) بەم خەسڵەتە - تەوەککول و متمانە بە پەروەدگار - سەرفراز کراون. ئەمەش خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە تایبەتمەندییە دانەبڕاوەکانی ئەو کەسایەتییە ناوازانە. قورئانی پیرۆز لەم ئایەتانەی خوارەوەدا ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات و، دەفەرمویێ:

﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِى وَتَذْكِيرِى بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ ٱقْضُوٓاْ إِلَىَّ وَلَا تُنظِرُونِ﴾ (يونس : ٧١)

"ئەی پێغەمبەر (پوختەی بەسەرهات) و هەواڵی نوحیان بەسەردا بخوێنەوە، کاتێك بە قەومەکەی خۆی وت: ئەی قەومەکەم! ئەگەر ئێوە سەغڵەتن بە

مانەوەی من لەناوتاندا و، یادخستنەوەی ئایەتەکانی خواتان لا گرانە. ئەوا بزانن کە من تەنها پشتم بەو بەستووە و متمانەم هەر بەوە. دەسا خۆتان و بتەکانتان و هاوبیروباوەڕەکانتان بکەونە خۆ و، ڕای خۆتان کۆبکەنەوە، نەبادا لە دواییدا گرێیەکتان لە دڵدا دروست ببێ. ئینجا ئەو بڕیارەی داوتانە، جێبەجێی بکەن، هیچ باکم پێتان نییە. هیچ ماوەشم مەدەنێ."

حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلام) متمانە و تەوەککولی تەواوی بە خوای گەورە هەبوو. هەر بۆیە لە ڕووی تێکڕای گرۆی بێباوەڕاندا دەوەستایەوە و، بوێرانە دەیفەرموو: "ئەگەر مانەوەم، هەڵوێست و پێگەکەم و گەیاندنی فەرمانەکانی پەروەردگارتان بەلاوە قورسە و پێتان قبووڵ ناکرێ، ئەوا مەوەستن، چیتان لە دەست دێ بیکەن. وا منیش پەنام بردە بەر خوا و پشتم بەو بەست. ئیتر ئەوە من و ئەوەش ئێوە. ئێوە بە خۆتان و ئاپۆرەی دەورتانەوە، منیش بەس خۆم. بەڵام دڵنیابن کە خوای گەورە لە بەرامبەر ئێوەدا زایەم ناکات. جا ئێستا کۆببنەوە و بکەونە ڕاوێژ و پلانی جۆراجۆر لە دژم دابڕێژن. کاتێك بەم کارەش هەڵدەستن، گشت یاریدەدەر و هاوبەش و ئەوانەش کە بە دەنگتانەوە دێن، بانگ بکەن و لە دەوری خۆتان کۆیان بکەنەوە. ئەمە بکەن، نەبادا دواتر لە ناختاندا گرێیەك دروست بێت و، بڵێن: 'خۆزگە فڵانە شتیشمان بکردایە.' چیتان بە خەیاڵدا دێ و لە تواناتاندایە بیکەن. ئەمە منم، هەرچی لە ئێوەوە دێ، با بێ!"

کاتێك حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلام) ئەم فەرمایشتانەی دەفەرموو، لەوپەڕی پلەی تەوەککول و متمانەدا بوو بە پەروەردگار. دڵنیابوو کە خوای گەورە دەیپارێزێت. ئەگەرچی بە تەواوی نازانین ژمارەی ئەو کەسانە چەند بوو کە سواری کەشتییەکەی بوون، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەزانین کە چەندین پێغەمبەر - بە حەزرەتی ئیبراهیمیشەوە (عَلَيْهِ السَّلام) - لە وەچەی ئەوەوە هاتوون. چونکە قورئانی پیرۆز حەزرەتی ئیبراهیم لە نەتەوەی ئەو هەژمار دەکات و، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴾ (الصافات : ٨٣) "بێگومان ئیبراهیمیش لە نەتەوەی نوح بوو (لە پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی بوو)."

ڕەوش و ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی ئیبراهیمیش (عَلَيْهِ السَّلام) تەسلیمییەت و

تەوەککولمان بەم شێوەیە بۆ وێنا دەکات:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (الممتحنة : ٤)

"بە ڕاستی لە حەزرەتی ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون سەرمەشق و نموونەی چاك هەیە بۆتان. ئەوان بە گەلەکەی خۆیانیان وت: بە ڕاستی ئێمە لە ئێوەش و لەو شتانەش کە جگە لە خوای باڵادەست دەیانپەرستن، دوور و بەریین، هەر ناشتان ناسین. هەتا ئەو کاتەی باوەڕ دەهێنن بە خوای تاك و تەنها، لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و ڕقێکی بەردەوام لە ئارادایە. جگە لەو بەڵێنەی کە ئیبراهیم دای بە باوکی و، وتی: بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم. بەڵام توانای پێشگیریم نییە لە هیچ شتێك کە لە لایەن خواوە بەسەرتا بێت. ئینجا وتیان: ئەی پەروەردگارمان! پشتمان بە تۆ بەستووە و ڕوومان کردووەتە تۆ، گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە."

بەڵێ، حەزرەتی ئیبراهیم و ئەوانەش کە لەگەڵیدا بوون، لە دژی کوفر یاخی بوون و لە ڕووی کافراندا وەستانەوە و، وتیان: "ئێمە فەرسەخ فەرسەخ لەو شتانە دوورین کە جگە لە خوای گەورە دەیپەرستن. ئێمە، ئێوە و سەرجەم ملهوڕەکانیشمان وەلا ناوە. هەرچی دوژمنایەتی نێوانیشمانە، تا دێت پەرە دەسێنێت." جا خۆ ئەم دوژمنایەتییە هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە (عَلَيْهِ السَّلام) تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەر بەردەوام بووە. ئیمان و کوفر هەر لە یەکەم ڕۆژیانەوە دوژمنی یەکتری بوون و مەحاڵە لە یەك شوێندا جێیان ببێتەوە. بۆیە بە دڵنیاییەوە کوفر بەرۆکی ئیمان دەگرێ و چاوی پێی هەڵنایەت. ئاخر نەیاری کردنی ئیمان، لە سروشتیدا بنجی داکوتاوە! بەڵێ، دیدەی شەمشەمەکوێرە کوێرایی دادێ بە ڕووناکی. جا لەبەر ئەوەی چاوی کوفر ڕانەهاتووە

بە ڕووناکی، بە وێنەی شەمشەمەکوێرە بە نووری ئیمان و پێغەمبەرایەتی بێزار دەبوو.

هەروەها ڕاشیگەیاند کە: "هەتا ئێوەش وەك ئێمە باوەڕ نەهێنن بە خوای گەورە و پشت بەو نەبەستن، هەرگیز دوژمنایەتی نێوانمان دوایی نایەت." هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ماهییەتی کوفر لەگەڵ گومڕایی و ساردوسڕییدا شێلراوە. بابای کافر بە چاوی دوژمنایەتییەوە دەڕوانێتە بوونەوەران. هەرچی ڕۆحی مرۆڤی ئیمانداریشە، کانگای مرۆڤایەتی و دۆستیایەتییە. ئیماندار بە پێچەوانەی کافرەوە، گەردوون بە لانکەی برایەتی بەدیهێنراوان دەبینێت. هەمیشە لە هەوڵی گەڕاندایە بەدوای دۆزینەوەی خاڵی پێکگەیشتن و سازاندنی کەشێکیگفتوگۆ ئامێز لەگەڵ هەمووواندا. لە کاتێکدا کە ئەمە حاڵی ئیماندارە، کەچی کافر چێژ لە شەڕفرۆشتن و تێکدان وەردەگرێت. جا بە هاتنی ئەو ڕۆژەی کە تیایدا هەمووان باوەڕ بە خوای گەورە دەهێنن و، مەشخەڵی ئیمان لە ناخیاندا دادەگیرسێ، ئاشتەوایی و ئارامییەکی گشتگیر باڵ بەسەر هەموو لایەکدا دەکێشێ. چاوەڕوان کردنی ئەم ئاشتەواییەش لە کوفر و کافران جگە لە غەفڵەت و ساویلکەیی چی تر نییە. چونکە کوفر بەدەر لە پێکدادانی گەل و نەتەوەکان شتێکی تری پێ نییە تا پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات. هەر بۆیە قورئانی پیرۆز وتەکانی حەزرەتی ئیبراهیم کە بە باوکی وتووە، وەك حاڵەتێکی تایبەت باس دەکات. قسەکەی حەزرەتی ئیبراهیمیش تەنها ئاوات خواستنێك بوو لە بەزەیی و سۆزە بێئەندازەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو. وێڕای ئەمەش، ڕاستەوخۆ بە دوایدا زۆر بەڕوونی دەری بڕی کە لە بارەگای پەروەردگاردا هیچ شتێکی لە دەست نایە بۆ باوکی. لە پاش ئەمەش متمانە و تەوەککولی کامڵی خۆی دووپات کردەوە و، فەرمووی: "پشتمان بە تۆ بەستووە و ڕوومان کردووەتە تۆ." بەڵێ، ئەگەر بە وردی بڕوانینە ژیانی پێغەمبەران، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە تەوەککول و پشت بەستن بە خوای گەورە لەواندا لە ترۆپکەدایە. تەوەککولی ئەوان هەرگیز هاوشێوەی تەوەککول و پشت ئەستووریی کەسانی ئاسایی نییە. چ جای ئەوەی ئەم تەوەککولە، تەوەککولی سەرداری پێغەمبەران بێ! بەڵێ، تەوەککولی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە چاو پێغەمبەرانی تردا، دارای فراوانی و قووڵییەکی تایبەتترە...

بەر لە هەموو شتێ، پەروەردگار فێری کردبوو کە بڵێ "حسبي الله"[1]، ئیتر پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) سەرتاپای ژیانی لەنێو دڵنیایی و متمانە و تەوەککولدا بەسەر برد. جێی تێڕامانە کاتێك کەسێکی قارەمان و بەجەرگی وەك حەیدەری کەڕڕاڕ، حەزرەتی عەلی، دەفەرموێ: "کاتێك لە جەنگدا زۆرمان بۆ دەهات و ترسمان لێ دەنیشت، دەستبەجێ پەنامان بۆ پێغەمبەری خوا دەبرد، ئیتر بەم شێوەیە خۆمان لە دڵنیاییدا دەبینییەوە."[2]

## د) ئەمنیەت لە کاتی هیجرەتدا

لە دەمی هیجرەتدا و لەو ساتە وەختانەدا کە کافرە دڵ پڕ لە قینەکان بە مەبەستی کوشتنی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چواردەوری خانووەکەیان تەنیبوو، ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا ﴾ (يس : ٩) "لە بەردەم و لە پشتیشیانەوە بەربەستمان دانا." و مشتێك خۆڵی وەشاند بەسەریاندا و بێ هیچ شڵەژانێك بەنێویاندا ڕەت بوو.[3] بەڵێ، هەروەك دەبینین حەزرەتی موحەممەد تا ئەو ڕادەیە چاونەترس و بێ پەروا بوو.

دواتر ڕێگەکەی بە ئەشکەوتی "ثەور"دا گوزەری دەکرد... ثەور لە لوتکەیەکدا بوو کە تەنانەت گەنجەکانیش بە زەحمەت پیایدا سەردەکەوتن. بەڵام وا ئەو سەروەرە لە تەمەنی پەنجا و سێساڵیدا بەو لوتکەیەدا سەردەکەوێت. جا خۆ تا ئەو کاتە ژیانی پڕ بوو لە تابلۆی ئازار و ناخۆشی! ئەمەش دواهەمینێکیان بوو. ئێستاش بەدەم ئەو بانگهێشتەوە دەچوو کەوا ئەو ئەشکەوتە بەختەوەرە بە زمانی تایبەتی خۆی ئاراستەی ئەو ئازدارەی کردبوو. ئیدی ثەور بە میوانداری کردنی چەند ڕۆژەی ئازیز، شەرەفمەندییەکی مەزندە نەکراوی بەدەست دەهێنا...

لەو نێوەندەشدا موشریکەکانی مەککە لە بەردەرگای ئەشکەوتەکەدا دەهاتن و

---

١ بڕوانە: سورەتی التوبة، ئایەتی ١٢٩.
٢ أحمد بن حنبل، المسند ١٥٦/١؛ أبو يعلى، المسند ٢٥٨/١.
٣ إبن هشام، السيرة النبوية ٨/٣-٩؛ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٥٦٧/١.

دەچوون. تەنها مەترێك لە نێوانیاندا هەبوو یان نەبوو. یاری وەفاداری ئەشکەوت، صیددیقی ئەکبەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، لەتاو هەستیاری و ترسناکی ڕووداوەکە تووشی دڵەڕاوکێ و شڵەژان ببووبوو. ئاخر ئەو وای بیر دەکردەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەمانەتە لە لای، بۆیە لە خەم و پەرۆشی ئەوەدا بوو کە: "ئەی ئەگەر خوانەخواستە بەر لەوەی ئەو ئەمانەتە بگەیەنمە شوێنی خۆی، شتێکی لێبێت..." بۆیە لە تاوا زەرد هەڵگەڕابوو. کەچی خەندەی شیرینی سەر لێوی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) تۆزقاڵێکیش چییە کەمی نەکردبوو. بەردەوام دڵنەوایی یاری دەکرد و، لە ڕێژنەی دڵنیایی و ئەمنییەتی خۆیی بەسەردا پەخش دەکرد و، دەیفەرموو: لَا تَحْزَنْ، إِنَّ اللهَ مَعَنَا "خەم مەخۆ! خوای گەورەمان لەگەڵدایە."[1] ئینجا ئاوی کەوسەرئاسای تەوەککولی دەپرژاند بەسەر دڵیدا و، دەیفەرموو: مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا؟! "ڕات چییە بەرامبەر بە دوو کەس کە سێهەمیان خوای گەورە بێت؟"[2]

## هـ) ئەمنیەت لە مەیدانی جەنگدا

لە سەرەتای غەزای حونەیندا پەرتەوازەییەك لە ڕیزەکانی سوپای موسوڵماناندا سەری هەڵدا. بە جۆرێك، وەك بڵێی هاوەڵان بە ڕاست و چەپدا هەڵدەهاتن و باوەڕیان وابوو کە شکست و دۆڕان، چارەنووسی چاوەڕوانکراویانە. ڕێك لەو ساتەوەختانەدا بوو کە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو تەوژمی ڕووداوەکانی بەرەو ئاڕاستەیەکی تر گۆڕی. بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە سواری ئەسپەکەیەوە کە حەزرەتی عەبباس لە هەوڵی ڕاگیرکردنیدا بوو، بەرەو ناوجەرگەی ڕیزەکانی سوپای دوژمن هەڵمەتی برد و هاواری دەکرد: أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ "من نێرراوی پەروەردگارم، هیچ درۆیەك لەمەدا نییە، من نەوەی عەبدولموتەلیبم، هیچ درۆیەك لەمەدا نییە." لە سایەی ئەم ئازایەتی و بوێرییەی پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)، موسوڵمانان لە ماوەیەکی کەمدا خۆیان کۆکردەوە و ڕیزەکانیان ڕێك خستەوە. بەم جۆرە توانیان

---

١ سورەتی التوبة، ئایەتی ٤٠.
٢ بخاري، تفسير (٩) ٩؛ مسلم، فضائل الصحابة ١.

زاڵبن بەسەر ئەو چارەنووسە نەخوازراوەدا و هەڵهاتن گۆڕا بە هەڵمەت بردن.[1]

## و) تەسلیمیەتی سەرسووڕهێن

لەپاش گەڕانەوەی لە غەزای "ذات الرقاع"، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەژێر دارێکدا ئیسراحەتی دەفەرموو. لەو کاتەدا دەشتەکییەکی بێباوەڕ بە ناوی "غەورەثی کوڕە حاریث" ئەم هەلە دەقۆزێتەوە و پڕ دەکات بە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوادا کە بە یەکێك لە لقەکانەوە هەڵی واسیبوو و لە گەردنی توند دەکات. ئینجا بە گاڵتەجاڕییەوە دەڵێت: "ئێستا کێ لە دەست من ڕزگارت دەکات؟!" لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستە لەرزۆکەدا، هەرچی ناوی ترس بێت لە پێغەمبەری خوادا دەرنەکەوت. چونکە متمانەی بە پەروەردگاری لە چلەپۆپەی کەماڵدا بوو. بۆیە بێ پەروایانە و بەوپەڕی متمانەوە، بە ئاوازێکی بەرز هاواری کرد: "الله" شریخەی ئەم ئاوازە لە گیانی کابرادا زرنگایەوە و دڵی داخورپاند. لە پەشۆکاویدا شمشێرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و لە شوێنی خۆیدا وشك بوو. ئەم جارە پێغەمبەری خوا شمشێرەکەی هەڵگرتەوە و ڕووی کردە کابرا و، پێی فەرموو: "ئەی ئێستا کێ تۆ لە دەستی من ڕزگار دەکات؟" کابرای دەشتەکی وەك کەسێك گەشکەی گرتبێت، دەلەرزی. لەم نێوەندەشدا یارانی نەبی بە بیستنی دەنگی پێغەمبەری خوا گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە. ئەوانیش تووشی سەرسوڕمان هاتبوون. کاتێکیش درێژەی ڕووداوەکەیان بیست، متمانە و تەوەککولیان بە خودای گەورە ئەوەندەی تر زیادی کرد. غەورەثیش بە بینینی ئەم مامەڵە پڕ ئەمن و ئەمانەتە، پەیمانی ئەمینی بە "الأمین" دەدات و دەڕوات بە ڕێی خۆیەوە.

بیرمەندی ناوداری ڕۆژئاوا بێرنارد شۆ، لەم بارەیەوە دەڵێت: "حەزرەتی موحەممەد مرۆڤێکە چەندەها تایبەتمەندی مەزن و ئاوازەی هەیە کە ژیری ئادەمیزاد لە ئاستیدا دۆش دادەمێنێت. مەحاڵە کە بە تەواوی مانا دەرکی ئەو کەسایەتییە ڕازدارە بکەین. بەتایبەتی ئەو لایەنەی کە تێگەیشتنی ئەستەمە، متمانە و تەوەککولە ڕەهاکەیەتی

١ بخاري، جهاد ٥٢؛ مسلم، جهاد ٧٦-٨٠.

به پەروەردگاری." شۆ ڕاستی دەوت...

به شێوەیەك ئاوێتەی تەسلیمیەت و تەوەککول بووبوو، که نه هەڵسەنگاندنی لە توانامانداية، نه پێوانەکردنیشی بۆ ئێمەی ئادەمی مەیسەر دەبێ. پایه و قەدر و بەهاشی لە لای خوای گەورە، هێندەی متمانه و تەوەککولەکەی بوو. هەر بۆیە لە شوێنی خۆیدا، لەبەر حورمەتی خواست و پاڕانەوەی ئەو، شەوگارە دەیجورییەکان دەبوونە ڕۆژگار، تاریکییەکانیش دەگۆڕان بۆ نوور. هەر ئەوەندەی ئەو بیویستایە، خەڵووزەکان دەبوون بە ئەڵماس و، موڵکی سوڵتانەکانیش دەبەخشرا بە گەداکان. دەمەوێت بەم بۆنەیەوە ڕووداوێکتان عەرز بکەم کە گێڕانەوەکەی دەدرێتە پاڵ ئیمام حەسەنی بەصری. پێم وایە ئەم ڕووداوە لە گۆشەی تیشك خستنە سەر گرنگیی وابەستە بوون بە پێغەمبەری خواوە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) جێی سەرنجە. دەکرێ لە ڕوانگەی پێوەرەکانی زانستی فەرموودەوە ڕەخنە لە بەسەرهاتەکە بگیرێت، بەڵام هاوشێوەکانی هێندە زۆرن، وەك شتێکی ئاسایی لێ هاتووە. هیچ گرفتێکیش لە گێڕانەوەیدا نابینم. پوختەی بەسەرهاتەکە ئەمەیە:

گەنجێکی خەڵکی بەصرە لەگەڵ باوکە بەساڵاچووەکەیدا نییەتی حەج دێنن. لە ڕێگەدا باوکە کۆچی دوایی دەکات، بەڵام چ کۆچکردنێك! تەرمی کابرا مەسخ دەبێت و شێوەی دەگۆڕێت بۆ مەخلوقێکی ناشیرین. ئەم حاڵە دژوارە، هێندە کار لە کوڕە بەستەزمانەکە دەکات، لە تاوا تووشی پەشۆکان دێت و دنیای لێدێتەوە یەك. ئاخر ئێستا هاوار بۆ کێ بەرێ و ئەم تەرمە سامناکە پیشانی کێ بدات؟! کاتێك گەنجە بێ چارەکە لە ناو ئەم خەم و خەفەتانەدا دەتلێتەوە، لەپڕ خەوێکی قورس زۆری بۆ دێنێت. کاتێك لە حاڵەتی نێوان خەو و بێداریدا دەبێت، دەبینێت کەوا دەرگای چادرەکە دەکرێتەوە و کەسێکی نوورسیما خۆی دەکات بە ژووردا و لە پەنا سەری تەرمەکەدا دەوەستێت. ئینجا دەست دەهێنێت بەتەواوی تەرمەکەدا و، دەستیشی بەر هەر شوێنێك بکەوتایە، یەکسەر دەگەڕایەوە بۆ باری پێشووی. تا لە کۆتاییدا تەرمەکە بە جارێ بوو بە مرۆڤێکی نوورانی درەوشاوە. سەرسامیی سەرتاپای گەنجەکەی داگرتبوو. ڕێك لەو کاتەدا کە زاتە نەناسراوەکە دەیویست بچێتە دەرەوە، گەنجەکە

---

(ئەمانەت - تەبلیغ - فەتانەت)

بەری پێ دەگرێت و، لێی دەپرسێت: "بۆ خاتری خوا، پێم بڵێ تۆ کێیت؟!!" ئەو زاتەش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: "بۆ نەتناسیمەوە؟!! من پێغەمبەری خوام." هەر کە گەنجەکە ئەمە دەبیستێت، لە خۆشیاندا خەریکە باڵ بگرێت. "ئەی پێغەمبەری خوا، چی ڕوویداوە، بۆچی شێوەی باوکم گۆڕا؟!" پێغەمبەری خوا وەڵامی دەداتەوە و، دەفەرموێت: "باوکت بە درێژایی ژیانی بەردەوام مەیی دەخواردەوە. هۆکاری مەسخ بوونەکەشی هەر ئەمە بوو." گەنجەکە خۆی پێ ناگیرێت و، دەڵێت: "دایك و باوکم بەقوربانت بن، ئەی هۆکاری تەشریف هێنانی ئێوە چی بوو؟!" پێغەمبەری خواش لەوەڵامدا دەفەرموێت: "هەرکاتێك ناوم ببرایە، باوکت سەڵاواتی لەسەر دەدام..."

جا هەروەك بینیتان تەنانەت ئەو تۆزە پەیوەندییەی ئەو کابرایەش بێ بەرامبەر نامێنێتەوە. لە موحتاجترین کاتدا دەگاتە هانای و بە شەفاعەتی خۆی لە ئامێزی دەگرێت و - بە ئیزنی خوا - ڕۆحیانەتەکەی لەوێ ئامادە دەبێ.

پێغەمبەری خوا لە نێو تەواوی گرۆی ئادەمیدا تاکە کەسە کە زۆرترین متمانەی پێ بکرێت و پشتی پێ ببەسرێت. هەر بۆیە دەبێ ئوممەتەکەشی شایانی هەمان متمانە بێت. لەم سۆنگەیەوە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾ (النساء : ٥٨)

"بەڕاستی پەروەردگار فەرمانتان پێدەدات کە هەموو ئەمانەت و ڕاسپاردەکانتان بە کەسانی شایستە بسپێرن، هەر کاتێکیش لە نێوان مرۆڤەکاندا دادوەریتان کرد، دادپەروەرانە بڕیار بدەن. پەروەردگار چەندە ئامۆژگاری جوان و بەجێتان دەکات! بێگومان خودای گەورە بیسەری هەموو شتێکە و بە هەموو شتێکیش بینایە."

سەرچاوەکانی تەفسیر هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەمان بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ باس دەکەن: کاتێك فەتحی مەککە کرا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) کلیلەکانی کەعبەی لە عوسمانی کوڕی طەلحە، کە زۆر نەبوو موسوڵمان بووبوو،

وەرگرت و بە دەستی موبارەکی خۆی کەعبەی کردەوە. لەو کاتەشدا حەزرەتی عەبباس هات و داوای کلیلەکانی کرد. لەوانەیە عوسمانی کوڕی طەلحە شایستەتر بووبێت بەو ئەمانەتە و، لە هەمان کاتیشدا بەم هەڵوێستە دڵی بەڕووی ئیسلامدا نەرمتر ببوایە. جا خۆ هەرواش بوو... بەڵێ، بە نازڵ بوونی ئەم ئایەتە، کلیلەکانی کەعبە دووبارە درایەوە بە عوسمانی کوڕی طەلحە.[1] بەڵام حوکمی ئایەتەکە گشتییە، واتە حوکم و بنەماکانی ئایەتەکە لە هەموو کات و شوێنێکدا بەکارن. ئەوەتا پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَكْمَلُ التَّحَايَا) لە شوێنێکی تردا نەمانی ئەمانەت بە یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ناو دەبات و، دەفەرموێت: "هەر کات ئەمانەت زایی کرا، ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بە." ئەصحاب دەپرسن: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمانەت چۆن زایی دەبێ؟" ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێ: "ئەگەر کاروبار سپێررا بە کەسی نەشیاو، ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بن."[2]

بەڵێ، ئەمانەت زۆر گرنگە. سپاردنی کاروباریش بە کەسانی شیاو، خودی ئەمانەتە و لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لە کۆڵەکەکانی ڕاگیرکردنی هاوسەنگیی جیهانی. "نەمانی ئەمانەت" و پشێوی لە ڕێسا و هاوسەنگی گشتییدا، دوو ڕووی جیاوازن بۆ هەمان حەقیقەت. دنیایەکی لەو جۆرەش بوون و نەبوونی یەکسانە. لە فەرمایشتێکی شیرینی تردا، بەمجۆرە تیشك دەخاتە سەر ئەم لایەنە:

كُلُّكُمْ رَاعٍ وَ كُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ. اَلْإِمَامُ رَاعٍ وَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ. وَ اَلرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَ هُوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَ اَلْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَ مَسْؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا. وَ اَلْخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ

"هەریەك لە ئێوە شوان (سەرپەرشتیار)ە و بەرپرسیارە لەوەی لەژێر دەستیدایە.

---

١ إبن كثير، تفسير القرآن العظيم ٥١٦/١-٥١٧.
٢ بخاري، علم ٢؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٦١/٢.

سەرۆکی وڵات شوانە و لێپرسراوە لەوانەی لەژێر دەستیدان. هەر پیاوێك شوانی ماڵ و منداڵەکەیەتی و لێیان بەرپرسە. ئافرەت شوانی ماڵی مێردەکەیەتی و بەرپرسە لەو شتانەی لە بازنەی چاودێری ئەودان. خزمەتکار شوانی ماڵی گەورەکەیەتی و لێپرسراوە لەو شتانەی لەبەردەستیدان. هەمووتان شوانن و هەمووشتان بەرپرسن لەو شتەی لەژێر دەستاندایە."[1]

ئەو مەبەستەی لەم چوارچێوە فراوانەدا ئاماژەی بۆ کراوە، بریتییە لە: لەم دنیایەدا هەر هەموومان ئەمانەتی یەکترین. بە جۆرێك کە سەرانسەری بوون ئەمانەتی پەروەردگارە. قورئانی پیرۆزیش لە سەرەتادا ئەمانەتی حەزرەتی جوبرەئیل و پاشانیش ئەمانەتی حەزرەتی "سید الانام"ە. حەقیقەتەکانی قورئان و دەعوای نبووەتی حەزرەتی موحەممەدیش (عَلَيهِ أَلفُ صَلاةٍ وَسَلَام) ئەمانەتی ئوممەتە. ئینجا دواجار تێکڕای ئوممەتیش ئەمانەتی خوای باڵادەستە.

سەرجەم ئەو پایە و کۆڵەکانەی ژیانیان هێناوەتە مەیدان و ژیانبەخشی ژیانی کۆمەڵگاکانن، هەر هەموویان بە وێنەی کۆمەڵە بازنەیەکی هاوچەق، چوون بەناو یەکدا و تێهەڵکێشی یەکترن. بچووکترین هەڵە و نارێکی لە هەر یەکێك لەم بازنانەدا، چەند قات دەبێت و بەو جۆرە دەگوازرێتەوە بۆ بازنەکانی تر. پێم وایە کەسیش گومانی لەم ڕاستییە نییە. لە حاڵێکدا ئەگەر تاك تووشی هەر لادانێك بوو، وە شایەت لە کاتی خۆیدا چارەسەری پێویستی بە هاناوە نەخرا و فەرامۆش کرا، ئەوا کەس گومانی لەوە نەبێت کە بە ماوەیەکی زۆر کەم ئەو لادانە بچووکە دەگۆڕێت بۆ دەردێکی سامناکی وا کە هەتوانی مەحاڵ بێت. جا بۆیە پێویستە هەر بازنەیەك بە باشترین شێوە مافی ئەو ئەمانەتە بدات کە پێی سپێرراوە. تاوەکو دەروازەی هیچ ئەگەرێك بەڕووی هەڵە و لادانەکاندا بە کراوەیی نەمێنێتەوە و، دارمانە یەك لە دوای یەکەکان نەتوانن زەفەرمان پێ بەرن.

ئیتر بەم شێوەیە، فەرمووده پیرۆزەکە ئاماژە بەم پەیوەندییە دەکات. جا ئەگەر لەم چوارچێوەیەدا، هەر لە دەرگاوانەوە تا دەگاتە سەرۆکی وڵات و دانە دانەی تاکەکانی

١ بخاري، جمعة ١١، وصايا ٩؛ مسلم، عمارة ٢٠.

کۆمەڵگا، لە بەرامبەر ئەمانەتدا بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن و، لە ئاستی هەستی بەرپرسیارێتیدا بن، ئەوا ئەو کات مرۆڤایەتی ئەوەی لە یوتۆپیاکاندا بەدوایدا دەگەڕێت، لەم مەملەکەتی ئەمین نشینانەدا دەیدۆزێتەوە.

هەر لە ڕوانگەی ئەم خاڵە جەوهەرییەی ئەمانەتەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) دەفەرموێ: لَا إِيمَانَ لِمَنْ لَا أَمَانَةَ لَهُ "کەسێ ئەمانەتی نەبێ، ئیمانیشی نییە."[1] جا بۆیە ئەو مرۆڤەی کە ڕەچاوی ئەمانەتی ژێر دەستی ناکات و لە ئاست ئەمانەتدا ئەمین نییە، هەرگیز بە ئیماندارێکی کامڵ دانانرێت.

واتە لە ڕوویەکەوە ئیمان و ئەمانەت وەك هۆکار و ئەنجام وان بۆ یەکتری. هەروەك چۆن ئەو کەسەی بەرامبەر ئەمانەت هەستیار و پارێزگار نییە، نابێتە ئیماندارێکی کامڵ، بە هەمان شێوە، مەحاڵە لە دەرەوەی ئیماندارە کامڵەکاندا ڕێت لە کەسێك بکەوێت کە سیفەتی ئەمانەت پارێزی لە ناخیدا ڕەگی داکوتابێت. بەڵێ، ئەگەر مرۆڤ ئیماندارێکی کامڵ، بێگومان لە ئەمانەتیشدا ئەمین دەبێت. خۆ ئەگەر بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان ئەمین نەبوو لە ئەمانەتدا، ئەوا مانای وایە کە ئیمانەکەی نەگەیشتووەتە پلەی کەماڵ.

لە فەرموودەیەکی تریشدا کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) کەسایەتی مرۆڤی ئیماندار دەخاتە پێش چاو، بەم جۆرە پێناسەی دەکات: اَلْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ على دِمَائِهِمْ وَ أَمْوَالِهِمْ "ئیمانداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە بەرامبەر سەر و ماڵیاندا لێی ئەمین بن."[2]

پێم خۆشە لێرەدا، لەبەر پەیوەندی بە باسەکەوە، ئاماژە بەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَصَحبِهِوَسَلَّمْ) بکەین کە لە باسی صیدقدا بە کورتی هەڵوێستەمان لە ئاستیدا کرد:

١ أحمد بن حنبل، المسند ١٣٥/٣؛ طبراني، المجمع الكبير ١٩٥/٨؛ بيهقي، السنن الكبرى ٩٧/٤
٢ ترمذي، إيمان ١٢؛ نسائي، إيمان ٨.

”ئێوە شەش شتم لە خۆتاندا بۆ مسۆگەر بکەن، منیش چوونە بەهەشتتان بۆ مسۆگەر دەکەم:“[1]

١) ”کە قسەتان کرد، ڕاستگۆ بن!“ بەڵێ، با ڕەفتار و گوفتارتان ڕێك و ڕاست بێت.. هەروەك بڵێی لەم بابەتەدا تیرئاسا ڕێك و ڕەوان بن.

٢) ”کە بەڵێنتان دا، بیبەنە سەر!“ جا خۆ پێچەوانەی ئەمە دووڕوویيە و لە بڕگەکانی پێشوودا کەمێك لەسەری وەستاین.

٣) ”ئەمین و سپاردەپارێز بن!“ ئاگادار بن! ئەگەر لە شوێنێکدا لەبەر ئەوەی کە بە ئەمین و دەستپاك ناسرابوون، ئەمانەتێکیان پێسپاردن، ئەوا نەکەن گومانی باشی ئەو کەسانە بە درۆ بخەنەوە. تەنانەت هەوڵ بدەن لە قیامەتیشدا بە درۆی نەخەنەوە.

٤) ”داوێن پاك و بەعیففەت بن!“ شەرەف و نامووستان بپارێزن. شەرەف و نامووسی خەڵکیش هەروەك هی خۆتان بپارێزن. (دواتر لە باسی عیففەتدا بە درێژیی باس لەم لایەنە دەکەین.)

٥) ”چاوتان لە ئاست حەرامدا بپۆشن!“ بۆ ئەو شتانە مەڕوانن کە هی خۆتان نین. هەروەها چاو مەبڕنە ئەو شتانەش کە ڕێگە نەدراوە سوودیان لێوەربگرن.

ڕوانینی حەرام دڵی مرۆڤ دەکاتە کاولە و دایدەڕمێنێ. لە فەرموودەیەکی قودسیدا بەم شێوەیە هاتووە: إِنَّ النَّظْرَةَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ إِبْلِيسَ مَسْمُومٌ، مَنْ تَرَكَهَا مَخَافَتِي أَبْدَلْتُهُ إِيمَانًا يَجِدُ حَلَاوَتَهُ فِي قَلْبِهِ ”ڕوانینی حەرام تیرێکە لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان (لە کەوانی ئیرادەتانەوە دەردەچێت و دەچەقێ بە دڵتاندا. یاخود ئەم کەوانەی کە تایبەتە بە شەیتان، بە دەستی ئیرادەی خۆتانەوەیە.) هەرکێ لەبەر ئەو ڕێزەی کە بۆ من هەیەتی، واز لەو ڕوانینە بێنێ، ئیمانێکی وا دەخەمە دڵیەوە، کە پڕ بە دڵی هەست بەچێژەکەی بکات.“[2]

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٣/٥؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٦٢/٨؛ المجمع الأوسط ٧٧/٣؛ البيهقي، السنن الكبرى ٢٨٨/٦.
٢ الطبراني، المجمع الكبير ١٧٣/١٠؛ الحاكم، المستدرك ٣٤٩/٤.

٦) "دەستتان لە حەرام بە دوور بگرن!" بە هیچ جۆرێك خراپە بەرامبەر هیچ کەس مەنوێنن.

جا هاتنە دی ئەم خاڵانە، کە مەرجی بوونە مرۆڤی ئەمین و ئەمانبەخشن، وا لە مرۆڤ دەکات کە بە ئەمینی بژی و ئاخیرەتیشی مسۆگەر بکات. جا بۆیە هەر کەس لەسەر ئەم خاڵانە پەیمان بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمۡ) بدات، ئەویش پەیمانی بەهەشتی پێدەدات.

بەڵێ، بەردەوامبوونی ژیانێکی ئارام و پڕ دڵنیایی، پەیوەستە بە بەخاوەن بڕیار بوونی مرۆڤە ئەمینەکانەوە. خۆ ئەگەر جیهانی ئیسلامی بێدار ببێتەوە و سەرلەنوێ خۆی بکاتەوە بە خاوەنی ئەو ئەمانەتەی کە ڕاسپاردەی کراوە و نوێنەرایەتی ئەمنیەت و دڵنیایی بکات لەسەر زەویدا، ئەوا ئەو کات، دنیا بەو هاوسەنگییە شاد دەبێتەوە کە لەدەستی داوە. بە پێچەوانەشەوە، بارودۆخی جەرگبڕی دنیا چۆنە، هەروا دەبێ. عاکیفی شاعیر کاتێ وێنای ئەم تابلۆ تەماویە دەکات، دەڵێ:

پەردەی حەیا دڕاوە.. لابراوە، چ بێ ئابڕووییەکە دنیای تەنیوە!

ئای ئەو پەردە تەنکە چەندە ڕوخساری چەپەڵی لەودیو خۆی حەشارداوە!

وەفا نەماوە، حورمەتی عەهدیش کە مەپرسە، ئەمانەتیش لەفزی بێ مەدلوولە!

درۆ پڕڕەواج و خیانەت حوکم فەرما و هەرچی حەقە، ون و مەجهولە!

تەزوو بەگیاندا دێنێ.. یا ڕەب، چ گۆڕانێکی سامناك قەوماوە!

نە دین ماوە، نە ئیمان. دین بووەتە وێرانە و ئیمانیش پارچەیەك خاك و خۆڵە!

## ی) ئەی خونچەکانی ئومێد!

ئێوەن کە جارێکی تر بەیداخی حەقیقەتی دین لەسەر زەویدا دەشەکێننەوە. ئێوە، گۆپکەی ڕەگێکی ئەوتۆ و، چەپکی سەرچاوەیەکی ڕووناکی وەهان کە لە قۆناغێکی نووتەکەشەوی مێژوودا جیهانی نوقمی نوور کرد و بە وێنەی درەختی تویا، پەلوپۆی بە گشت لایەکی دنیادا پەرش کرد. جا بڕوانە شکۆی ئەم ئوممەتە، کە سەردەمانێك هەر وتەیەکی بە فەرمان وەردەگیرا و تەنانەت نیگاکانیشی بەهای بۆ دادەنرا! بە پشتیوانی خوای گەورە، ئەم ڕۆژە تاریکانە - کە بڕوام وایە زۆر زوو دەڕەوێنەوە - تەی دەکەن و سەر لەنوێ سەدە زێڕینەکان دەبوژێننەوە. نشینانی سەر زەوی و ژێر زەویش چاوەڕێی ئەمەن لێتان. چ جای حەزرەتی محمد المصطفی (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) کە بە ڕۆحیانەتی هەمیشە لەناوتاندایە و، جارجار هەستی پێ بکەن یان نا، بە نیگا ژیان بەخشەکانی و، خەندە پڕ سۆزەکانی بۆتان دەڕوانێ.

ئەگەر ئێوە کەسانێك بن لە ڕاستەڕێ لانەدەن و بەردەوام پەیامی ئەمنیەت و ئارامی بە دەوروبەرتاندا پەخش بکەن... بەڵێ، ئەگەر لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بن، ئەوا دەروازەی دڵی مرۆڤایەتیتان بۆ دەخرێتە سەر پشت و، هەروەك پێشینان، ئێوەش لە دەروونەکاندا تەختی خۆشەویستی دادەنێن.

بیرتان نەچێ! گرنگترین مەرجی گەیشتن بەو ئامانجە، ڕاستتر بڵێین، بەو لوتکەیە: ئەمین بوونە لە ئەمانەتدا. ئەگەر دەمانەوێت - دەشبێ بمانەوێت - ببینە پایەی هاوسەنگی لە هاوکێشە جیهانییەکاندا و ئەو دەمەی بڕیارە چارەنووسسازەکان دەدرێن بۆ چاومان بڕوانرێت، ئەوا پێویستە ببینە نوێنەری حەق و دادپەروەری و ڕاستڕەوی و ئارامی...

# تەبلیغ

سێیەم تایبەتمەندیی پێغەمبەران بریتییە لە تەبلیغ. هەروەك دەتوانین بە ڕوون کردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام یاخود "فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە"ش ناوی بەرین. دەرئەنجام هەر یەك شتە. چونکە لە هەردوو بارەکەدا تیشك دەخەینە سەر ئەم تایبەتمەندییە بەرزەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام).

تەبلیغ مەبەستی بوونی هەموو پێغەمبەرانە. چونکە ئەگەر تەبلیغ نەبوایە، ئەوا ناردنی پێغەمبەرانیش دەبووە کارێکی هەوانتە و بێ مانا. خوای باڵادەست (جَلَّ جَلَالُهُ) بەزەیی ومیهرەبانییە ڕەهاکەی خۆی، لە ناردنی پێغەمبەرانیدا بەرجەستە کردووە و لە ڕێی ژیانی ئەوانەوە ڕەحمانییەت و ڕەحیمییەتی خۆی دەرخستوە. ڕەنگدانەوەی ئەمەش لە کەسانی تردا، تەنها و تەنها لە ڕێی تەبلیغەوە دەبێت.

وەك چۆن خوای گەورە بە داگیرساندنی ئەو خۆرەی کە هەموو ڕۆژێك بزەمان بە ڕوودا دەنوێنێ، جیلوەیەك لە ڕەحمانییەتی خۆیمان پیشان دەدات... ئەو خۆرەی کە ئەرکی ئاگردانێك دەبینێت بۆ ئەو شتانەی پێویستیان بە گەرمی هەیە و، وەجاخێك بۆ ئەو شتانەی پێویستیان بە پێگەیشتنە و، فلچەیەکی نەخشێنەریشە ڕوخساری جوانییە ڕەنگاوڕەنگەکان دەڕازێنێتەوە. بە هەمان شێوەش، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام) بە وێنەی خۆر، ڕەحمانییەت و ڕەحیمییەتی کردگاری مەزنمان پێش چاو دەخەن. پێغەمبەران، لە سەروو هەمووشیانەوە حەزرەتی موحەممەد المصطفى (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە بەرجەستەکاری حەقیقەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (الأنبياء : ١٠٧) "تۆمان وەك ڕەحمەت ناردووە بۆ جیهانیان."ە، لەنێو مرۆڤەکاندا نمایندە و نموونەی ڕەحمانییەت و ڕەحیمییەتی پەروەردگاری میهرەبانە. واتە، ئەگەر ئەو نەهاتایە و گیانێکی نوێی بە بەر پەیامی پێغەمبەراندا نەکردایەتەوە، ئەوا ئەو کات ئێمەی ئادەمی هەرگیز بەهرەمەندی بەزەیی و ڕەحمەتی خوای گەورە نەدەبووین و لە بیابانی وەحشەتزاری نەزانی و کوفر و گومڕاییدا بۆ هەمیشە بێکەس و سەرگەردان و پەرێشان دەماینەوە.

کاتێك مرۆڤایەتی لە نێو نامۆیی و پەژموردەییدا دەتلایەوە، لە سایەی هەناسە

ژیان بەخشەکانی پێغەمبەری سەروەرمان، لە دوو توێشیدا، ڕۆحییەتی پەیامی گشت پێغەمبەرانی تر، گیانی بە بەردا کرایەوە. لە سایەی ئەمەشدا خۆی لە باخچەی بەهەشتێکدا بینییەوە، کە جوانی هەزار و یەك بەهاری تێدا دەدرەوشایەوە. خۆ ئەگەر وا نەبووایە، لەتاو نامۆیی و بێکەسی، ئەقڵی لە دەست دەدا و گیانی دەردەچوو.

بەڵێ، ئێمە چین؟ لە کوێوە هاتووین و بۆ کوێ دەچین؟ ئەم پرسیارە سەرسووڕهێنەرانە بەردەوام وەك چەکوش مێشکیان دەکوتینەوە و ئۆقرەیان لێ دەبڕین. بەڵێ، ئۆقرەیان لێ دەبڕین و ئێمەش نەماندەتوانی وەڵامێکی سارێژکەریان بۆ وەدەست بخەین و تەمەنێك دەستەوسانانە بەو ئازارانەوە دەتلاینەوە. جا با دیمەنی سامناکی ئێسك و پروسکی ناو گۆڕ لەولاوە بوەستێت... هەرکات بە خەیاڵیش ئەم دیمەنانەمان بهاتایاتە پێش چاو، دڵمان ڕادەچڵەکی و تاریکستانی ترس ناخمانی دەتەنی. لە هەموو ئەمانەش زیاتر، نەمان و ئەندێشەی "بوون بە هیچ" و، تالاَوی ئەوەی کە تێپەڕبوونی هەر خولەکێك هەنگاوێك زیاتر نزیکمان دەکاتەوە لە نەمان، ژیانی لێ دەکردین بە ژەهر.

پێغەمبەران هاتن و مەبەستی هەرەباڵای ژیان و حەقیقەتی مردنیان بۆ ڕوون کردینەوە. لە سایەی ئەواندا تێگەیشتین کە هەروەك هاتنمان بۆ دنیا پەیوەستە بە ئامانجێکەوە، بەهەمان شێوە، ڕۆیشتنیشمان لەسەر بنەمای حیکمەتێکی مەزنە. بەڵێ، تێگەیشتین کە مردن پێناسەیەك نییە بۆ لەناوچوون و هیچێتی، بەڵکو تەنها شوێن گۆڕینێکە و کۆتایی هێنانە بە ئەرك و کارمەندیی سەرشانمان. گۆڕیش دەروازەیەکی والاَیە بە ڕووی جیهانی ئاخیرەتدا و وێستگەیەکی چاوەڕوانییە. کاتێك ئەمانەمان لە پێغەمبەرانەوە بیست، نامۆییمان ڕەوییەوە و، گرژی و مۆنیی سەر ڕوخساری بوونەوەرانیش سڕایەوە و گۆڕا بە هاودەمی و هاوڕازی. هەموو ئەو ترس و گومانانەش کە بیروهۆشیان داگیر کردبووین، باریان کرد و جێیان بۆ شادی و دڵنیایی چۆڵ کرد...

بەم شێوەیە، پێغەمبەران ئەم پەیامە و چەندین پەیامی تری هاوشێوەی ئەمەیان پێ گەیاندووین. ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەش خۆی لە خۆیدا تەوەری بوونی ئەم کەسایەتییە کامڵانەیە. لە کاتێکدا ئێمە تەبلیغ وەك حەق و واجبێکی سەر شانمان دەبینین و لەو

گۆشەنیگایەوە بە جێی دەگەیەنین، کەچی پێغەمبەران (عَلَیْهِمُ السَّلام) وەك مەبەست و حیکمەتی هاتنە دنیایان لێی دەڕوانن و بەم هەستەوە ئەرکەکانیان ڕادەپەڕێنن. هەروەك بڵێن:

"هیچ مەبەستێکی تر لە پشت هاتنە دنیای ئێمەوە نییە. خوای گەورە ئێمەی ناردووە بۆ ئەم مرۆڤانە تاوەکو ڕاست و چەپ، پێش و پاش و سەر و ژێریان ڕووناك بکەینەوە و لە تاریکی ڕزگاریان بکەین. تا سەرەنجام ئەوانیش بتوانن لەم شاڕێگە نموونەییەدا بەبێ لادان ڕێ بکەن. بە جۆرێکی وا، شەیتان نەتوانێت لە هیچ لایەکەوە زەفەریان پێ ببات و، دزە بکاتە ناو ڕۆحیانەوە و، لەم ڕێگە دوور و درێژەدا ماندوو نەبن و پەکیان نەکەوێت."

بەڵێ، دووبارەی دەکەمەوە و دەڵێم: ئێمە وەك ئەرك و فەرمانبەرییەك تەبلیغ بەجێ دێنین، لە کاتێکدا پێغەمبەران وەك چەق و مەبەستی بەدیهاتنیان هەڵدەستن بەم فەرمانبەرییە پیرۆزە.

## أ) سێ بنەمای تەبلیغ

گومانی تێدا نییە کە بانگەواز و پەیامی پێغەمبەران (عَلَیْهِمُ السَّلام) لە بانگەواز و پەیامداریی کەسانی تر جیاوازە. خۆ ئەگەر بەتەنها لە ڕوانگەی هێنانی پەیامەوە بڕوانینە بابەتەکە، ئەوا هیچ کەسێ لە پێغەمبەران ناچێت. پێغەمبەران لە پەنا گەیاندنی پەیامەکانیاندا، واتا و ماهییەتی تەبلیغمان بۆ ڕوون دەکەنەوە و، ئەو شێواز و ڕێوشوێنانەشمان فێر دەکەن کە پێویستە بانگخواز بیگرێتە بەر. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕەهەندێکی تری بانگخوازیی پێغەمبەرانە. ئێستاش با لە ڕێی سێ بنەمای سەرەکییەوە بابەتەکە شی بکەینەوە:

## ١. گشتگیری

کاتێك پێغەمبەران هەڵدەستن بە گەیاندنی ئەو پەیامانەی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیان هاتووە و، ئەو تایبەتمەندییانەش کە پێغەمبەرێتی داخوازیانن؛ ئەوا بە گوێرەی ڕێوشوێن و شێوازی تایبەتی خۆی و، وەك کەسێکی شارەزا لەو بوارەدا، بەو ئەرکە هەڵدەستن. پێغەمبەران وەك یەکەیەکی هەمەکی (کُلي) و گشتگیر مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا دەکەن و پەیامەکانیشیان هەر لە چوارچێوەی ئەو گشتگیرییەدا پێشکەش دەکەن.

هەر بۆیە لە تەبلیغی پێغەمبەراندا هیچ کام لە عەقڵ، مەنتیق، دڵ، هەستەکان و لایەنە ناسکەکانی بە هیچ جۆرێك فەرامۆش ناکرێن و هیچ کامیان بێبەش نابێت لە شەبەنگی پرشنگداری وەحی... پێغەمبەران لە ئاست وەحیدا وەك مردوو وان لە ژێر دەستی مردووشۆردا. وەحی بەملا و ئەولادا هەڵیاندەگێڕێتەوە و ڕوویان وەردەگێڕێتە ئەو ئاڕاستەیەی کە دەیەوێت. بەم شێوەیەش دەیانگەیەنێتە لوتکەی ئیستیقامەت. بە جۆرێك، تەنانەت لەو بابەتانەشدا کە بە بچووك و لاوەکی دادەنرێن، ویستی پەروەردگار چۆن بێت، ئەوان ئاوا مامەڵە دەکەن. ئاخر پێغەمبەرایەتی ئەم جۆرە تەسلیمییەتەی دەخواست. هەر بۆیە پێغەمبەران بەوپەڕی هەستیارییەوە ڕەچاوی ئەم خاڵەیان کردووە.

جا بۆیە ئەوانەی بانگەوازیان ناچێتەوە سەر بانگەوازی پێغەمبەران و، تەبلیغیشیان هاوشێوەی ئەوان نییە، هەرگیز سەرکەوتوو نابن و ناگەنە ئامانج. بۆ نموونە، ئەگەر عەقڵ پشتگوێ بخرێت، ئەوا تەبلیغ ئەنجامی چاوەڕوانکراو نادات بە دەستەوە. فەرامۆش کردنی (حِس) و هەستەکانیش هەمان دەرەنجامی نەخوازراو بەرهەم دەهێنێت. چ جای ئەوانەی چوونەتە دەرەوەی سنوورەکانی وەحی! ئەو جۆرە کەسانە هەرگیز ناگەنە ئامانج. سا بڕواننە حاڵی ئەو سیستەم و ئەزموونە مرۆییانەی کە دەیانەوێت لە دەرەوەی وەحیدا هەنگاو بنێن. ئەوە خۆیان و ئەوەش ئەو مەودایەی کە بڕیویانە! کۆمۆنیزم دەرەنجامێکی تاڵی ئەم ئەزموونەیە! ئەوەتا سەردەمانێك بارستەیەکی فراوانی لە خەڵکانی هەڵخەڵەتاو و ڕاپێچکراوی نێو زەلکاوی ئارەزوویازی و نەداری، دابووە بەر خۆی و لە زۆرێك لە وڵاتە هەژارەکاندا بووبووە فریادڕەس و خەونی

خۆشگوزەرانی. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەندین جار پینەوپەڕۆیان کرد و گۆڕانکارییان تێدا کرد کەچی هەر نەیتوانی لە هەرەس و ڕووخان قوتار ببێت. ئەمە لە کاتێکدا کە دامەزرێنەرانی ئەم سیستەمە و هاوشێوەکانیشی، هەریەکەیان سەردەمانێك وەك پێغەمبەرێکی درۆزن خۆیان دەردەخست. ئێستاش ئوممەتە درۆزنەکانیان بەدەم گەستنی پەنجەی پەشیمانییەوە، عەرزی پەرێشانییان دەکەن و، دەڵێن:

ئەی هاوار! دۆڕاوی گەمەی ئەمجارەش هەر ئێمە بووین!

زیان ئەوەتا لەبەر چاودا، ئاخر نازانم چی سوودمەند بووین!

ضیاء پاشا[1]

ئەوانەشی کە پێداگری دەکەن لە جێبەجێ کردنی ئەو سیستەم و بەرنامانەی کە لە خەوپلاویی و خۆپەرستیی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتووە، لە کۆتاییدا دەگەن بە هەمان ئەنجام و، هەموویان هەمان قسە دووبارە دەکەنەوە. بەڵێ، زوو بێت یان درەنگ، بە دڵنیاییەوە ئەو ڕۆژە دێتە پێش کە ئەوانیش بەناچاری دان بنێن بە هەڵخەڵەتاوی و چەواشەبوونیاندا.

لە تەبلیغی پێغەمبەردا ئەقڵ و مەنتیق و هەستەکان، شانبەشان و ئاوێتەی یەکترن. ئەو وەك چۆن بیر لەوە ناکاتەوە کە سۆز و عاتیفەی خەڵکی بقۆزێتەوە و لەو ڕێیەوە ڕاپێچی شەقامەکانیان بکات، هەر بەو جۆرەش، نابێتە تیۆرسازێکی ڕووت و خەڵکی بکاتە چەند تاکێکی گۆشەگیر و بێبەش لە گیانی بزاوت و گڕوتین.

دیسانەوە، وەك چۆن پێغەمبەر مرۆڤەکان ناڕێژێتە نێو کۆڵانەکان و نایانکات بە گێرەشێوێن و تێکدەر، بە هەمان شێوەش نایانکات بە چەند لەپێ و گۆ کەوتوویەك کە تەنها گرنگی بە لایەنی هەست و عاتیفەکانیان بدەن. بەڵکو دێت ڕێچکەیەك بەرەو دڵەکان لێ دەدات و لەو ڕێیەوە پەیامەکانی بە وێنەی بارانی ڕەحمەت بەسەریاندا دەبارێنێت و، گیان و گڕوتینی کار و بزاوتیان دەکات بە بەردا و، بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرزییان دەکاتەوە و دەیانکات بە هاوشانی فریشتەکان. قورئانی پیرۆز

١ ضیاء پاشا (١٨٢٥ - ١٨٨٠) نووسەر و شاعیرێکی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییە.

تیشك دەخاتە سەر ئەم تایبەتمەندییە و، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي ﴾ (یوسف: ١٠٨) "بلێ: ئەمە ڕێبازی منە، من و شوێنکەوتووانیشم بە بەسیرەت و بەرچاو ڕوونی بانگەوازی مرۆڤایەتی دەکەین بەرەو لای خوای گەورە."

ئەم ڕێبازە، ڕێبازی نبووەتە. واتە ئەو ڕێباز و شاڕێگەیەیە کە هەریەك لە عەقڵ و مەنتیق و داوەری و هەست و دڵ و ویژدان، جێی خۆیان تێدا کردووەتەوە و هیچ کامێکیان پشتگوێ نەخراون. ڕێگەیەکە پێغەمبەر و شوێنکەوتوانی پێغەمبەر، لەسەر بەسیرەت و بەرچاو ڕوونییەکی تا لەم جۆرە بانگی مرۆڤایەتی دەکەن بۆ لای حەق و حەقیقەت.

## ٢. چاوەڕێ نەکردنی پاداشت

پێغەمبەران چاوەڕێی هیچ پاداشت و چاکەیەك ناکەن لە بەرامبەر بانگەوازەکەیاندا. چونکە ئەوان تەنها بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان بەم فەرمانبەرییە هەڵدەستن. جا بۆیە هەموو پێغەمبەران بە دووپاتکردنەوەی: إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللهِ "پاداشتی من تەنها و تەنها لە لای خوایە"[١] ئاماژەیان بۆ ئەم حەقیقەتە مەزنە کردووە.

## ٣. بەجێهێشتنی ئەنجام بۆ خوای گەورە

پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام) دەرئەنجامی تەبلیغ و قبووڵ کردنی بانگەوازەکەیان لە لایەن خەڵکییەوە، بۆ خوای گەورە بەجێ دەهێڵن و دەست وەرنادەنە ئەنجامی کارمەندییەکەیانەوە. چونکە باش دەزانن کە ئەرکی ئەوان تەنها بریتییە لە تەبلیغ، ئەنجامیش بەتەواوی پەیوەستە بە ویستی خوای گەورەوە.

---

١ بڕوانە: سورەتی هود، ئایەتی ٢٩؛ سورەتی الشعراء، ئایەتی ١٠٩،١٤٥،١٦٤،١٨٠؛ سورەتی سبأ، ئایەتی ٤٧.

پاش تیشك خستنه سەر ئەم سێ بنەمایەی تەبلیغ، ئێستا با هەڵوێستەیەك لەسەر چۆنێتی ئەو تەبلیغە بکەین کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی نبووەت و، سەرێك بدەین لەو بنەما و ڕێگا و شێوازانەی کە بەجێهێنەرانی ئەم ئەرکە لە هەموو کات و سەردەمێکدا پەیڕەویان کردووە و پێویستیشە پەیڕەویی بکەن. هەموو هیواشمان ئەوەیە کە خوای گەورە بەو جۆرەی کە خۆی ڕەزامەندی لەسەرە، ئەرکی تەبلیغ بە ئێمەش ڕاپەڕێنێت. چونکە تەنها ئەو دەتوانێت سەرکەوتنمان پێ ببەخشێت و شەوقی تەبلیغ لە ناخماندا تاو بدات، پشت هەر بەو دەبەستین و داوای کۆمەکیش هەر لەو دەکەین.

## ب. شێوازی تەبلیغ

وەك پێشتر وتمان، پێغەمبەران تەنها بیریان لای بانگەوازەکەیانە. بەڵێ، پێغەمبەرانی وا هاتوون کە تەواوی ژیانیان بە هەوڵ و کۆشش لە پێناوی بانگکردنی خەڵکیدا بەسەر بردووە و بۆ ساتێکیش سستییان لە ئەرکی خۆیاندا نەنواندووە، کەچی سەرباری ئەوەش، کەس ئیمانی پێنەهێناون.[1] کەچی ئەمە بچووکترین شوێنکاری لەسەر دڵنیایی ئەوان جێنەهێشتووە. چونکە ئەوان ئەرکی سەرشانیان بە تەواوی بەجێهێنابوو. لە هیچ ساتێکی ژیانیاندا ئەو "بۆچی"یانەت بەرچاو ناکەوێت کە بۆنی ناڕەزاییان لێدێ: بۆچی نەمتوانی خزمەتی دینی خوا بکەم؟ بۆچی کەس باوەڕم پێناکات؟ بۆچی ئەم کارە شکستی هێنا؟ بۆچی ئەم نشوستییانە یەك بە دوای یەکدا دێن؟

بەڵێ، هەر پێغەمبەرێك بیر و هۆشی تەنها لای چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەرکەکەیەتی. بۆ ئەمەش تەواوی هۆکارەکان دەقۆزێتەوە و لەم سۆنگەیەوە فەرمانبەرییەکەی ئەنجام دەدات. ئیتر بڕوا پێهێنان لە ئەستۆی ئەودا نییە و لە دەرەوەی بازنەی فەرمانبەرییەکەیدایە. دەزانێت کە حوکم لەو مەیدانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ویستی پەروەردگار. لە ئایەتێکدا کە ڕووی دەمی لە پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾ (القصص : ٥٦) "بە ڕاستی (ئەی پێغەمبەر) تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو

---

١ بخاري، رقاق ٥٠؛ مسلم، إيمان ٣٧٤-٣٧٥.

خوا هەرکەسێکی بوێت، دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێ دەبەخشێت."

بەم پێیە، پەیامی پێغەمبەر خاوەنی تایبەتمەندییەکی بێ وێنەیە. گەر هیچ کەسێکیش نەبێت سینەی بۆ واڵا بکات و هێندەی نرخ و بەهای خۆی گرنگی پێ بدات، ئەو هێشتاش بێ ئەوەی بچووکترین ساردبوونەوەی بەسەردابێت، بێ هیچ شڵەژان و دوودڵییەك و دوور لە تۆمەتبارکردنی کەسانی دی، بەردەوام دەبێت لە ئەنجامدانی ئەرکەکەی. هەر لەبەر ئەوەشە کە تەواوی پێغەمبەران سەرباری ئەو هەموو سووکایەتی و قەدرنەزانییەی ڕووبەڕووی دەبوونەوە، هێندەی گەردیلەیەك سستی و کەمتەرخەمییان بەرامبەر ئەرکەکەیان نەدەنواند.

جا ئەم شێوازە لە بانگەواز، حاڵەتێکە تەنها لای پێغەمبەران دەبینرێت. خەریکە بڵێین بینینی شێوازێکی ئاوەها لە بانگەواز، بە تەواوی تایبەتمەندییەکانیەوە، لە دەرەوەی بازنەی پێغەمبەران کارێکی مەحاڵە. لە وەها بارێکدا، لای کەسانی دی زۆربەی جار دڵشکاوی و زویری دەبینین. ئەوانی دی، هەرچەندێکیش تێگەیشتوو بن، کەچی هێشتا لە ئارەزووی گەیشتن بە ئەنجام ڕزگاریان نابێت. وەختێکیش مەبەستی چاوەڕوانکراو بەدەست ناهێنن، بێزاری و تووڕەیی نیشان دەدەن. ئەوە تەنها پێغەمبەرانن کە بێزاری و بێتاقەتی نازانن.. ئەمەش حاڵەتێکە تەنها تایبەتە بەوان.

تەماشاکەن! تەنانەت هەموو ئەو ڕووداوە جەرگبڕانەی لە ئوحود بەسەریدا هات، هێشتا توشی دڵشکاوی و بێزارییان نەکرد. ئەوەبوو ددانی موبارەکی شکا و، ئەڵقەی خوودە ئاسنینەکەی سەریشی چەقییە دەموچاوی موبارەکی. بە ڕادەیەك، ئەبو عوبەیدە بۆ دەرهێنانی ئەڵقەکان لە دەموچاوی پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، چەند دانێکی لەدەست دا.[1] سەرباری هەموو ئەمانە، سەروەری هەردوو جیهان کە سەرتاپای جەستەی خەڵتانی خوێن بوو، تەنها ئەمەندەی فەرموو: اَللّٰهُمَّ اهْدِ قَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ "خودایە ڕێنوێنی گەلەکەم بکە، چونکە ئەوان نازانن."[2] (نازانن، ڕەنگە

١ طيالسي، مسند ٣؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٩/٤.
٢ قاضي عياض، الشفاء ١٠٥/١؛ بۆ فەرموودەی هاوشێوە ئەمە بڕوانە: بخاري، أنبياء ٥٤؛ مسلم، جهاد ٢٩/٤.

گەر بیانزانیایە من پێغەمبەرم، ئاوایان نەکردایە.) جا هەرواش بوو، دواتر کە ناسییان، ئەوانیش گیانیان کردە گەردی بەر پێی ئەو دۆستە نازدارە. کەوابێ ئەو کات نەیاندەناسی. ئەم ڕووداوە و هاوشێوەکانی، ڕادەی سینەفراوانیی پێغەمبەری خوامان پیشان دەدەن. ئەو و ئەوانی دیش وەك بڵێی: "بێ دەست بوون لە بەرامبەر دەست درێژکەردا، بێ گیان و زمان بوون لە بەرامبەر جوێن دەردا." ئەگەر سەریشیان بریندار بکرایە و ددانیشیان بشکێنرایە، هێشتا "ئۆف"ێکی نارەزاییان بەسەر زاردا نەدەهات.

بشسوتێم گەر وەکو وەجاخ، قەت نایکەم بۆ غەیر ئیزهار

مەمسوتێنە بە ئاگرت ئیتر، ئەی چەرخی جەفاکار

بەڵێ، وەك بڵێی سەرجەمی پێغەمبەران دروشمی: "بەس بە ئاگری ئەغیار مەمسوتێنە، چیم لێ دەکەی بیکە، ناڵەی هیچ غەمێکم لێ نابیستی" دەڵێنەوە و، بەردەوام دەبن لە ڕێکردن.

ئەوەتا حەزرەتی نوح بە دەربڕینە قورئانیەکە، ڕوو لە قەومەکەی دەکات و، دەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (الأعراف : ٦١) "(نوح) وتی: ئەی قەوم و هۆزەکەم، من هیچ گومڕاییەکم نیە، بەڵکو من پێغەمبەرێکم و لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ڕەوانە کراوم."

بێگومان ئەوەی وای کردووە لە حەزرەتی نوح کە بەم شێوەیە بدوێ، تۆمەتبارکردنیەتی بە گومڕایی لەلایەن قەومەکەیەوە. ئەوان بەرامبەر بەو پێغەمبەرە مەزنە، بێڕێزانە ڕەفتاریان دەکرد و، دەیانوت: ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ (الاعراف : ٦٠) "بەڕاستی ئێمە تۆ لەنێو گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین."

لەمڕۆشدا شتێکی ئەوتۆ نەگۆڕاوە. تۆمەتەکانی ئەمڕۆش هەر هەمان تۆمەتەکانی پێشوون.. "تۆ سەرلێ شێواویت، تۆ کۆنەپەرستیت، تۆ لەسەردەمە تاریکەکاندا دەژیت." وە چەندان و چەندانی تریش!.

لە ئایەتەکەی دواتردا حەزرەتی نوح بەم جۆرە لەگەڵ گەلەکەیدا دەدوێت:

﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ (الاعراف:٦٢)

"پەیامەکانی پەروەردگارتان پێ ڕادەگەیەنم و ئامۆژگاریتان دەکەم. هەروەها شتانێك دەزانم کە خوای گەورە لە ڕێی وەحییەوە فێری کردووم و ئێوە نایزانن."

نەك سەرلێشێواو نیم، بگرە دەمەوێت ئێوە لە سەرلێشێواوی و گومڕایی ڕزگار بکەم. چونکە من لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە وەك ڕەحمەت و پەیامبەر بۆ لای ئێوە ڕەوانە کراوم. پەیامی پەروەردگارتان بۆ دەهێنم و ڕێتان بۆ ڕۆشن دەکەمەوە. چونکە من شتانێك دەزانم کە ئێوە نایزانن...

تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیە جیهانبینیی کافری هیچ نەگۆڕیوە. ئەمجارە حەزرەتی هوود بەرامبەر گەلی لەدین تەکاوەی وەها دێتەگۆ: ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ (الاعراف : ٦٧-٦٨) "(هود) وتی: قەومینە! من هیچ گێلی و نەفامییەکم تووش نەبووە، بەڵکو نێرراوێکم لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە؛ ئەو ڕاستییانەتان پێ ڕادەگەیەنم کە پەروەردگارم ناردوونی، وە من ئامۆژگارێکی ئەمینم بۆتان."

شتێکی گۆڕاومان نییە: پێغەمبەران و گەلەکانیان.. ئەو تۆمەتانەی گەلەکانیان دەیانویست بۆیان هەڵبەستن، ئەو شێوازەش کە پێغەمبەران وەڵامیان دەدانەوە.. بەڵێ، جیاوازی لە یەك دوو ووشەدا هەبێت یان نا، دەنا ناوەڕۆکی قسەو ڕستەکان هەمان واتا دەگەیەنن.

پاش باسکردنی پێغەمبەرانی تر لە نێو ئەم یاسا گشتییەدا، با بێینەوە بۆ لای سوڵتانی ئەنبیا خوای گەورە ڕوو لەو سەروەرە دەکات و، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝ قُمْ فَأَنذِرْ ۝ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾ (المدثر : ١-٣)

"ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە! هەستە و خەڵکی بێدار بکەوە و گەورەیی بێ هاوتا و ناکۆتای پەروەردگارت ڕابگەیەنە."

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۞ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ۞ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ۞
أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾ (المزمل : ١-٤)

"ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە! شەو هەستە؛ نوێژ بکە، کەمێکی نەبێت. نیوەی، یان کەمتر لە نیوەی لێ کەم بکەرەوە. یاخود زیاتری بکە و دەوری قورئان بکەوە بەوردی و لەسەرخۆ."

واتە، چیتر زەمەنی خۆداپۆشین و لە جێدا نوستن نەماوە. هەستە و بە هانای تاریکیزەدەکانەوە برۆ. هەستە و مرۆڤایەتی رێ ونکردوو و سەر لێشێواو، لە چارەنووسی رێی چەوت و، سەرئەنجامی داچڵەکێنەری گومڕایی ئاگادار بکەرەوە. بە شێوەیەکیش کە ئاسمان و زەوی بهێنێتە لەرزە، بانگی گەورەیی پەروەردگارت بدە بە گوێی بوونەوەراندا. هەستە، تا ئاسمان و رێسمان لە تاو چریکەی ئاوازت بێنە جۆش. هەستە تا پەری و مرۆڤەکان بەم هاوارەت جارێکی تر گەورەیی پەروەردگارتیان بۆ دەربکەوێت.

ئەی ئەو دۆستەی لە شەودا خۆی پێچاوە! بارێکی قورسی وەك پێغەمبەرایەتی چاوەڕێتە، هەستەو بەندایەتیت بنوێنە! بەڕاستی تۆ پێویستیت بەوە هەیە کە لە لایەن خوای گەورەوە بارگاوی بکرێیت. چونکە کارگەلێکی زۆر گەورە چاوەڕوانتن. پێویستە هەموو ئەو شتانە بە خەلکی بگەیەنیت کە پێت دەگات. پرۆسەی بارگاویکردنێکی لەم جۆرەش، بەبێ پاڵپشتی و کۆمەکی خوایی، مەحاڵە بێتە دی. تەنها شتێکیش کە بتوانێت ئەمەت بۆ دەستەبەر بکات: بەندایەتییەکی قووڵ و پەرستشێکی بەردەوامە.

بەڵێ، تەواوی پێغەمبەران - بە وێنەی سەرورمان - ڕایانگەیاندووە کە تەنها بۆ بەجێ گەیاندنی ئەرکی تەبلیغ هاتوون. لە دەمی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەشیاندا بەبێ هیچ چاوەڕوانی و وابەستەبوونێك بە هیچ شتێکەوە، بێ ئەوەی دڵی خۆیان بە غەیری خوا بسپێرن، بێ ئەوەی چاویان بترازێت بۆ ڕوانینە شتێکی دی، وە بە بێ ئەوەی هیچ کات بیناییان لیڵ ببێت، بەردەوام خەریکی گەیاندنی پەیامی ئیلاهی بوون بە خەلکی. ئەگەر ئەو پەیامە نووربەخشەی ئەوان نەبووایە، هەموو مرۆڤایەتی لە تاریکیدا دەمایەوە و جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئاژەڵدا نەدەبوو.

قەدەری مرۆڤایەتی و ناردنی پێغەمبەران بەجۆرێك ئاوێزانی یەكدیین، كە ئەگەر شوێنێك پێغەمبەری بۆ ڕەوانە نەكرابێت، خەڵكانی ئەو شوێنە لەوانەیە لەسەر هەندێ لە كردەوەكانیان لێپێچینەوەیان لەگەڵدا نەكرێت. بەڵام ئەگەر پێغەمبەریان بۆ نێررابێت و بە گوێیان نەكردبێت، ئەوا هیچ گومانێك لە لێپرسینەوەیاندا نییە. ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الاسراء : ١٥) "هەتاوەكو پێغەمبەرێك (وەك ئاگاداركەرەوە) نەنێرین، (هیچ كەس و كۆمەڵێك بەهۆی گوناهەكانیانەوە) سزا نادەین."

لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت:

﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ (القصص : ٥٩)

"پەروەردگاری تۆ هیچ وڵات و شارێكی كاول نەكردووە تا لە پایتەختەكەیدا پێغەمبەرێكی نەناردبێت كە ئایەتەكانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە. وە نەبێ ئێمە شار و وڵاتانمان كاول كردبێت (بەبێ هۆ)، مەگەر كاتێك نەبێت كە دانیشتووانی ستەمكار بووبن."

كەواتە خوای گەورە لەپێشدا پێغەمبەر ڕەوانە دەكات. جا ئەگەر پێغەمبەران هەڵسان بە ئەنجامدانی كاری تەبلیغ، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا خەڵكەكە هەر سوور بوون لەسەر ئینكاری، ئیدی ئەو كاتە شایستەی سزای خوایی دەبن. لە هەموو سەردەمێكیشدا ئەمە هەروا بووە. خۆ ئەگەر لەمڕۆشدا خوای باڵادەست كەسانێك بە سزا بگەیەنێت، ئەوا ئەمە تەنها پەیوەستە بەوەی كە باوەڕداران ئەركی سەرشانیان - كە تەبلیغە - بە تەواویی وەك پێویست ئەنجام داوە یان نا. ئەو كەسانەش كە پاش بانگەوازیش هێشتا هەر بەردەوامن لە یاخی بوونیان، ئەوانە كەسانێكن شایستەی ئەوەن سزا بدرێن.

هەر لەبەر ئەمەیە كە تەواوی پێغەمبەران، دوور لە كۆڵدان و بەبێ نیشاندانی هیچ جۆرە وەڕسی و خەمساردییەك و بە بەكارهێنانی سەرجەم شێوازەكانی تەبلیغ، بانگەوازی خەڵكییان كردووە. ئەوەتا قورئان لەسەر زاری حەزرەتی نوحەوە دەفەرموێت:

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ۝ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِيَ إِلَّا فِرَارًا ۝ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ٱسْتِكْبَارًا ۝ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ۝ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ۝ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴾

(نوح : ٥-١٠)

"(له کۆتاییدا لەپاش چەندین سەدە لە بانگەواز، حەزرەتی نوح بەم شێوەیە موناجاتی لەگەڵ پەروەردگاریدا کرد:) پەروەردگارا! من بە شەووڕۆژ بانگی قەومەکەم کرد (بۆ یەکتاناسی و پارێزکاری). کەچی بانگەوازەکەم هیچی لێ زیاد نەکردن، هەڵهاتن و دوورکەوتنەوەیان نەبێ. بەڕاستی هەموو جارێك کە بانگم دەکردن تا لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تا نەبیستن و جلەکانیان دەدا بەسەر خۆیاندا تا نەمبینن، زۆر سوور بوون لەسەر بێ باوەڕی و خۆیان بەزل دەزانی، چۆن خۆبەزل زانینێك! پاشان بە ئاشکرا بانگم کردن. ئینجا بە ڕوونی و بێ پەردە هەموو شتێکم بۆ باس کردن، هەندێ جاریش بە نهێنی قسەم بۆ دەکردن. بەردەوام پێم دەوتن: داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی لێخۆشبووە."

وەك ئەوەی حەزرەتی نوح بڵێت: "پەروەردگارا، شەووڕۆژ بەبێ وەستان گەلەکەمم بانگ کرد. بە بەردەوامی لە دەرکی دڵ وماڵیانم دەدا. کەچی بانگەوازەکەم تەنها هەڵهاتن و دوورکەوتنەوەیانی زیاد کرد. یاخی بوون و گوێیان لێ نەگرتم. بەس بۆ ئەوەی قسەکانم نەبیستن، وەك بڵێی شێوازی تازە تازەیان دادەهێنا. جاری وا دەبوو گوێی خۆیان دەئاخنی و خۆیان لە گێلی دەدا. جاری واش دەبوو پۆشاکەکانیان دەدا بەسەر خۆیاندا و بەلامدا دەڕۆیشتن هەروەك ئەوەی نەمبینن."

## ١. بانگەواز بەشێک بوو لە سروشتی

بانگەواز لای سەروەری جیهانیان (صَلَّىٱللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمْ) وەك خوویەك، وەك پارچەیەك وابوو لە بوونی. کاتێك گیانێکی خاوێنی بەرچاو دەکەوت و دەرفەتی گەیاندنی بانگەوازەکەیی بۆ نەدەڕەخسا، تووشی سەختییەکی گیانسێنی وەك ئەو سەختییانە دەبوو کە ئێمە لە کاتی دەست نەکەوتنی پارچە نانێکدا، یان لە کاتی دەست نەکەوتنی دڵۆپێك ئاوی خواردنەوەدا، یان تەنانەت لە کاتی نەبوونی هەوای پاکدا بۆ هەناسەدان، توشمان دەبێت. ئەو هەر دەتوت بێ باکە لە خواردن و خواردنەوە؛ جاری وا هەبوو چەندین ڕۆژ بەسەر یەکەوە بەڕۆژوو دەبوو.[1] جاری واش دەبوو هەر ئەوەندەی کە نەمرێت خواردنی دەخوارد. وەك بڵێی، خەمی بانگەواز ئارەزووی خواردنی تێدا نەهێشتبوو. چۆن فریشتەکان بە زیکری خوا دەژیان، ئاواش حەزرەتی موحەممەد (عَلَيۡهِ الصَّلَاةُوَالسَّلَام) بە تەبلیغ دەژیا. جا هەر ڕۆژێك سینەیەکی خاوێنی بۆ پەیامەکەی بدۆزیایەتەوە، ئەوا ئەو ڕۆژە زیندە و گەشاوە دەبوو. قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە باسی ئەم حاڵەتەمان بۆ دەکات: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾ (الشعراء : ٣) ”ئەی پێغەمبەرەکەم! هەر لەبەر ئەوەی ئیمان ناهێنن، خەریکە دەستت دەچێتە خۆت.“

دووبارە لە ئایەتێکی تردا بەم جۆرە لەگەڵی دەدوێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ (الكهف : ٦) ”(ئەی پێغەمبەر!) لەتاو خەم و پەژارەی ئەوەدا کە باوەڕ بەم قورئانە ناهێنن، خەریکە خۆت دەفەوتێنیت.“

بەڵێ، ئەو لە هەر جێیەك ناوچاوێکی بێ سوجدەی ڕەشهەڵگەڕاوی بدیایە، هەوری خەم بەری ئاسمانی دەروونی دەگرت و دڵی دەگوشرا. بینینی هەر مرۆڤێکی دوور لە ئیمانیش، زریانی پەژارەی لە ناخیدا هەڵدەگیرساند. جا خۆ ئەمە لە ڕۆحیدا هەر هەبوو. پێغەمبەرایەتیش هات و قوڵییەکی تری پێبەخشی و ڕەهەندێکی دی خستە سەر.

ئەمەش نموونەی یەکێك لە قوتابییەکانی و دەردەداری سەردەمەکەی! ئەوەتا

---

١ بخاري، صوم ٢٠؛ مسلم، صيام ٥٥-٦١.

لەگەڵ ئەوپەڕی هەستیاری و بەتەنگەوەبوون لە بەجێ هێنانی فەرمانەکانی شەرعدا، کەچی کاتێك لێی دەپرسن: "بۆ هاوسەرگیریت ئەنجام نەداوە؟" لە وەڵامدا دەڵێت: "لەتاو بیرکردنەوە لەو هەموو دەرد و مەینەتییەی بەسەر ئوممەتی موحەممەددا هاتووە، هەرگیز کات و دەرفەتی ئەوەم نەبووە بیر لە هاوسەرگیریی بکەمەوە." بەڵێ وایە، ئەمەیە حاڵی پێغەمبەر و میراتگرانی پێغەمبەر! وا دەزانم دنیاش ئەمڕۆ چاوەڕوانی ئەم چەشنە دەردەدارانە دەکات.

جا مادام باسەکە گەیشتبێتە ئێرە، پێم خۆشە نموونەیەکتان بۆ باس بکەم کە لە زۆر جێی تریشدا باسم کردووە. چونکە ئەم نموونەیە، لە هەمان کاتدا ڕەهەندێکی تریش بۆ باسەکەمان زیاد دەکات. لە ئەڵمانیا برایەکی ئیماندارمان بۆ ماوەیەك بە کرێ لەگەڵ ماڵێکدا دەمێنێتەوە. بەو ڕۆحە موحەممەدییەی کە لە گەوهەریدایە، کاریگەری لە ئەندامانی ئەو خێزانە دەکات کە لەگەڵیان دەژی. خوای گەورەش ئەم دەکاتە هۆکاری هیدایەتیان و موسوڵمان دەبن. لە پێشدا پیاوی ماڵەکە، پاشان خانمەکەی و بە دواشیاندا منداڵەکانیان ئیمان دەهێنن. بەم شێوەیە، ماڵەکە گیانی ژیانەوەی بە بەردا دەکرێت و ڕەنگی گۆشەیەك لە گۆشەکانی بەهەشت دەگرێت.

ڕۆژێکیان خاوەن ماڵ لەگەڵ ئەم برایەمان دەکەوێتە گفتوگۆوە. کتوپڕ خاوەن ماڵ، کە نووری هیدایەت هەر دەمەو دەلاقەی کۆمەڵێ هەستی نوێی بەڕووی مەیدانی ڕۆحیدا دەکردەوە، بەم برایەمان دەڵێت: "برام، تۆم زۆر خۆشدەوێت. بە جۆرێك کە حەز دەکەم دڵم دووتوێ بکەم و لەناویدا بۆ هەمیشە هەڵتگرم. چونکە تۆ بوویتە هۆکاری هیدایەتدانم و ژیانێکی هەمیشەییت دەست خۆم و خێزانەکەم خست. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوەندە لێت تووڕەم، حەز دەکەم ئێستا یەخەت بگرم و تا هێزم تێدایە ڕاتبوەشێنم، ئەزانم ئێستا دەپرسی: "بۆچی؟ ئاخر لەبەر چی؟" با بۆت باسکەم: ماوەیەکی کەم بەر لە هاتنی تۆ، باوکم وەفاتی کرد. لە کاتێکدا ئەو زۆر لە ئێمە شایستەتر بوو بە موسوڵمانێتی. خاوەن ڕۆحێکی خاوێن و ژیانێکی بێ خەوش بوو. خۆ ئەگەر پێش وەفاتی ئەو بهاتیتایە، دەبوویتە مایەی هیدایەتی ئەویش و، باوکیشم تاجی موسوڵمانێتی لەسەردەنا. ئیدی لەبەر ئەم درەنگ هاتنەتە کە دەڵێم زۆر لێت تووڕەم."

ئەم سەرکۆنەکردنە، وەك نالەی هەموو ئەورووپا، بگرە هەموو دنیا دێتە گوێم. من وەك خۆم زۆر دەترسم لەوەی کە لەودنیا یەخەم بگیرێت و لەسەر ئەوە لێپرسینەوەم لەگەڵ بکرێت. چونکە لەو باوەڕەدام کە وەك پێویست پەیام و بانگەوازی ئیسلامم پێ نەگەیاندوون...

## ٢. سوور بوون لەسەر تەبلیغ

پێغەمبەری خوا (صَلَّیَاللهُعَلَیْهِوَسَلَّمْ) زۆر بە تەنگ بانگەوازی خەڵکییەوە بوو. نەیدەویست تەنها کەسێکیش بمێنێ لەسەر زەویدا کە حەق و حەقیقەتی پێ نەگەیشتبێ. هەر بۆیە وەختێ کەسێك دەهاتە لای، بێ هیچ وەستانێك و بەوپەڕی جددییەت و تالوکەوە، دەریای بوونی وەشەپۆلان دەکەوت و بەشێوازێکی ناوازە و گونجاو هەوڵی دەدا پەیامەکەی پێ بگەیەنێت. جا با تەماشای حاڵی بکەین وەختێ لە دوا ساتەکانی ژیانی مامیدا لە پەنا سەریدا وەستابوو!

## بانگەوازی ئەبوتالیب

ئەبوتالیب ئەو کەسە بوو کە زیاد لە چل ساڵ پێغەمبەری خوای لەخۆگرت و پارێزگاری لێکرد. کاتێکیش سەروەرمان پێغەمبەرایەتییەکەی ڕاگەیاند، موشریکانی مەککە بۆ یەکەم جار وەك قەڵایەکی سەرکەشی نەبەزیو، ئەبوتالیبیان لە بەرامبەر خۆیاندا بینییەوە. هەتا ئەو قەڵایەش بە پێوە بووایە، بەهیچ جۆرێك دەستیان نەدەگەیشتە ئەو نازدارە.

بەڵام وا ئێستا ئەو ئەبوتالیبەی لەبەر خاتری پێغەمبەری خوا (صَلَّیَاللهُعَلَیْهِوَسَلَّمْ) سنگی بەڕووی هەموو ناخۆشی و تەنگانەیەکدا دەرپەڕاند و، لەپاڵ پیری و نەدارییەکەشیدا، بەرگەی سێ ساڵی ئابڵوقەی گرت و پشتی لە پێغەمبەری خوا نەکرد، لەسەر دۆشەکی مەرگە و کۆتا هەناسەکانی دەدات. پێغەمبەری خواش هەر بۆی بڕەخسایە، دەهاتە لای و داوای لێدەکرد کە بڵێت "لَا اِلَهَ اِلَّا الله" و، پێی دەوت: ''تەنها ئەم وشەیە بڵێ، تا لە قیامەتدا شەفاعەتت بۆ بکەم.'' بەڵام ئەو ڕۆحە ڕەشانەی کە لەو کاتەدا

چواردەوری ئەبوتالیبیان تەنیبوو، ڕێگر دەبن لەوەی بە هیدایەت بەهرەمەند ببێت. بۆیە کاتێك دواهەناسەی دەدا، دەڵێت: ''لەسەر دینی عەبدولموتەلیب'' و - خوا باشتر دەزانێت - کەشتیەکەی لە کیس دەچێت. لە بەرامبەر ئەم دیمەنە خەمناکەدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەری هەنسکەکانی پێ ناگیرێ و دەداتە پڕمەی گریان و، دەڵێت: ''مەگەر ڕێگریم لێ بکرێت، وەگەرنا، داوای لێ خۆشبوونت بۆ دەکەم.'' بەڵام دواتر خوای گەورە لە ڕێی ئایەتێکەوە پێغەمبەرەکەی قەدەغە دەکات لەو خەم و پەژارەیەی کە لە ناخیدا دەکوڵا.[1] ئایەتەکە دەفەرموێت:

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴾

(التوبة : ١١٣)

''بۆ پێغەمبەر و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ڕەوا نییە داوای لێخۆشبوون بۆ موشریکەکان بکەن، هەرچەندە ئەوانە (ئەو موشریکانە) خزمی نزیکیش بن، دوای ئەوەی کە بۆیان ڕوون بووەتەوە کە بە ڕاستی ئەوانە ئەهلی دۆزەخن.''

باشترین کەسێك کە دەرکی بە ڕادەی ویست و ئاواتەخوازیی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کردبێت لە بابەتی هیدایەت وەرگرتنی ئەبوتاڵیبدا، حەزرەتی ئەبوبەکرە. ئەوەبوو لەپاش فەتحی مەککە، ئەبو قوحافەی باوکی بەساڵاچووی دەهێنێتە خزمەت سەرداری هەردوو جیهان تاوەکو ئەویش دەستی لەنێو ئەو دەستە موبارەکە بنێ و، لە حزووری پێغەمبەری خوادا موسوڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت. وەختێ ئەم پیاوە پیرە نابینایە ئیمان هێنانی ڕادەگەیەنێت، ئەبوبەکر دەخزێتە گۆشەیەکەوە و قوڵپ قوڵپ دەگری. کاتێکیش پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هۆی گریانەکەی دەپرسێت، هاوەڵی نەشکەوت بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: ''یا رسول الله، زۆر بە ئاواتەوە بووم باوکم بە هیدایەت بگات، وا ئێستا خوای گەورە ئەو ڕۆژەی بە نسیب ئەو و منیش کرد. بەڵام

١ بخاري، جنائز ٨١؛ مسلم، إيمان ٣٩-٤٠.

من هیدایەتی ئەبوتاڵیبم زۆر لە هیدایەتی باوکم پێ خۆشتر بوو، چونکە تۆ زۆر ئاواتەخوازی ئەوە بوویت. کەچی هیدایەت بە نسیبی ئەو نەبوو. ئەمەم بیر کەوتەوە، بۆیە کەوتمە گریان."[1]

## بانگەوازی وەحشی

وەک چۆن پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) پەرۆشی هیدایەتی ئەبوتالیبی مامی بوو و تابڵێی بەتەنگ ئەم بابەتەوە بوو، هەر بەو جۆرەش بەرامبەر هیدایەتدانی وەحشی، ئەو وەحشییەی کە بکوژی مامی پێغەمبەر و شێری خوا بوو، هەمان پەرۆشیی دەنواند و جار لەدوای جار سووربوونی خۆی دووپات دەکردەوە. ئەمەش دیوی ناوەوەی ئەو ڕووداوەیە کە مێژوو تۆماری کردووە:[2]

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەحشی بکوژی مامی بۆ سەر ڕێگەی ڕاست داوەت دەکات. بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەك دەنووسێت و بە یەکێکدا بۆی دەنێرێت. پێغەمبەری پێشەوا لە نامەکەدا بانگهێشتی وەحشی دەکات تا بێت و ئیمان بهێنێت. وەحشیش وەڵامەنامەیەك دەنووسێ و، بەو کەسەدا کە نامەکەی بۆ هێناوە، دەینێرێتەوە. لەنامەکەدا ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە نووسراوە:

﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ۝ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴾ (الفرقان : ٦٨-٦٩)

"ئەوانەی هیچ جۆرە پەرستراوێك لەگەڵ خوادا ناپەرستن، دەستیشیان ناچێتە ئەو گیانەی کە خوا حەرامی کردووە، مەگەر بە حەق و ڕەوا نەبێ. هەروەها توخنی زیناش ناکەون. جا هەرکەس ئەو کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوا تووشی سزا و

١ طبراني، المجمع الکبیر ٩/٤٠؛ إبن حجر، الإصابة ٧/٢٣٧-٢٤٠.
٢ طبراني، المجمع الکبیر ١١/١٩٧.

ئازار و ڕسوایی دەبێ. لە قیامەتیشدا ئازار و سزای بۆ چەند بەرامبەر دەکرێ و، دەبێت بە زەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە بۆ هەتاهەتایە ژیانی تێدا بەرێتە سەر.“

وەحشی لە ژێر ئایەتەکەدا نووسینی ئەم چەند دێڕەشی فەرامۆش نەکردبوو: ”تۆ بۆ ئەوە بانگم دەکەیت کە موسوڵمان ببم، بەڵام من هەموو ئەو گوناهانەم ئەنجام داوە کە لە ئایەتەکەدا باس کراون. لە ناو کوفردا ژیاوم و زینام کردووە. سەرباری ئەمانە، بیلبیلەی چاوت و مامی لەدڵا شیرینیشتم کوشتووە. جا ئایا کەسێکی وەك من شایانی لێخۆشبوون دەبێت تا منیش بێم و موسوڵمان بم؟!!“

لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) نامەیەکی تری بۆ دەنێرێت. ئەم جارەیان لە نامەکەدا ئەم ئایەتە دەنووسێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴾ (النساء : ٤٨)

”بەڕاستی خوا هەرگیز لەوە نابووری کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدری، بێجگە لەوە، لە هەموو گوناهێکی تر دەبووری، بۆ هەرکەس کە خۆی ویستی لێ بێ.“

وەحشی ئەمجارەش بەوە وەڵامی دەداتەوە کە لێخۆشبوونی ناو ئایەتەکە بڕاوە و یەکلایی نییە و، بەجێهێڵراوە بۆ ویستی پەروەردگار. دوا بە دوای ئەمە، پێغەمبەری شەفەقەت بۆ جاری سێیەم نامەی بۆ دەنێرێتەوە و تیایدا ئەم ئایەتە دەنوسێت:

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ (الزمر : ٥٣)

”بڵێ، ئەی ئەو بەندانەم کە دژ بە نەفسی خۆتان سنورتان بەزاندووە... ئومێدبڕاو مەبن لە ڕەحمی خوا. چونکە خوا لە تەواوی گوناهان دەبوورێت. بێ شك، ئەو زۆر بەخشندە و بەبەزەییە.“

ئیدی لە دوای ئەم ئایەتە، وەحشی دێ و بەیعەت بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەدات. لەوە بەدوا ئەویش لە ڕیزی هاوەڵە بەڕێزەکان هەژماردەکرا و، بەبێ زیادکردنی دەستەواژەی "رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ" ناوی نەدەبرا. بەڵام هەر چۆنێك بێت دواجار ئەو بکوژی حەزرەتی حەمزە بوو، نە خۆی ئەمەی لە بیر دەکرد، نە دەوروبەرەکەشی. لەوانە بوو وەحشی (رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ) لە دواڕۆژدا لەسەر ئەم تاوانەی سزا نەدرایە. چونکە ئەو ڕۆژەی ئەو کارەی ئەنجام دابوو، هێشتا موسوڵمان نەبووبوو، بە هاتنە ناو ئیسلامیشەوە خوای گەورە لە سەرجەم گوناهەکانی پێشووی خۆش بووبوو.[1] ئەو لەم ڕووەوە بەختەوەر بوو.. بەڵام ئەو کەسەش کە ئەم دەستی چووبووە خوێنییەوە، حەزرەتی حەمزە بوو!..

ئەو حەمزەیەی کە پێشتر مرۆڤێکی ئەفسووناوی بوو و زیرەی بە شێرەکانی بیابانیش کردبوو، وا ئێستا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا کەوتبووە سەر چۆك و تاجی موسوڵمانی لەسەرنابوو. ئەو لەو ڕووەوە کە لەگەڵ سەروەری هەردوو جیهاندا شیری هەمان دایەنیان خواردبوو، بە مەقامی برای شیریی پێغەمبەریش شەرەفمەند بووبوو.[2] تا ئەو ڕۆژەی نەهاتبووە ئیسلامەوە، حاڵی موسوڵمانان سەرگوزەشتەیەك بوو لە ترس. بەڵام بە موسوڵمان بوونی حەمزە، هیممەتی موسوڵمانان جۆشی سەند و زایەڵەی بانگەوازیان لە گوێی تەواوی دوورگەی عەرەبدا زرنگایەوە. دەی وەحشی لە سەردەمی سەرگەردانیدا، دەستی چووبووە خوێنی ئەم حەمزەیەوە! لە ئوحوددا ڕمە شوومەکەی چەقاندبووە سینەی ئەو شێرە نەبەردە. ئەو حەمزەیەی کە بە درێژای ژیانی لە غەیری خوا، بەرامبەر هەموو شتێکی تر وتویەتی نا "لا"، وەختێ بەسەر ڕمەکەی سەر سنگیدا دەکەوت، "لا" یەکی تری هێنایە مەیدان و لەسەر شێوەی "لا"دا کەوتە سەر زەوی. کاتێکیش پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) جەستەی پارچە پارچە کراوی دەبینێ، لە پەنا سەریدا دادەنیشێ و بە کوڵ فرمێسکی بۆ دەڕێژێ. ڕاستە شەهیدان نەدەشۆرران، بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) حەزرەتی حەمزەی شوشت، لە بری ئاویش، وەك بڵێی بە شەستەبارانی ئەشکی گەشی شوشتی. ئەو ئەشکانەی کە لە ئاوی کەوسەر

---

١ إِنَّ الْإِسْلَامَ يَجُبُّ مَا كَانَ قَبْلَهُ "ئیسلام گوناه و کوفری پێش ئیسلام بوون دەسڕێتەوە و لایدەبات" (أحمد بن حنبل، المسند ١٩٩/٤)

٢ بخاري، شهادات ٧؛ مسلم، رضاعة ١١-١٤؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٤٥/٤.

بەنرختر بوون.[1] بەڵێ، پێغەمبەری خوا تا ئەو ڕادەیە بۆ حەزرەتی حەمزە گریا. بەڵام وا ئێستا، بکوژی حەمزە دەستی خوێناویی درێژ کردووە و بەیعەتی پێ دەدات. جا تەماشای فراوانیی ئاسۆی تەبلیغی ئەو سەروەرە بکەن! ئەوەتا دەست لەناو ئەو دەستە دەنێ و پیرۆزبایی موسوڵمان بوونی لێ دەکات. جا مەگەر هەر خۆی نەبوو کە پێداگری دەکرد لەسەر موسوڵمان بوونی وەحشی؟! پاش ئەوەی وەحشی موسوڵمان بوو، حەزرەت خۆی لە گوێی نزیك کردەوە و، ئەم وشانەی بە گوێیدا چرپاند: "ئەگەر بکرێ زۆر خۆتم پێ نیشان نەدەی، چونکە بە بینینت، حەمزەم بیر دەکەوێتەوە و لەوانەیە نەتوانم وەك پێویست شەفەقەتت بەڕوودا بنوێنم. ئیتر بەم جۆرە تۆ مەحکومی بەدبەختی دەبیت و، منیش بە تەواوی مانا فەرمانبەرێتی سەرشانم بەجێ ناگەیەنم."[2]

حەزرەتی وەحشی بە گیانێکی صەحابییانەوە بۆ جارێکیش بێ، ئەم خواست و فەرمانەی پێغەمبەری خوای (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) نەشکاند. بەردەوام خۆی لە پێغەمبەری خوا بە دوور دەگرت و هەوڵیدەدا نەچێتە بەرچاوی.[3] بەڵام هەموو خولەك و چرکەساتەکانی لە چاوەڕوانی ئەو بانگهێشتەدا بەسەر برد کە لە پێغەمبەری خواوە پێی دەگەیشت و بانگی دەکردە حوزووری. لەپشت کۆڵەکەیەکەوە دەوەستا و بە بێدەنگی تەماشای پێغەمبەری خوای دەکرد و هەوڵی دەدا نیگاکانی بکاتە سۆمای چاوانی. لەبەر خۆیەوە هەر دەیوت: تۆ بڵێی ڕۆژێك بێت و پێم بفەرموێت: "ئیتر دەتوانیت خۆتم پیشان بدەیت." لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ئەم چاوەڕوانییە جەرگبڕەدا بوو کە هەواڵە دڵتەزێنەکەی پێگەیشت. ئیدی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئاوا بووبوو و لێمان جیا بووبووەوە. حەزرەتی وەحشی بەجارێك لە جێی خۆی تەزیبوو. چونکە ئەو ئومێدەی کە هەیبوو بۆ چوونە حوزووری، ئەویشی لەدەست دابوو.

ئیدی حەزرەتی وەحشی ڕۆژەکانی تەمەنی هەر بە گەڕان بەدوای کەفارەتی گوناهەکەیدا بەسەربرد. تا لە کۆتاییدا جەنگی یەمامە هاتە پێش. هەر زوو چووە ناو

١ طبراني، المجمع الكبير ١٤٢/٣؛ حاكم، المستدرك، ١٣٠/٢، ٢١٨/٣-٢١٩

٢ طبراني، المجمع الأوسط ٢٢٢/٢، إبن هشام، السيرة النبوية ٢٠/٤؛ إبن عبدالبر، الإستيعاب ١٥٦٥/٤.

٣ إبن هشام، السيرة النبوية ١٦/٣-١٧٧؛ إبن حجر، فتح الباري ٣٧٠/٧.

سوپاکەی حەزرەتی خالید و، بەرەو مەیدانی جەنگ بەڕێ کەوت. ئەمە ئەو دەرفەتە بوو کە بە هیچ شێوەیەك نەدەبوو لە کیسی بدات. ئەو گەورەترین قارەمانی ئیسلامی شەهید کردبوو و دەستی چووبووە ئەو گوناهە سامناکەوە. هەرچەندە گوناهەکەی بەر لێخۆشبوون کەوتبوو، بەڵام لەتاو کاریگەریی ئازارەکەی، ویژدانی هەروەك دۆزەخ قرچەی دەهات. دەی ئەمەش هەلێکە و بۆی ڕەخساوە: هەلی لەناو بردنی دوژمنی هەرە گەورەی ئیسلام، موسەیلەمەی کەذذاب.

حەزرەتی وەحشی، هەمان ئەو ڕمە ژەنگاوییەی کە لە سینەی حەزرەتی حەمزەی چەقاندبوو و وەك یادگارییەك لای خۆی هەڵیگرتبوو، گرتە دەست و بەرەو جەنگی یەمامە کەوتە ڕێ. جەنگ دەستی پێ کرد و چەندین ڕۆژ درێژەی کێشا. موسەیلەمە و سوپاکەی شەڕی مان و نەمانیان دەکرد. موسەیلەمە لە یەکێك لە ڕۆژە سەختەکانی جەنگدا، بە مەبەستی هەڵهاتن، لە قەڵاکە دێتە دەرەوە. لەم کاتەشدا لە لایەن یەکێك لە پاسەوانە موسوڵمانەکانەوە دەبینرێت. ئەویش یەکسەر هاوار دەکاتە حەزرەتی وەحشی و، دەڵێت: "ئەوەتا، ئەوە دوژمنی خوایە، دەیەوێت هەڵبێت!" حەزرەتی وەحشی هەر کە گوێی لەمە بوو، لە جێی خۆی ڕاپەڕی و پری کرد بە ڕمە ژەنگاوییەکەیدا. وەك چۆن چەندین ساڵ پێشتر بەو ڕمە، شێری خوا، حەزرەتی حەمزەی شەهید کرد، وا ئێستا هەمان ئەو ڕمە دەچەقێنێتە سینەی دوژمنی خوا، موسەیلەمەی درۆزن و لە خوێنی خۆیدا دەیگەوزێنێت.[1] هەر کە کەوتنی موسویلەمەی لەسەر ئەسپەکەیەوە بینی، لە شوێنی خۆیدا چووە سوجدەوە. لەنێو فرمێسکەکانیدا وەك بڵێی لەگەڵ ڕۆحیانەتی پێغەمبەری خوادا دەدوا و، دەیوت: "یا رسول الله ئایا ئێستا دەتوانم بێمە حوزوورت؟!"

ئێمە نازانین پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چ وەڵامێکی حەزرەتی وەحشی داوەتەوە. بەڵام کێ دەزانێ، لەوانەیە ڕۆحیانەتی پێغەمبەری خوا لە یەمامە ئامادە بووبێت و لە بەرامبەر ئەم ناڵە و نیازە پڕ لە ئینکیسارەی حەزرەتی وەحشیدا دڵی نەرم

---

١ إبن عبدالبر، الأستيعاب ١٥٦٣/٤-١٥٦٤؛ ذهبي، سير أعلام النبلاء ١٧٨/١؛ أبن كثير، البداية و النهاية ٢٦٨/٦،٣٢٥.

بوویێت و، وەك پیرۆزباییەك بەرامبەر بەو جوامێرییەی ئەنجامی داوە، حەزرەتی وەحشی لە ئامێز گرتبێت و، پێی فەرموویێ: "ئیتر دەتوانی بە کامی دڵ وەبەرچاوم کەویت." ئێمە هیچ کام لەمانە نازانین. چونکە ئەم بابەتە، ڕەهەندی خووپێوەگرتووی ئێمە تێپەڕ دەکات. گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەش بۆ دروست کردنی بەرچاو ڕوونییەك بوو سەبارەت بە حەقیقەتی تەبلیغ لای پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ)...

بەڵێ، دەبینین پێغەمبەری خوا تەنانەت دەبێتە ڕەحمەت بۆ بکوژی ڕۆحێکی مەزنی وەك حەزرەتی حەمزە، کە بەلایەنی کەمەوە هێندەی باوکی خۆشیدەویست و، بە ئەندازەی برای خۆی بە دەمیەوە بوو. ئینجا لەپێناو موسوڵمان بوونیدا چەندین ڕێگە تاقی دەکاتەوە. تا ئەوەی لە کەسایەتییەکی وەکو وەحشی، صەحابییەك دێنێتە کایەوە. جا ئەگەر بیری تەبلیغ پارچەیەك نەبووایە لە ڕۆحی و، لە فیترەتیدا ڕەگی دانەکوتابوایە و، لەگەڵ سرووشتیدا یەکانگیر نەبوایە، چۆن دەکرا پێداگری بکات لەسەر موسوڵمان بوونی کەسێکی وەك حەزرەتی وەحشی؟ نا.. لەم پەرۆشی و خەمخۆرییەیدا حەقیقەتێك پەنهان بوو. ئەو حەقیقەتەی کە تەبلیغ سیفەتێکی لێجیانەبووەوەی پێغەمبەرانە (عَلَيۡهِمُ السَّلام). هەر بۆیە نەدەکرا جیاواز لەمە ڕەفتار بکات.

## بانگەوازی عیکریمە

دوژمنایەتی عیکریمە زۆر لە هی وەحشی زیاتر بوو. ئەو ڕاستەوخۆ دوژمنی ئیسلام خۆی بوو. واتە دوژمنایەتییەکەی ئەو، دوژمنایەتییەکی بەئەنقەست و هۆشەکی بوو. لە بونیادی دانە دانەی ئەندامانی ئەو خانەوادەیەی عیکریمەی تێدا گەورە بووبوو، دوژمنایەتییەکی سروشتی بەرامبەر بە ئیسلام هەبوو. سەرگەورەی ماڵ ئەبووجەهل بوو. جەهالەتی باوك ڕیشەی بە هەموو سوچێکیماڵدا داکوتابوو و، ئاسمانی ئەو خانەوادەیەی بە تاریکییە ڕەشەکەی ڕۆحی کردبووە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ. خۆ ئەگەر بهاتایە ئەندامێکی ئەو خێزانە باوەڕی بهێنایە و موسوڵمان بووبووایە، ئەوا ڕۆژی ڕووناکی لێ دەکرایە شەوەزەنگ و، ئارامیی لێ زەوت دەکرا و، بەسەختترین شێوە ئازار دەدرا.

عیکریمە وەك ئەوەی لە دوژمنایەتی کردنی ئیسلامدا لەگەڵ باوکی پێشبڕکێ بکات وەها بوو.[1] لە هەمووو جموجووڵە ناپاکەکانی باوکیدا بەشداری دەکرد و دەست لەسەر سنگ ئامادە دەبوو. کوفر پەردەی بەسەر بیناییدا دادابوو. تەنانەت دوای فەتحی مەککەش ئەو هێشتا هەر لە یاخی بوونی خۆی نەکەوت. بەڵێ، زۆر بوون ئەوانەی لەگەڵ فەتحی مەککەدا دڵیان فەتح بوو و، هاتنە ناو بازنەی نوورینی ئیسلامەوە. بەڵام عیکریمە دوژمنایەتییەکەی هەر بەردەوام بوو. ئەمە وێڕای ئەوەی کە لە کاتی فەتحی مەککەدا، شمشێری لە موسوڵمانان هەڵکێشابوو و هەوڵی بەرهەڵستی دابوو، دواتریش بەرەو یەمەن هەڵهاتبوو...[2]

ئوم حەکیم هەم خێزانی عیکریمە و هەم کچە مامیشی بوو. ئافرەتێکی ژیر و بەفام بوو و پێشتر موسوڵمان بووبوو. ئەم ئافرەتە مەردە، تەنها لەبەر وەفای هاوسەرێتی، دەڕوا تا یەمەن و مێردەکەی قایل دەکات کە بگەڕێتەوە. بەڵام عیکریمە ڕووی هاتنە حوزووری پێغەمبەری خوای نەبوو. ئاخر دوژمنایەتی و زوڵم و سوکایەتییەك نەمابوو دژ بەو سەروەرە ئەنجامی نەدابێت. گەر بڕیاربووایە دڕك و داڵ لە ڕێی دابنرێت، ئەو پێش هەمووان هەڵپەی دەکرد. گەر بڕیار بوایە خۆڵ بەسەریدا بکەن، پێش هەموو کەس ئەو خۆی دەکرد بە خاوەنی ئیشەکە. بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەتەنگ هیدایەتی عیکریمەشەوە بوو. بۆیە هەمان ئەو مامەڵە هەستیارەی لە بەرامبەر وەحشیدا نواندی، لەگەڵ ئەمیشدا کردی.

وەختێ عیکریمە هاتە خزمەت سەروەری جیهانیان، ئەو گیانی گیانانە بە گوفتارێك کە شایانی گەورەییەکەی بوو، پێشوازی لێکرد و، فەرمووی: مَرْحَباً بِالرَّاكِبِ الْمُهَاجِرِ "سڵاو لە سواری کۆچبەر." ڕاستە هیجرەت بە واتا ئیسلامییەکەی کۆتایی هاتبوو، بەڵام پێغەمبەری خوا(صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەك ئاماژەیەك بۆ لە دوورەوە هاتوویی عیکریمە وەهای فەرموو. تەنها ئەم ڕستەیە بەس بوو بۆ تواندنەوەی کێوە بەفرینەکانی سینەی عیکریمە. ئیتر خۆی لە دەوری دەستی پێغەمبەر دەگێڕاو داوای دوعای لێدەکرد و،

---

١ إبن عبد البر، الإستيعاب ١٠٨٢/٣؛ إبن حجر، الإصابة ٥٣٨/٤.

٢ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ١٥٩/٢-١٦٠.

دەیوت: "ئەی پێغەمبەری خوا! داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لەسەر هەر دوژمنایەتییەك کردوومە، یان هەر کاروان و دەستەیەك بەشداریم تێدا کردووە و مەبەستم سەرخستنی شیرك و بتپەرستی بووە!" پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەستی نزای بەرز کردەوە و، فەرمووی: "خوایە گیان، لە هەر دوژمنایەتییەك کە عیکریمە کردوویەتی، یان هەر کاروان و سوپایەك کە بە مەبەستی بەرهەڵستی کردنی ڕێبازەکەت ڕێکی خستووە، ببوورە و لێی خۆش ببە!" هەر کە عیکریمە ئەم نزایەی بیست، وەخت بوو گەشکە بیگرێ. چونکە هەرگیز چاوەڕێی پێشوازییەکی لەو جۆرەی نەدەکرد. بەڵێ، چاوەڕێی نەدەکرد، ئاخر تا ئەو کاتە وەك هەر کەسێکی ئاسایی تەماشای پێغەمبەری خوای دەکرد و، چاوەڕێی مامەڵەی کەسێکی ئاسایی لێدەکرد. جا کاتێك ئەو هەموو گرنگی پێدانەی بینی، تێگەیشت کە لە گومانەکەیدا بەهەڵەدا چووە. بۆیە وتی: "کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵێن دەدەم کە هەرچیم خەرج کردبێت لە بەرەنگاری کردنی ڕێبازی خوادا، دەبێ دوو ئەوەندە لە پێناوی خوادا خەرج بکەم. چەندێکیش شەڕم کردبێت بۆ بەرهەڵستی کردنی ڕێبازی خوا، دەبێ دوو هێندەی ئەوە لە ڕێبازی خوادا خەبات و کۆشش بکەم..." ئیدی لە "یەرموك" بەڵێنەکەی بردە سەر... ئەوەندە هەیە لێرە لەنێو ئەو شتانەی کە بەخشی، گیانیشی تێدا بوو.[1]

حەزرەتی عیکریمە بە خۆی و خاو و خێزانییەوە بەشداری غەزای یەرمووك دەکەن. لە مەیدانی جەنگدا بریندار دەبێت و دەیبەنە ناو چادرێکەوە. کاتێك هاوسەرەکەی بە سەریەوە دەگری، ڕووی تێدەکات و، پێی دەڵێت: "مەگری! تا سەرکەوتن نەبینم، نامرم." ئەمەش بۆ خۆی کەرامەتێکی تایبەتە بەو. پاش تاوێك حارسی کوڕی هیشامی مامی دێتە ناو چادرەکەوە و، دەڵێت: "مژدە بێ، خوای گەورە سەرکەوتنی بە نسیب کردین." ئیتر لەو کاتەدا حەزرەتی عیکریمە داوا دەکات هەڵی بسێننە سەر پێ: "هەڵمسێنن ،چونکە وا پێغەمبەری خوا دێتە ژوورێ." ئینجا لەگەڵ ڕۆحیانەتی پێغەمبەری خوادا بەم شێوەیە دەدوێ: "یا رسول الله، ئایا بەڵێنەکەم بردە سەر؟ پەیمانەکەم هێنایەجێ؟" لە دوا هەناسەشیدا ئایەتیی ﴿ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي

---

١ حاكم، المستدرك ٣/٢٦٩-٢٧٢.

﴿ بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ (یوسف : ١٠١) "به موسوڵمانیی گیانم بكێشه و بمخه‌ره ڕیزی پیاوچاكانه‌وه."ی خوێند و گیانی به خوای باڵاده‌ست سپارد.

به‌ڵی، به‌ڕاستی پێغه‌مبه‌ری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) زۆر سوور بوو له‌سه‌ر هیدایه‌تی خه‌ڵكی. له ته‌بلیغدا سیمای نه‌سره‌وتنی تێدا نه‌خشابوو و هێمایه‌ك بوو بۆ ئاسۆیه‌كی چاونه‌بڕ. ده‌ستی موباره‌كی بۆ هه‌زاران و سه‌دان هه‌زار كه‌س درێژ ده‌كرد و، به سه‌دان و هه‌زاران كه‌سی بۆ جیهانه ڕۆشنه‌كه‌ی ڕاده‌كێشا، كه‌چی هێشتاش تێربوونی نه‌ده‌زانی. ئاخر ده‌یویست هه‌موان له ڕه‌حمه‌ته فراوانه‌كه‌ی به‌هره‌مه‌ند بكات. به‌ڵێ، ئه‌و ده‌ستی بۆ هیدایه‌تی سه‌رسه‌ختترین دوژمنه‌كانیشی درێژ ده‌كرد. به‌م شێوه‌یه‌ش، قووڵیی چه‌مكی ته‌بلیغ و، به‌رزیی ئاسۆی ئه‌م سیفه‌ته‌ی له پێغه‌مبه‌راندا پیشان ده‌داین.

## ٣. ده‌ردی ته‌بلیغ خه‌وی زڕاندبوو

له ته‌واوی ژیانیدا ڕۆژێك نه‌بووه پێغه‌مبه‌ر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) خه‌وێكی ڕێكوپێكی لێ كه‌وتبێت. ئاخر ئه‌و ده‌رده‌داری ده‌ردی هه‌موو مرۆڤایه‌تی بوو. به‌ڵێ، ڕسته‌ی "به درێژایی ژیانی، نه‌بووه ڕۆژێك چاو لێكبنێ و، خه‌وێكی ئارامی لێ بكه‌وێت" ته‌نها وه‌ختێك ڕاسته كه بۆ سه‌روه‌ری جیهانیان به‌كاربېرێت. چونكه ته‌نها ئه‌و بوو كه هه‌موو ژیانی له پێناوی ته‌بلیغدا به‌سه‌ربرد.

ساڵانی به‌رایی ده‌ورانی مه‌ككه، كۆڵان به كۆڵان و چادر به چادر ده‌گه‌ڕا و، له كوێ بازاڕێك دابنرایه و خه‌ڵكی كۆببوویبوونایه‌ته‌وه، مسۆگه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خۆی ده‌گه‌یانده ئه‌وێ و بانگی خه‌ڵكه‌كه‌ی ده‌كرد بۆ سه‌ر دینی حه‌ق. له‌م ڕێیه‌شدا، تووشی سووكایه‌تی بێ شومار و، بێڕێزی بێ ئه‌ندازه ده‌بووه‌وه. خاك و خۆڵیان ده‌كرد به‌سه‌ردا. كه‌چی ئه‌و بێ باكانه به‌رده‌وام ده‌بوو له ڕۆشتن به‌ره‌و ئامانجه‌كه‌ی. وه‌ره ببینه ئه‌و سیمایه‌ی كه فریشته‌كان دڵیان نه‌ده‌هات لێی بڕوانن، وا موشریكانی مه‌ككه تفی لێده‌كه‌ن! وه‌ره ببینه ئه‌و ڕوخساره دره‌خشانه‌ی كه به خاتری ڕووی ئه‌و گه‌ردوون به‌دیهێنراوه و، ده‌م ده‌م خۆر له ترسی ئه‌وه‌ی نه‌بادا به تینه‌كه‌ی ئازاری بدات، په‌ڵه هه‌ورانی ده‌كرده په‌چه‌ی سه‌ر ڕووی، وا ڕووبه‌ڕووی ناشرینترین سووكایه‌تی ده‌بێته‌وه!

هەر کە فەرمانی "خزمەکانت هۆشیار بکەوە" لە ڕێی ئایەتی ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴾ (الشعراء : ٢١٤) ەوە دابەزی، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) دەستبەجێ تەواوی خزمەکانی لە هۆز و تیرەکان کۆکردەوە و، بەم جۆرە لەگەڵیان دوا: "خوای باڵادەست فەرمانی پێدام کە نزیکترین کەسەکانم ئاگادار بکەمەوە. ئێوەش نزیکترین کەسانی منن. بەڵام هەتاوەکو نەڵێن (لَا إِلَهَ إِلَّا الله)، ناتوانم لە حوزووری پەروەردگاردا هیچتان بۆ بکەم. تەنها مەگەر ئەم وشەیە بڵێن، ئەوجا دەتوانم لە دوارۆژدا گەواهیتان بۆ بدەم."

ئەو سەروەرە بەم شێوەیە لەگەڵیان دوا، بەڵام ئەوان وەك بڵێی بێ گیان بن، وشەیەکیش چییە لە زاریان نەهاتە دەر بۆ وەڵامی ئەو نازدارە. تەنها ئەبولەهەبی مامی قسەی کرد - بریا لە گۆ بکەوتایە و قسەی نەکردایە -: "حەیف بۆ تۆ، بۆ ئا ئەمە ئێمەت کۆکردووەتەوە؟!" دوابەدوای ئەو قسەیەش خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد.[1]

هەموو سەروەت و دارایی حەزرەتی خەدیجە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بۆ ڕێکخستنی خوانی سەرانی مەککە بەخەرج چوو. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) داوەتی دەکردن و خواردن و خواردنەوەی بۆ سازدەکردن و سفرەی بۆ دەڕازاندنەوە و بە باشترین شێوە میوانداری دەکردن، سا بەڵکو لە نێوان ئەم شتانەدا بتوانێت وشەیەك یان شتێك بدات بە گوێیاندا. بەڵام هەرچۆنێك بێ ئەمە نەدەلوا.

حەزرەتی عەلی (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) باسی یەکێك لەو مەجلیسانە دەکات و، دەفەرموێ: "جارێ لەو جارانەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) میوانداری سەرگەورانی مەککەی کردبوو، پاش نانخواردن باسی ڕاستی پێغەمبەرێتی خۆی بۆ کردن و وەك داخوازییەکی خزمایەتی، داوای کۆمەکی لە کەسە هەرە نزیکەکانی کرد. لە کۆتایی قسەکانیشیدا فەرمووی: "کەستان تێدا نییە لەم بابەتەدا ببێتە یارمەتیدەرم؟!" ئەو دەمە من منداڵێکی لاوازی حەوت ساڵانەی ڕەنگ پەڕیوو بووم. گۆزەیەکم پێبوو ناوم دەگێڕا. کاتێك بینیم کەس وەڵامی قسەکانی پێغەمبەری خوا ناداتەوە، خۆم

١ بخاري، تفسير (١١١) ١؛ مسلم، إيمان ٣٤٨-٣٥٦؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٧٤/١

پێنەگیرا و گۆزەکەم دانا و هەڵم دایە: "من هەم.. من پشتگیریت دەکەم یا رسول الله." پێغەمبەری خوا سێ جار داواکەی دووبارە کردەوە، بەڵام لە هەر سێ جارەکەدا جگە لە من، کەسی تر وەڵامی نەدایەوە."[1]

ساڵان هات و ساڵان ڕۆیشت، پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بێ هیچ سرەوت و وەڕسییەك بەردەوام بوو لە بانگەواز بۆ ڕێی حەق. خزمە نزیکەکانی تەنها ساتێکیش نەهاتن گوێ بۆ وتەکانی شل بکەن. ئیتر ئەویش بەڕێ کەوت سا بەڵکو لە دوور کەسانێك بدۆزێتەوە دڵبەستەی حەق بن و، ئەمیش بە خۆری پەیامەکەی ڕۆشنیان بکاتەوە. بەڵام دۆزینەوەی مرۆڤی دڵ زیندوو، هەروەك ئەوەی چاوەڕوان دەکرا، ئاسان نەبوو. ئەوەتا لە طائیف بەردباران کرا و گاڵتەی پێکرا.[2] لە زۆربەی ئەو چادرانەی بۆی دەڕۆشت، دەردەکرا.[3] بەڵام ئەو خواست و ویستە جددییەی هەروا بەهەوانتە دەرنەچوو. وەك بڵێی خواوەندی میهرەبان بەرەو دنیایەکی چاوەڕواننەکراو کەمەندکێشی دەکرد. هەرواش بوو.

ئەوە بوو قەدەر بەرەو عەقەبە ڕێنموونی کرد و، بە کۆمەڵێك مرۆڤی سینەپاکی ناساند. لێرەدا شەش کەسی ناسی. ئەم شەش پیاوە، ساڵی دواتر بوون بە دوانزە. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چەند بابەتێکی پێ ڕاگەیاندن. لە حاڵێکدا ئیمانیان بهێنایە، دەبوو لە چوارچێوەی ئەو مەرجانەدا ئیمان بهێنن. ئەوانیش فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوایان بێ هیچ دوودڵییەك قبووڵ کرد. ئیتر ئەوە بوو حەزرەتی موصعەبی لەگەڵ ناردن تا موسوڵمانێتییان فێر بکات. ساڵی دواتر، حەزرەتی موصعەب بە خۆی و حەفتا و دوو کەسەوە هاتەوە بۆ عەقەبە. ئەمانیش بەیعەتیاندا بە پێغەمبەری خوا. لەم نێوەندەشدا حەزرەتی عەباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) ئامۆژگاری دەکردن تا پێش ئەوەی بڕیار بدەن، وا باشە چاك بیر بکەنەوە و، ئەوەی بۆ ڕوون دەکردنەوە کە چۆن بە قبووڵ کردنی

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ١/١٥٩.
٢ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١/٢١١-٢١٢؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٦٦-٢٦٧.
٣ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٧٠.

ئەم پەیامە، هەموو جیهان لە بەرامبەریان دەوەستێتەوە و دەبێتە دوژمنیان. لە بەرامبەر ئەم قسانەدا هیچ کامیان پەشیمان نەبوونەوە. ئیتر بەم شێوەیە بەیعەتیاندا کە تەنانەت لە سەختترین حاڵ و باریشدا پێغەمبەری خوا بەسەر خۆیاندا پێش بخەن.[1]

## ٤. عەشقی تەبلیغ لای هاوەڵان

موصعەب تاقانەی دەوڵەمەندترین خێزانی مەککە بوو. کاتێك موسوڵمان بوو، تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو. وەختێ بە کۆڵاناندا ڕەت دەبوو، کچانی گەڕەك بە جارێ هەڵپەیان دەکردە بەر پەنجەرەی ماڵەکانیان و، بۆ وەدەست خستنی دڵی، دەسماڵی خۆشەویستییان بۆ درێژ دەکرد. کەسێك بوو زۆر گرنگی بە خواردن و پۆشاك دەدا، بەڵام هەر کە هاتە ناو ئیسلامەوە، چیتر لە خێزانەکەی ڕوویەکی خۆشی نەدییەوە. وەختێکیش هیجرەتی کرد بۆ مەدینە، جگە لە دەستە جلەکەی بەری هیچی تری نەبوو. لەوەودواش هەر وا ژیا. تەنانەت لە ئوحوددا یەك بە یەکی ئەندامەکانی لە پێناوی خوادا بەخت کرد.. بەڵێ، لەو ڕۆژەدا وەك ئەوەی لەسەر تەختەی قەصابی پارچە پارچە کرابێت وەهابوو. وەختێکیش ویستیان ئەسپەردەی خاکی بکەن، پارچە قوماشێکیان دەست نەکەوت تا کفنی پێ بکەن.[2]

ئەم هاوەڵە پایەبەرز و نەجیبەی مامۆستای مرۆڤایەتی، هەر ئەوەندەی گەیشتە مەدینە، ڕاستەوخۆ دەستی کرد بە بانگەواز و تەبلیغ. وەك بڵێی دەرگایەك نەمابوو لە مەدینەدا تەقەی لێ نەدابێت. هێندە بەئیخلاس و حەسبی و ناخگۆیا بوو، ئەوەی گوێی لێ بگرتایە و لە مەجلیسیدا دانیشتایە، لە نزیکترین کاتدا کاژی کوفری فڕێ دەدا و بەرگی نوورینی ئیمانی دەپۆشی. هاتنی ئەو شەپۆل هەژانێکی لە مەدینەدا بەرپا کرد. شەپۆلێك، خاشاکی کوفری ڕادەماڵی و یاقووت و مەرجانی ئیمانی دەکردە دیاری کەناراوی دڵان. دەتوت چاوگێکی نوورینە و دەروونە تاریکەکان ڕۆشن دەکاتەوە. بەدرێژایی مانەوەی لە مەدینە، میوانی ماڵی ئەسعەدی کوڕی زوراره بوو. ئەم زاتە،

---

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٧٦-٢٩٢.
٢ بخاري، جنائز ٢٨، مسلم، جنائز ٤٤.

تەنانەت بەر لە تەشریف هێنانی پێغەمبەری خوا بۆ مەدینە و فەرز بوونی نوێژی جومعەش، باوەڕدارانی کۆدەکردەوە و بە کۆمەڵ نوێژی جومعەی پێ دەکردن.[1]

هەرچی پیاو ماقوڵی مەدینە هەبوو، هەموویان دەهاتنە ماڵی حەزرەتی ئەسعەد و گوێیان بۆ حەزرەتی موصعەب ڕادەگرت. هاتووان بە کوڵێ خەشم و قینەوە خۆیان دەکرد بە ماڵدا، بەڵام کاتێ دەگەڕانەوە، بە کۆمەڵێ هەستی زۆر جیاوازەوە دەگەڕانەوە. سەعدی کوڕی موعاذیش یەکێك بوو لەوانە. ئەویش ڕۆژێکیان بە تووڕەییەوە بەرەو ماڵی ئەسعەد بەڕێکەوت، ڕایگەیاند کە ڕێ نادات هیچ کەسێك لە مەدینەدا ئاشوب بنێتەوە. ئاخر وایان دابوو بە گوێیدا کە حەزرەتی موصعەب بۆ ئاژاوەگێڕی هاتووە. بۆیە ئەویش بە ئەرکی خۆی دەزانی کە وەك سەرگەورەیەکی مەدینە ئەم ئاشوبە لەناوبەرێت. خۆی کرد بەماڵدا، حەزرەتی موصعەبیش وەك هەمیشە، بە زوبانە شیرینە سەوسەن ئاساکەی خۆی، ڕازی سەفەری ئەبەدیی لەگەڵ ئەوانەی چواردەوریدا تاووتوێ دەکرد. لە سەرەتادا سەعد زۆر بەرەقی ڕەفتاری کرد. بەڵام حەزرەتی موصعەب ئەم دڵنیاییەی پێدا: "لە پێشدا دانیشە و گوێم لێبگرە. ئەگەر ئەو شتانەی باسیان دەکەم بەدڵت نەبوون ئەوا کۆتایی بەم کارەم دێنم و چیتر ناڕەحەتت ناکەم." ئەم قسانە بەس بوون بۆ نەرمکردنی دڵی سەعد. زۆری نەبرد سەعد یەکەم هەنگاوی بەرەو ئەو دەرگایە نا کە لێیەوە بەرز دەبووەوە بۆ ئەو پایەیەی کە فریشتەکان بە خاکی بسپێرن. ئیتر لە ناخی دڵیەوە شایەتمانی هێنا.[2]

بەڵێ، سەعدی کوڕی موعاذ لە بەردەم حەزرەتی موصعەبدا کەوتە سەرچۆك و موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. موسوڵمانبوونی سەعد لە مەدینەدا جۆش و خرۆشێکی وەهای هێنایە مەیدانەوە، ڕۆژی موسوڵمان بوونی حەزرەتی عومەری لە مەککەدا دەخستەوە یاد. دەنگدانەوەی موسوڵمان بوونەکەشی لەکەمترین ماوەدا بەناو سەرجەم هۆزەکانی دەوروبەردا وەك ڕووداوێکی مەزن تەشەنەی کرد.

جا هەروەك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بێوچان بەردەوام سەرگەرمی بڵاو کردنەوەی حەق و حەقیقەت بوو، هەر بەو شێوەیەش، شاگرد و قوتابییە ڕاستگۆکانی

١ أبو داود، صلاة ٢٠٩؛ إبن ماجة، إقامة الصلاة ٧٨.
٢ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٨٥.

بە هەرچوار لای دنیادا بڵاوەیان کرد و، ئەرکی گەیاندنی بانگەوازی حەقیان بە کامڵترین شێوە بەجێ گەیاند. ئیتر جیهان لە سایەی مەشخەڵی ئەو دڵە نوورانیانەدا بۆ هەمیشە ڕووناك بووەوە. مەگەر ئەو پاڵنەرەی موصعەبی بۆ مەدینە و، تەڵحەی بەرەو "دومة الجندل" و، ساڵانێك دواتر بەراء و خالیدی بەرەو یەمەن ڕاپێچ کرد، هەر هەمان ئەو ڕۆحیەت و شعوورە نەبوو؟

خۆ ئەگەر بهاتایە یەکێك سەرکەوتوو نەبووایە لەو شوێنەی بۆی نێرراوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) کەسێکی تری دەنارده جێی. بێگومان ئەم جێگۆڕکێیەش بەرهەمی خۆی دەبوو. بۆ نموونە: خالیدی کوڕی وەلید، کە بە مەبەستی ئیرشاد و بانگەواز نێررابوو بۆ یەمەن، زۆر سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) حەزرەتی عەلی نارد بۆ یەمەن و حەزرەتی خالیدیشی نارد بۆ لای گاورەکانی نەجران.

بەرائی کوڕی عازب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) ئەم ڕووداوەمانبەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە: "لەگەڵ خالیددا بە چەندان ڕۆژ لە یەمەن ماینەوە. تا کاتێ عەلی نەهات، کەس باوەڕی پێ نەکردین و نەهاتە ڕیزمانەوە. جا هەر کە حەزرەتی عەلی هات، هەموو شتێك لەپڕ گۆڕانی بەسەردا هات. ئیتر خەڵکی پۆل پۆل دەستیان کرد بە هاتنە ناو ئیسلامەوە و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند."[1]

بەڵێ، بەشی حەزرەتی عەلی (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە یەمەن سەرکەوتن بوو. ئاخر ئەو ڕابردوویەکی درێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا هەبوو. ئەمە جگە لەوەی کە لە پلەی باوکایەتی ئەو زنجیرە زێڕینەدا بوو کە لە حەزرەتی حەسەن و حوسەینەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) بەردەوام دەبوو و، سەرجەم ئەو قوتب و موقەڕڕەبین و ئەولیا و ئەصفیایانەی دەگرتەوە کە تا قیامەت دەهاتن. ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت، حەق و حەقیقەت هێشتا لە ژێر باڵی پەنابەخشی ئەواندا نوێنەرایەتی دەکرێت. ئیدی ئەم حەزرەتی عەلییە، بە وتە شیرینەکانی دڵی تەواوی خەڵکی یەمەنی فەتح دەکرد. تا ئەوەی ڕۆژ بگوزەرێ و ئەوانیش هەموو بەدەستە جەمعی لە حەجی ماڵئاواییدا بێنە ناو ئیسلامەوە.[2]

---

١ طبري، تاريخ الأمم و الملوك ١٩٧/٢؛ بيهقي، السنن الكبرى ٣٦٩/٢.
٢ إبن كثير، البداية و النهاية ١٢٠/٥.

## ج) پەیام بۆ سەرۆک دەوڵەتان

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) سەرگەرمی ناردنی ئەو کەسایەتییە بەتوانا و لێهاتووانە بوو بۆ ناوچەکانی دەوروبەر بە مەبەستی بەجێهێنانی ئەرکی تەبلیغ، لە هەمان کاتیشدا نامەی بۆ پاشا و سەرۆک دەوڵەتان دەنارد و بانگی دەکردن بۆ سەر ئایینی حەق. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕوویەکی تری تەبلیغی پێک دەهێنا.

### ١. نەجاشی

نەجاشی فەرمانڕەوای حەبەشە بوو. جا لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوای نەبینیبوو، بە صەحابی هەژمار نەدەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤێکی مەزن و لێهاتوو بوو. پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) حەزرەتی عەمری کوڕی ئومەییەی نارد بۆ لای نەجاشی. پەیامەکەی سەروەرمان بەم جۆرە بوو:

مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِ إِلَى النَّجَاشِيِّ الْأَصْحَمِ مَلِكِ الْحَبَشَةِ: سَلَامٌ عَلَيْكَ فَإِنِّي أَحْمَدُ إِلَيْكَ اللهَ الْمَلِكَ الْقُدُّوسَ الْمُؤْمِنَ الْمُهَيْمِنَ، وَ أَشْهَدُ أَنَّ عِيسَى رُوحُ اللهِ وَ كَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ الْبَتُولِ الطَّاهِرَةِ الطَّيِّبَةِ الحَصِينَةِ... وَ إِنِّي أَدْعُوكَ إِلَى اللهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ

"لە موحەممەد، پێغەمبەری خواوە بۆ نەجاشی ئەصحەمە، پاشای حەبەشە: سەلامت لێبێت! بەم بۆنەیەوە سوپاس و ستایشی پەروەردگاری "الْمَلِكَ و "الْقُدُّوس" و "الْمُؤْمِن" و "الْمُهَيْمِن" دەکەم. وە شایەتی دەدەم کە حەزرەتی عیسا "رُوحُ الله" یە و کەلیمەی خودایە کە دایبەزاندووەتە سەر مەریەمی داوێنپاک و پاکیزەی بەتوول... بانگت دەکەم بۆ لای خودای تاک و تەنهای بێ هاوەڵ."[١]

سەروەری مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتاوە ڕاستەوخۆ دەستەواژەی "سَلَامٌ عَلَيْكَ"ی ئاڕاستە دەکات و بەمەش، ئاماژەیەکی پەنهان دەکات بۆ ئەوەی کە شتێکی لە

١ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٢/١٣١-١٣٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٨٣.

نەجاشیدا بەدی کردووە. بەڵێ، وەك بڵێی سەروەرمان بە چاوە غەیب بینەکانی هیدایەتی نەجاشیی بینیوە، بۆیە وا بەم شێوەیە لەگەڵی دەدوێت. سەرەڕای ئەمەش، شێواز و دەستەواژەکانی ناو نامەکە تا بڵێی ناوازەن. ئەوەتا دەبینین کاتێك پێغەمبەری خوا دەیەوێت بچێتە ناو بابەتەکەوە، لە ڕێگەی حەزرەتی مەریەمەوە نزیك دەبێتەوە کە بەها و قەدرێکی بێ پایانی لای نەجاشی هەیە. جا خۆ لە ڕاستیدا حەزرەتی مەریەم لای ئێمەش خاوەن قەدر و پێگەیەکی مەزنە. چونکە حەزرەتی مەریەم ئەو ئافرەتەیە کە پێغەمبەرێکی مەزنی هێناوەتە دنیاوە و مەزهەری ئیلهامە.

لێرەدا لایەنێکی گرنگ هەیە کە دەبێت بەوردی سەرنجی بدەین.. نەجاشی مرۆڤێکی مەسیحییە، پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە نامەکەیدا ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزی بەکار هێناوە کە پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە. ئەمە کاریگەرترین و سەلامەتترین ڕێ بوو بۆ چوونە ناو دڵی نەجاشییەوە. لە ڕاستیدا هەر واش بوو.

نەجاشی بۆ پێشوازی کردن و وەرگرتنی نامەکە، لە تەختەکەی دێتە خوارەوە، نامەکە ماچ دەکات و دەیخاتە سەر سەری. هەر کە لە خوێندنەوەی نامەکەش دەبێتەوە، ڕاستەوخۆ وەڵامی بانگەوازەکەی رسول الله دەداتەوە و موسوڵمان بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت. ئینجا بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات، وەڵامی نامەکە دەداتەوە. نەجاشی لە نامەکەیدا دەڵێت:[1]

إِلَى مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِ مِنَ النَّجَاشِيِّ الْأَصْحَمِ... أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولِ اللهِ...
فَإِنِّي لَا أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَ إِنْ شِئْتَ أَنْ آتِيكَ فَعَلْتُ. يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنِّي
أَشْهَدُ أَنَّمَا تَقُولُ حَقٌّ

"بۆ موحەممەد، پێغەمبەری خوا، لە نەجاشی ئەصحەمەوە... شاهێدی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت... ئەگەر بفەرموون، هەر ئێستا دێمە خزمەتتان. بەڵام من تەنها

١ ابن سعد، الطبقات الكبرى ١/٢٥٨-٢٥٩؛ حلبي، إنسان العيون ١/٤٦١.

نەفسی خۆمم بەدەستە و دەسەڵاتم بەسەر شوێنکەوتووەکانمدا ناشکێت. دیسانەوە شایەتی دەدەم کە هەرچی تۆ دەیڵێیت، حەق و ڕاستییە"[1]

نەجاشی خاوەنی هەست و شعوورێکی ئیمانیی دامەزراو بوو. دەگێڕنەوە جارێکیان بە دەوروبەرەکەیی وتووە: "بریا لە بری ئەم هەموو سەڵتەنەت و فەرمانڕەواییە، خزمەتکاری پێغەمبەری خوا بوومایە."[2]

ئیدی ڕۆژان یەك بە دوای یەکدا هاتن و تێپەڕین. تا ئەوەی ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) دێتە مزگەوت و بە ئامادەبووان دەفەرموێت: "هەستن، نوێژی جەنازە لەسەر نەجاشی برامان دەکەین."[3]

ئەنجامدانی نوێژی جەنازە بە غائیب (واتە بەبێ ئامادەبوونی تەرمی مردوو)، بابەتێکە لە نێو زانایانی فیقهدا ڕای جیاوازی لەسەرە. لە کاتێکدا کە ئیمامەکانی مەزهەبی شافیعی و حەنبەلی ئەم جۆرە نوێژەیان بەلاوە دروستە، کەچی ئیمامەکانی مەزهەبی حەنەفی و مالیکی پێچەوانەی ئەمەیان دەربڕیوە.[4] چونکە بە ڕای ئەوان، لە ئەنجامی موعجیزەیەکەوە، خوای گەورە تابووتی نەجاشی لەبەردەم پێغەمبەرماندا بەرجەستە کردووە. ئیتر بەم شێوەیە ئەو نوێژی جەنازەیە بە حازری کراوە.[5] ئەمە بابەتێکی فیقهییە و ئێرەش شوێنی لێکدانەوەی وردەکارییەکان نییە...

## ٢. هەرقل

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نامەی دووەمی بۆ هەرقلی ئیمپراتۆری ڕۆم نارد. ئەم ئەرکەشی بە هاوەڵی پایەبەرز، دیحیەی کەلبی سپارد. ئەمەش دەقی نامەکەیە:

---

١ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٠٧/١؛ الطبراني، تأريخ الأمم و الملوك ١٣٢/٢؛ إبن حبان، الثقات ٩/٢.
٢ بڕوانە: أبو داود، جنائز ٥٦؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٤٦/١.
٣ بخاري، جنائز ٤، ٦٥؛ مسلم، جنائز ٦٢-٦٧.
٤ إبن قدامة، المغني ١٩٥/٢؛ جزيري، المذاهب الأربعة ٥٢٢/١.
٥ سرخسي، مبسوط ٦٧/٢؛ قرطبي، الجامع لأحكام القرءان ٨٢/٢؛ إبن همام، الفتح الكبير ٢٢٧/٢-١١٨.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللهِ و رَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ: سَلَامٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى. أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الْإِسْلَامِ ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ يُؤْتِكَ اللهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ. فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الْأَرِيسِيِّينَ. وَ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَ بَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللهَ وَ لا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَ لَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ

"لە موحەممەد، بەندە و پێغەمبەری خواوە بۆ هەرقلی گەورەی ڕۆم: سەلامی خوا لەوانە بێت کە ڕێگەی هیدایەتیان گرتووەتە بەر. لە پاشان، بانگت دەکەم بۆ ئایینی ئیسلام. موسوڵمان بە، بێوەی دەبی. بەم جۆرەش خوای گەورە دووچەندان پاداشتت دەداتەوە. خۆ ئەگەر پشت هەڵبکەیت، ئەوا سەرباری گوناهی خۆت، ئۆباڵی هەموو ئەو کەسانەشت لەسەر دەبێت کە پشت هەڵدەکەن.

'ئەی ئەهلی کیتاب، وەرن با لەسەر وشەی هاوبەشی نێوانمان ڕێکبکەوین (ئەو وشەیەی کە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا هەمان واتای هەیە) جگە لە الله هیچی تر نەپەرستین، شەریك بۆ خوا بڕیار نەدەین و، جگە لە خوا کەسمان کەسی ترمان نەکات بە پەرستراو. خۆ ئەگەر ئەوان دیسان ڕوویان وەرگێڕا، ئەو کات ئێوەش بڵێن: بە شایەت بن ئێمە موسوڵمانین'(آل عمران : ٦٤)"

ئەم وتانە کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەر هەرقل بەجێ هێشت. لەو ماوەیەشدا ئەبوسوفیان لە شام بوو.. لە نێوان ئەبوسوفیان و ئیمپراتۆردا ئەم ئاخاوتنە هاتە کایەوە:

هەرقل:

- بنەچە و نەسەبی چۆنە؟

- خاوەن بنەچە و نەسەبێکی ڕەسەنە.

- ئایا پێشتر هیچ کام لە باووباپیرانی بانگەشەی لەم شێوەیەیان کردووە؟

- نەخێر، شتی وا نەبووە.

- هیچ کام لە باووباپیرانی فەرمانڕەوا بوون؟

- نەخێر، تیایاندا هەڵنەکەوتووە.

- شوێنکەوتووانی لە هەژارانن یاخود دەوڵەمەند و دەستڕۆشتووەکان؟

- زۆرینەیان لە هەژارەکانن.

- شوێنکەوتووانی زیاد دەکەن، یاخود کەم دەکەن؟

- ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکەن.

- هەرگیز بووە درۆی کردبێت؟

- نەخێر، هەرگیز درۆمان لێ نەبیستووە.

- هیچ ناپاکییەکتان لێ بینیوە؟

- تا ئەمڕۆ شتی وای لێنەبینراوە. بەڵام دوای ئەمە نازانم چۆن دەبێت.

بەم شێوەیە دەبینین ئەبوسوفیان، کە تا ئەو کاتە موسوڵمان نەبووبوو و، جەمسەرێکی دیاری نەیاری کردنی پێغەمبەری خوا بوو، مەگەر تەنها لە کۆتا ڕستەی قسەکانیدا ئینجا توانی گومان و دوودڵییەك بترنجێنێتە قسەکانیەوە.

هەرقلیش وەڵامەکانی ئەبوسوفیان دووبارە دەکاتەوە و ڕایدەگەیەنێت کە هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر ریسالەتی پێغەمبەر. پاشان پرس و ڕا بە ئوسقوفەکەی دەکات، ئەویش هەمان بۆچوونی دەبێت. بە گوێرەی یەکێك لە ریوایەتەکان، لەوێدا ئیمانی خۆی ئاشکرا دەکات و، دەڵێ: "زۆر نابات هەموو ئەم ناوچانەی لە ژێر پێمدان، دەبن بە موڵکی ئەو."[1] ئەمە دەڵێت و لە دواییشدا قسەکانی وەك خۆی دێنە دی.

بەڵام کاتێك توورە بوون و پیش خواردنەوەی قەشەکان دەبینێت، ڕێڕەوی قسەکانی دەگۆڕێت و، دەڵێت: "من ئێوەم تاقی کردەوە، تاکو بزانم تا چ ڕادەیەك پابەندی

١ بخاري، بدء الوحي ٦.

ئایینەکەی خۆتانن..." بەڵام ئوسقوفەکەی ئیمان دەهێنێ و بە شێوەیەکی غەیبی بەیعەت دەدا بە پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ).[1]

## ٣. ئەوانی تر

سەروەرمان پەیامی بۆ چەندین کەس و شوێنی تریش ناردووە. هەیانبوو ڕێی ڕاستی دەگرت و ئیسلامی قبووڵ دەکرد، هەشیانبوو لەگەڵ ئەوەشدا کە موسوڵمان نەدەبوو، کەچی ڕێز و حورمەتی شایستەیان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا دەنواند. مقەوقەسی فەرمانڕەوای قبتییەکان یەکێك بوو لەوانە. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) پەیامێکی بە حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەدا (رَضِيَاللهُعَنْهُ) بۆ نارد. ئەگەرچی مقەوقەس نەبوو بە موسوڵمان، بەڵام بەدرێژایی ماوەی مانەوەی حاتەب لە میسر، بەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستییەوە میوانداری کرد و لە دواییشدا چەندین دیاری نارد بۆ پێغەمبەری سەروەرمان. دایکی ئیمانداران، حەزرەتی "ماریە"ش یەکێك بوو لەو دیارییانە. پێغەمبەرمان بە خێزانی خۆی قبووڵی کرد و منداڵێکیشی بە ناوی "ئیبراهیم"ەوە لێبوو.[2] جگە لەمەش، لە ناو دیارییەکاندا ئێسترێکی سپی تێدا بوو بە ناوی "دولدول".[3] ئەم ئێسترە، یەکەم ئێستر بووە کە عەرەبی ئەو زەمانە بیبینێت.

یەکێکی تریش لەو پاشایانەی کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَكْمَلُالتَّحَايَا) نامەی بۆ نارد، کیسرای پاشای فارس بوو. بەڵام هەڵوێستی کیسرا لەوانی تر جیاواز بوو. کیسرا نامەکەی پێغەمبەرمانی دڕاند و فڕێی دایە سەر زەوی.. سەرئەنجامی ئەم ڕەفتارەش لە پارچە پارچە بوونی موڵك و دەسەڵاتەکەیدا تەجەللی کرد. ئەوەبوو زۆری نەخایاند کە ئێران پارچە پارچە بوو و لەبەریەك هەڵوەشا.[4]

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَلْفُصَلَاةٍوَسَلَام) بە گەیاندنی بانگەوازەکەی بە فەرمانڕەوا

١ بخاري، بدء الوحي ٦.
٢ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٦٠/١؛ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٢١٨/٢.
٣ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٣٤/١، ٢٦٠، ٤٩١؛ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٢١٨/٢.
٤ بخاري، علم ٧؛ إبن حجر، فتح الباري ٣٤٢/١٣؛ نووي، شرح مسلم ٤٢/١٨.

و سەرۆك دەوڵەتان و سەرگەورەی هۆزە جیاوازەکان، دەستی دابووە تەبلیغێکی جیهانی و گشتگیر. ئەو هەر ڕۆژەو هەنگاوێك زیاتر دەچووە دڵەکانەوە و تەختی خۆی دادەمەزراند. دەتوت جازیبەیەکی قودسی تێدایە و، لە ڕێگەی چەند پەتێکی ڕازئامێزەوە هەموان بەرەو لای خۆی کەمەندکێش دەکات. هەر تاك و کۆمەڵێکیش کەوتبێتە بازنەی کەمەندکێشیی ئەوەوە، لە هەمان کاتدا دەبوو بە بەشێکیش لە جیهانی نوور. لە پاش ئەوەی سەڵتەنەتی ئەوینی لە دڵەکاندا دانا، ئیدی بەرەنگاربوونەوە و بەربەرەکانێ کردنی بووبووە مەحاڵێك، جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ بەرگرتنی خۆر بە بێژنگ. پەلەقاژەیەکی بێ هوودەشی پێدەوترا.

جا خۆ هەرواش بوو. زۆری نەبردکە بەشێکی زۆر لەوانەی تا ئەو ڕۆژە لە بەرەی نەیاردا بوون، مایەپووچی و ڕەنجەڕۆیی کرد و کۆششەکانیان بۆ دەرکەوت و، ئەوانیش دەخیلی رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) بوون.

## د) حودەیبیە لە ڕوانگەی تەبلیغەوە

حودەیبیە نموونەی شێوازی سوود وەرگرتنە لە دەرفەت و هەلە ڕەخساوەکان لە پێناو تەبلیغ و بانگەوازدا. ڕێککەوتننامەی حودەیبیە دارای پێگە و بایەخێکی تایبەتییە لە بواری تەبلیغدا. ئەوە بوو ڕەزامەندی دەربڕینی پێغەمبەری نازدار بەو ڕێککەوتننامەیە، سەرباری ئەو مەرجە دژوارانەی لە خۆی گرتبوو، هەر لە سەرەتاوە لە لایەن چەند کەسێکەوە ڕووبەڕووی چەند کاردانەوەیەك بووەوە کە بۆنی ڕەخنەیان لێ دەهات. لەوانەش حەزرەتی عومەر، کە بە وابەستەیی بە پێغەمبەری خواوە ناسرابوو. ئیدی بەم چەشنە، چەند چرکەساتێکی تەمومژاوییان لە لێواری خەسارەتمەندیدا بەسەردا تێپەڕی.[1] ڕاستە چەند ساتێکی لەو جۆرەیان بەسەردا تێپەڕی بەڵام تەنها ساڵێك دواتر موسوڵمانان بەوپەڕی سەربەستییەوە چوونە ناو مەککەوە. ئەم ڕووداوەش بەدرێژایی ساڵێکی ڕەبەق بووە باس و خواسی کۆڕ و دانیشتنی مەککەییەکان. بەمەش هێدی هێدی دڵەکان بۆ هاتنە ناو ئیسلام ئامادە دەکران.. لەم سەروبەندەشدا

١ بخاري، شروط ١٥؛ مسلم، جهاد ٩٤.

چەند کەسایەتییەکی ناسراوی نێو سەرانی قورەیش، هاوشێوەی خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص، بە ئیرادەی ئازادی خۆیان باوەڕیان هێنا و هاتنە نێو ڕیزی موسوڵمانانەوە.[1] موسوڵمان بوونی ئەم کەسایەتییە ناوازانە بێ ئەوەی عیززەتیان زامدار ببێت، لە سۆنگەی ئەو خزمەتانەوە کە لە داهاتوودا پێشکەشیان دەکرد، زۆر گرنگ بوو. جا خۆ هەرواش بوو...

لەلایەکی ترەوە، ئەو دیمەنی وابەستەیی و دڵبەندییەی کە هاوەڵان لە کاتی بەیعەتدا بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نواندییان، لە چاوی باڵادەستانی مەککە وننەبوو،[2] ئەمەش خۆی لە خۆیدا گڕوتینێکی تری دا بە پرۆسەی نەرمبوونی دڵی مەککەییەکان بە ڕووی ئیسلامدا.

## هـ) تاک لە ڕوانگەی تەبلیغەوە

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەنانەت لەو کاتانەشدا کە لە لوتکەی فەتح و سەرکەوتنەکانیدا بوو، ئەوپەڕی گرنگی بە تاك دەدا و بە بایەخەوە بۆی دەڕوانی. خۆ ئەو باش دەیزانی کە چەند ساڵێك نابات و هەموو خەڵکی مەککە دێن بە دەنگ پەیامەکەیەوە. کەچی وێڕای ئەمەش، بایەخێکی تایبەتی دەدا بە هاتنی خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا). ئەوەبوو پێشوازی لێکردن و لێزمەی ڕێز و ستایشی بەسەردا باراندن. بەڵێ، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) چەند هاوەڵێکی نارد بۆ پێشوازی کردن لەم دوو کەسایەتییە بلیمەتە. کاتێکیش حەزرەتی خالید بۆ پیشاندانی تەسلیمییەتی خۆی دەستی بەرەو رسول الله درێژ کرد، ئەم دەربڕینە ستایش ئامێزانەی پێغەمبەری خوا دڵیان هێنایە جۆش: "بەڕاستی منیش زۆرم بەلاوە سەیر بوو، دەمووت ئاخر چۆن دەبێت مرۆڤێکی ژیری وەکو خالید لە چنگی کوفردا بمێنێتەوە. دڵنیایی تەواوم هەبوو کە ڕۆژێك دێت موسوڵمان دەبیت."

ئەم وتانە بە ڕووی کەسێکدا کە لە حاڵەتێکی ڕۆحی وەها ناسکدا بێت، خۆی

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٣٨/٤-٢٤٠.
٢ بخاري، شروط ١٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٩/٤-٣٣٠.

لە خۆیدا ئەوپەڕی پێزانین و ڕێز لێگرتنە. کێ دەزانێت ئەم ستایش و کەرەم نوێنییە، لە ڕوانگەی ژیانی داهاتوویەوە، چ شەپۆلێکی مەعنەوی و، قۆناغبڕییەکی ڕۆحی تێدا تاودابێت؟

لەم نێوەندەشدا عەمری کوڕی عاص دەستی پێغەمبەری خوای گرتبوو و بەری نەدەدا. ئۆقرەی نەدەگرت و جەختی دەکردەوە کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە خوای گەورە بۆی بپاڕێتەوە: ''یا رسول الله، دوعام بۆ بکە و لە خوا بپاڕێرەوە بەڵکو لە گوناهەکانم خۆشبێت.'' پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلَّمْ) یەکسەر ڕووی کەرەمبەخشی خۆی دەکاتە ئەم هاوەڵە و، پێی دەفەرموێت: ''ئەی نازانیت ئیسلام گشت گوناهەکانی پێشوو دەسڕێتەوە و هەمووی لادەبات... کاتێك مرۆڤ دێتە ناو ئیسلامەوە، وەك ئەوەی تازە لەدایك بوو بێت، ئاوەها پاك و بێگوناه دەبێتەوە.''[1]

بەڵێ، ئیدی دڵەکان لە تاو شەیدایی ئەو لێیان دەدا و، نیگاکانیش بۆ بینینی ئەم چاویان هەڵدەبڕی. ئەو ڕووتێکردن و هۆگرییەش کە خەڵکی بۆ کەسایەتییە شکۆدار و بەڕێزەکەی هەیانبوو، ئەم لە پێناو تەبلیغ و بانگەوازەکەیدا بەکاری دەهێنا. مرۆڤەکانیش پۆل پۆل بەرەو ئەو دەیاندایە پرتاو و بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەچوون. تەنانەت هەر ئەو شەپۆل و گوڕوتینەی ئەو سەردەمەیە کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە. بڕواشمان وایە کە پەیامە پیرۆزەکەی پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، هەتاوەکو ڕۆژی پەسڵان بە شکۆمەندی و مەزنییەکەی خۆیەوە بەردەوام دەبێت لە ڕۆشن کردنەوەی ڕێی مرۆڤایەتی.

گەر تەنها لە ڕوانگەی ئەو ئەندازەیەشەوە بێ کە لە میدیاکانەوە پیشانمان دەدرێت، ئەمڕۆ لە ئەورووپادا ملیۆنان کەس لە موسوڵمان بووندان و دنیاش لە هەنگاوناندایە بەرەو ئیسلام. بەڵێ، ئەورووپا سکی بە ئیسلام پڕە و بەم نزیکانە سکەکەی دادەنێت. لە جیهانی ئیسلامیشدا لەدایك بوونەکە لە تەواو بووندایە. ئینجا تەماشایەکی ئەم خۆرهەڵاتەی جیهان بکەن! واتە ئەو شوێنانەی کە هزری نیفاق، چڕنووکی خۆی تێ گیراندووە. سەرەڕای تێپەڕبوونی زیاد لە نیو سەدە و، کەوتنە بەر زنجیرە شاڵاوی

١ أحمد بن حنبل، المسند ٢٠٥/٤.

دڕندانەی پاکتاوی نەژادی، کەچی دانیشتووانە موسوڵمانەکەی ناویان، هەروەك ئەوەی شتێکی ئەوتۆیان لە دنیای هزر و ڕۆحیان لەدەست نەدابێ، بە تاسەوە بەرەو دنیای هزری و ڕۆحی ڕەسەنی خۆیان دەگەڕێنەوە. هەر ئەمەندەش نا، بەڵکو لە داهاتوویەکی نزیکدا، بانگی موحەممەدی لە ناوجەرگەی ئەو شوێنانەشەوە دەبیستین کە بە مەحاڵ دەبینرا و، لەوێش خەڵکی دەستە دەستە دێنە ناو ئیسلامەوە. نوێنەر و میراتگرانی دەعوای نبووەت کونجێك ناهێڵنەوە لە دنیادا کە تەبلیغی پێنەگەیشتبێت. لە سەروبەندی ئەنجامدانی هەموو ئەمانەشدا، بۆ ساتێکیش بیریان ناچێت کە ئەوان گیانفیدایانی شەفەقەت و خۆشەویستین.

## و) بەهرەمەندیی لوتفی خوایی

خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا دەدوێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾

(المائدة : ٦٧)

”ئەی پێغەمبەر! هەرچی پەیامێکت بۆ دابەزیوە لە لایەن پەروەردگارتەوە، ڕایبگەیەنە. خۆ ئەگەر بەم کارە هەڵنەسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەیت (بە تەواوی) نەگەیاندووە. (دڵنیاش بە کە) خوا دەتپارێزێت لە شەڕ و خراپەی خەڵکی. بەڕاستی خوا هەرگیز هیدایەت و ڕێنموویی گرۆی کافران ناکات.“

خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) لەگەڵ هیچ کام لە پێغەمبەرانیدا بەم شێوەیە نەدواوە. هەر وەختێ گوفتاری ئاڕاستەی ئەوان کردبێ، بە ناوی کەسیی خۆیانەوە لەگەڵیان دواوە. ئەوە تەنها حەزرەتی موحەممەدە (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) کە لە کاتی دواندنیدا، دەستەواژەی بەگەورە زانینی لەم شێوەیەی بۆ بەکاردێت.

مەبەست لە "يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ" ئەو کەسەیە کە لە کردگاری مەزنەوە پەیام دەهێنێت و هەواڵ دەدات و شارەزای جیهانەکانی ئەودیوە. بەم شێوازە لە گوفتار، خوای باڵادەست تایبەتمەندییەکی پڕ شکۆ و، پایەیەکی بڵند دەبەخشێتە پێغەمبەرەکەی. لە هەمان کاتیشدا قەدر و قیمەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارە وەبیر ئێمە دەهێنێتەوە. دەشکرێ ناوی بنێین ڕاگەیاندنی پایە و شەرەفی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم). ئیدی ئەو لە ژێر سایەی ئەم شەرەفەدا پەیامەکانی پەروەردگارمان پێی ڕادەگەیەنێت. واتە، ئەو زاتەی کەوا ئێستا لەگەڵتان دەدوێ، یاخود ئێوەی لە مەقامی دوێنراودا قبووڵ کردووە، زاتێکە پەروەردگار ڕێز و ستایشی لێناوە. ئەگەر دروست بێت بڵێین، خوای گەورە بە ناوی خۆیەوە "ئەی ئەحمەد، ئەی موحەممەد، ئەی مصطفی، ئەی مەحموود" بانگی ناکات، بەڵکو بە دەستەواژەی "ئەی پێغەمبەری پایەبەرز" لەگەڵیدا دەدوێت. واتە، ئەی ئەو پێغەمبەرەی کە بە پەیامێکی ژیانبەخشەوە گەیشتوویتە فریای مرۆڤایەتی و، هەست و هزر و دەروونیان دەبووژێنیتەوە! ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە خوای گەورە بەرزی کردبووەوە بۆ لوتکەی حەلەزۆنێکی نوورانی و، سەرفرازی کردبوو بە پێغەمبەرایەتی و، هێنابوویە ئاستی دوێنراوێك کە ڕووبەڕوو گوفتاری ئاڕاستە بکات.

بەڵێ، هەروەك لە نموونەی ئەم دەربڕینانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) دەیهێنێتە حوزووری زاتی موقەددەسی خۆی و ڕووبەڕوو لەگەڵیدا دەدوێت. شایانی باسە هەندێك لە لێکۆڵەرەوان ڕایان وایە کە پێغەمبەری نازدار (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە میعراجدا هەر بەڕاستی بەو شێوەیە لەگەڵ خوای گەورەدا ئاخاوتنی ئەنجام داوە.[1] وەك چۆن وەحییەکانی تری هەندێ جار لە پشتی پەردەوە بەڵام هەر لە لایەن زاتی خوای گەورە خۆیەوە بۆ دەهات، ئاواش، لە میعراجدا ئەم کارە ڕاستەوخۆ و بەبێ پەردە ڕوویداوە.

جا ئیدی حەزرەتی محمد المصطفی ئا ئەم زاتەیە. خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) ئەم زاتەی بەرز کردەوە بۆ ئاستێك کە دواهەمین ئاست و مەقامە. ئەوجا گوفتاری خۆی ئاڕاستە دەکات و، دەفەرموێ: "ئەو پەیامانەی بۆم ناردوویت، پێویستە بێ سرەوت،

١ قاضي عياض، الشفاء ٢٠٢/١.

بێ وەستان، بیانگەیەنیت بە مرۆڤایەتی. نابێت هیچ شتێکیش لەم کارەدا ببێتە ڕێگر و کۆسپی سەر ڕێت.. بەڵێ، دەبێ بە هیچ شتێکەوە نەئاڵێیت و گیری پێوە نەخۆیت. نە ترس و نیگەرانی، نە برسێتی و تینوێتی، نە پلەوپایەی دنیایی، نابێت لە تەبلیغەکەت دوورت بخەنەوە."

ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە شایەتی دەدەین کە بەڕاستی ڕەسولی ئەکرەم (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە بەرامبەر هیچ کام لە تەگەرە و ئاستەنگەکانی بەردەمیدا نشوستی نەهێنا و، بۆ تەنها ساتێکیش لە ئەنجامدانی فەرمانبەرییەکەی خاو نەبووەوە. ئەوەتا دەرگایەکی ریسالەتی بەڕوودا واڵا کرا، ئیتر ئەویش بە جۆرێك ئەو دەرگایەی خستە سەر پشت، دەتوت بە چوارچێوەکەیەوە لە بنی دەردێنێت. ئیتر بەم جۆرە گەیشتە ئاستێك کە هیچ کەسێکی تر پێی ناگات. بۆیە لەم ڕووەوە دەکرێ یەکێك لە ڕووەکانی ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾ (النجم : ٩) "بە جۆرێك لە نێوانیاندا بە ئەندازەی ماوەی نێوان دوو کەوان (کە لە تەنیشت یەکەوە دانرابن) مایەوە بگرە کەمتریش." بروانەیتە ئەم ڕاستییە. بەڵێ، سنوورێکی دیاریکراو بۆ بڵندبوونەوەی تەقدیر کرابوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ئەو سنوورەی زۆر لە دوای خۆیەوە جێهێشتبوو. تا ئەوەی گەیشتە خاڵێك کە ئیدی حەزرەتی جوبرەئیل پێی فەرموو: "بڕۆ ئەی موحەممەد! ئیتر لێرە بەدواوە خۆت شاسواری ئەم مەیدانەیت. گەر تۆزقاڵێکی تر بێمە پێش، نووری عەزەمەت و گەورەیی پەروەردگار دەمسووتێنێت."

بەمە دەوترێت تەنگ پێ هەڵچنینی سنووری بازنەی "ئیمکان"، بگرە تێپەڕاندنیشی. ئەم قسانە، هەردەم "ئۆگێست کۆمت"م (Auguste Comte) بیر دەخەنەوە. فەیلەسووفی فەرەنسی، ئۆگێست کۆمت (١٧٩٨-١٨٥٧)، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی پۆزیتیڤیزم[١]. کۆمت سەرتاپای ژیانی لە دژایەتیکردنی ئاییندا بەسەر بردووە. چونکە ئەو لای وابوو هەر شتێك نەچێتە ناو بازنەی ئەزموونە زانستییەکانەوە و، لە

---

١ Positivism: ئەو ڕێچکە فەلسەفییە ماددییەیە کە پێی وایە سەلماندنی حەقیقەت تەنها لە ڕێگەی ئەزموون و بینینەوە دەبێت. بەمەش، شێواز و گۆڕەپانی سەلماندنی حەقیقەتی تەنها لە شتانی ماددیدا بەرتەسك کردووەتەوە.

بیژنگی پێوەرە زانستییەکان نەدرێت، جگە لە سەفسەتە چی دی نیە. کەچی لە کتێبی (تأریخ المراد)دا چاومان بەم بەسەرهاتە دەکەوێت:

کۆمت لە سەردانێکیدا بۆ ئەندەلوس، چاوی بە شوێنەواری هونەرە ئیسلامییەکان دەکەوێت و تووشی سەرسامییەکی زۆر دەبێت. بەدەست هێنانی زانیاری دەربارەی ئەم ئایینەی کە ئەم هەموو هەست ناسکی و شاکارەی بەرهەم هێناوە، دەبێتە ماخۆلانی سەری. هەر بۆ ئەم مەبەستە بەرۆکی چەند کەسێك دەگرێت و پرسیاریان لێدەکات... لە ناو ئەو وەڵامانەدا کە دەستی دەکەوێت، نەخوێندەوار بوونی سەروەرمان لە هەمووی زیاتر سەرسامی دەکات. هەرچییەك دەکات باوەڕ ناکات. بۆیە دەچێت بۆ ڕۆما و چاوی بە پاپای نۆیەم دەکەوێت.، سوێندی دەدات کە وەڵامێکی ڕاستی بداتەوە. جا کاتێك پاپا قسەکانی پشتڕاست دەکاتەوە، کاکی فەیلەسووف خۆی پێناگیرێت و، دەڵێ: "ڕاستە موحەممەد خوا نییە، بەڵام مرۆڤیش نییە..."

مەگەر بوصەیری خۆشمان ناڵێت:

فَمَبْلَغُ الْعِلْمِ فِيهِ أَنَّهُ بَشَرٌ          وَ أَنَّهُ خَيْرُ خَلْقِ اللهِ كُلِّهِمِ

"کۆتا خاڵ کە زانست پێی گەیشتووە سەبارەت بەو زاتە، ئەوەیە کە ئەو مرۆڤ بووە. بەڵام چ مرۆڤێك؟ باشترین و بەڕێزترینی تەواوی خەلقی خوای گەورەیە."

واتە، ڕاستە ئەو لە ئامینە لەدایك بووە و، کوڕی عەبدوڵڵا و کوڕەزای عەبدولموتەلیبە. بەڵێ، ئەویش وەك هەر مرۆڤێکی تر، دایك و باوکێك و لایەنێکی ماددی هەیە، بەڵام هەرگیز ناگونجێت لەم ڕووە ماددییەوە بۆی بڕوانین و لێی تێبگەین. ئەو تاوسێکە بە ئاسمانی پێغەمبەرایەتیدا پەرواز دەکات. هەرچی قسەکانی ئێمەشە بە بەچواردەوری ئەو هێلکەیەدا دەسووڕێنەوە کە ئەو تاوسەی لێبووە. ئەوەتا لە میعراجدا گەیشتە خاڵێك، ئاسۆی دەرکی ئێمە زۆر لەوە کۆڵەوارترە هەر بشزانێت پێی مویارەکی لە کوێ داناوە. چونکە ئەمە بابەتێك نییە ئێمە بتوانین بە هەست و ئیدراکی مرۆڤانەی خۆمان پەیی پێ بەرین.

ئیدی هەروەك دەبینین، تەبلیغ فەرمانبەرییەکی ئەوەندە پێویست و گرنگە، ئەوەتا

پەروەردگاری مەزن بەندە نزیك و خۆشەویستەکەی خۆیی بەم فەرمانبەرییە ڕاسپاردووە و، ئاگاداری کردووەتەوە کە ئەگەر ئەرکی تەبلیغ بەجێ نەگەیەنێ، ئەوا بە تەواوی مانا فەرمانبەریی ریسالەت و پێغەمبەرایەتیشی بەجێ نەهێناوە.

کەوابێ، گرنگترین و پێویستترین فەرمانبەریی سەرشانی ئێمەی ئوممەتیش هەر تەبلیغە. بیرمان نەچێت کە سەرلەنوێ ژیاندنەوەی تێکڕای مرۆڤایەتی لە هەموو کایەکانی ژیاندا، تەنها و تەنها لە ڕێگەی هەناسە ژیانبەخشەکانی حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) و، پشتبەستن بەو کەسانە دەبێت کە هەناسەکانی ئەو پێغەمبەرە نازدارە گیانی بە بەردا کردوونەتەوە.

## ی) چەند تایبەتمەندییەکی گرنگی تەبلیغ

چەند تایبەتمەندییەکی گرنگ هەیە لە تەبلیغدا، کە پێشتر تیشکمان خستنە سەر هەندێکیان. با ئێستاش بە باسکردنی پوختەیەك سەبارەت بەوانە و تیشك خستنە سەر ئەو بابەتانەش کە لێیان نەدواوین، بابەتی تەبلیغ بە پایان بگەیەنین.

یەکەم: تەبلیغ دیوێکی هەیە کە بەسەر فەتانەتدا دەڕوانێت، دەتوانین ناویشی لێ بنێین "مەنتیقی پێغەمبەرانە".

دووەم: دەبێت ئەو شتانەی تەبلیغکار خەڵکی بۆ بانگ دەکات، سەرەتا لە ژیانی خۆیدا بەجوانی ڕەنگی دابێتەوە. ئەو شتانەی باسیان دەکات، دەبێ ئەو شتانە بن کە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیەوە نمونەیان گرتبێت. بەڵێ، پێویستە بانگخواز قسەکانی ئاوێنەی ژیانی بێ و خەڵکی بۆ ئەو شتانە بانگ بکات کە لە ژیانی خۆیدا بە کردەیی بوونیان هەیە. نەوەك بەردەوام باس لە شتانێك بکات کە پێویستە لە ژیانی کەسانی تردا هەبێ.

سێیەم: دەبێت دەرەنجامی چاوەڕوانکراو لە تەبلیغ، تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە بێت. تەنانەت بەهەشتیش نابێت وەك ئامانجی تەبلیغ تەماشا بکرێت. ئەمەش بە واتای فیداکاری دێت لە تەواوی فەیزە ماددی و مەعنەوییەکان.

## ١. باش ناسینی تاکەکان

یەکەم: بریتییە لە فەتانەتی ناوەکی؛ ڕوویەکی تری تەبلیغی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەو ڕووەیە کە بەسەر فەتانەت (الفِطْنَة)دا دەڕوانێت. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە فەتانەت تەنها بریتی نییە لە کایەیەکی مەنتیقی وشك. بەڵکو بریتییە لە پرۆسەیەکی مەعنەوی وەها، کە لە ڕووکەشەوە بۆ قوڵایی ناخ و، لە دنیاوە بۆ دوا ڕۆژ درێژ دەبێتەوە. مرۆڤ وەك چۆن خاوەن ڕەهەندێکی عەقڵانییە، وەهاش خاوەنی ڕەهەندی هەست و سۆزە. ئەوانەی تەنها ڕوو بە عەقڵ و مەنتیقی مرۆڤەکان دەدوێن و، ژیرییان بە تەنها لێکدەرەوەی تەواوی کایەکانی ژیان قبووڵ کردووە، دەبینی توشی پەرێشانی و بێچارەیی دەبن کاتێك ڕووبەڕووی بچووکترین کەلێن دەبنەوە لە دنیای هەست و سۆزدا. لەولاشەوە، ئەوانەی بەتەنیا لە ڕوانگەی هەست و سۆزەوە هەڵسەنگاندن دەکەن، دەبینی بەرامبەر لێکدانەوە عەقڵییەکان توشی نشوست دێن. بەڵام ئەوە تەنها حەزرەتی موحەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە لە یەك کاتدا لەگەڵ موشاهەدە و موحاکەمە و هەستەوەرە ناوەکییەکاندا دەدوێ و، لە چوارچێوەی بانگەوازەکەیدا جێی کردوونەتەوە. مامەڵەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) سەرەتا لە ڕوانگەی ئەو شتانەوە بوو کە بەچاو دەبینران. ئەوجا نموونەی لەسەر دەهێنانەوە و لەم ڕێگەیەوە ڕێچکەی بەرەو ڕۆحەکان لێدەدا.

عەقڵی بەکار دەهێنا و عەقڵی بەرامبەرەکەشی دەخستە کار. گرنگی بە داوەری ژیری دەدا و بە شێوەیەکیش ویژدانەکانی دەدواند، هەر کەس دەنگی ئەوی لە ویژدانیدا ببیستایە، بە جارێك بازی دەدایە پێش ئەوانەشەوە کە دەیانویست تەنها لە ڕێی ویژدانەوە بگەن بە حەقیقەت و، خۆی لە پاڵ کانیاوە سازگارەکەی حەقیقەتدا دەبینیەوە. کەسانێکی وەك پاسکال و بێرگسۆن کە لە ڕێی حەدس[1] (intuition)ەوە هەوڵی دۆزینەوەی خوایان داوە، وێڕای ئەوەی کە ئەم بابەتە کایەی پسپۆڕیی خۆشیانە، کەچی هێشتا بە چەندین قۆناغ لە دوای ئەو هاوەڵانەوەن کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَ

١ حەدس: تێپەڕینێکی خێرایە لە بەڵگەوە بۆ ئەنجام. یاخود ئەو زانستەیە کە بەبێ بیرکردنەوەی چڕ و پێویستی بە بەڵگەی زۆر بەدەست دێت.

سَلَام) هەناسەی ژیانی بەبەردا کردوون و پێی گەیاندوون. ئەوە با لەولاوە بوەستێت کە بەراورد کردنیان لە بواری فەزیلەتی ڕەها و گشتییدا، تەنانەت لەگەڵ بچووکترین ئیمانداریشدا هەرگیز نەبووە و ناشبێت.

بەڵێ، هەروەك چۆن لە هیچ مەیدانێکدا هەرگیزاو هەرگیز ناگەینەوە بە جێپێکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، لە بواری فەتانەتیشدا بەهەمان شێوەیە. سەرەتا بە پێشچاوخستنی ڕاستیی شتەکان، نەیارەکانی دەدا بەچۆکدا... ئەوەتا، بە پەنجە ئاماژەی بۆ بتەکان دەکرد و عەقڵی دەدواندن و، دەیوت: "ئێوە چ ئاواتێکتان بەو دار و بەرد و خۆڵەوە بەستووە؟ دواتریش بە ماهیەتە بێ وێنەکەی، یان بە پەرجوو (موعجیزە) یەك، دەستی ئەو کەسەی دەگرت کە کەمێك پێشتر عەقڵی دواندبوو و، بەرەو هەرێمی دڵ کێشی دەکرد. دواتریش لە سایەی ڕەنگ گرتەیی بە ڕەنگی حوزووری نەبەوی، قۆناغێکی تر بەرزی دەکردەوە. تا ئەوەی ئوخرەویی بوون لەسەرتاپای گیانیدا دەنەخشا.

با سەیری ڕۆحانی (السير الروحاني)ی حەزرەتی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بە نموونە بهێنینەوە: پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم شێوەیە لەگەڵی دواوە: "بەلامەوە سەیر بوو چۆن کەسێکی خاوەن عەقڵی وەك تۆ لە دەرەوەی بازنەی هیدایەتدا ژیان دەگوزەرێنی؟!! هەرگیز نەدەچووە عەقڵمەوە کە مرۆڤێکی وەك تۆ چاوەڕێی شتێك لەو دار و بەرد و خۆڵە بکات." پێشەکی لەم قسانەدا نرخاندن و ڕێزلێنانی حەزرەتی عومەرمان بەرچاو دەکەوێت. ئەمە سەرباری ئەوەی کە مامەڵەیەکی ڕێزدارانەش لەگەڵ مەنتیق و ژیریدا کراوە. لەم ڕێیەشەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) لە ڕووە مەنتیقییەکەوە بە تەواوی مانا حەزرەتی عومەری بە دەست هێناوە. بەدواشیدا بە شێوازە بێ وێنەکەی خۆی، کە لەوەتەی هەبووە کانگای متمانە و دڵنیایی بووە، چووەتە دڵییەوە. لە قۆناغی سێهەمیشدا قووڵی بەندایەتییەکەی پێغەمبەری خوا ئەوی گەیاندە ئاستێك، ئەو عومەرەی جاران وشترانی دەنایە ژێر باڵی و دەیدان بە زەویدا، وا ئێستا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەئەدەبەوە چۆکی داداوە و، بۆ نواندنی ڕێزی شایان بەرامبەر ئەو سەرورە، وەك شۆڕەبی خۆی چەماندووتەوە.

بەر لە کۆتایی هاتنی ئەم بڕگەیە، نموونەیەکی بەرجەستە دەهێنینەوە و دەچینە سەر لایەنەکانی تر:

گەنجێك دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّیَاللّٰهُعَلَیْهِوَسَلَّمْ)، هاوەڵان بە ڕاشکاوی ناوی ئەم گەنجەیان نەبردووە، بەڵام بە یەکخستنی چەند ڕیوایەتێك، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو گەنجە جولەیبیب بووە (رَضِيَاللّٰهُعَنْهُ). ئەم گەنجە دێتە حوزووری پێغەمبەری خوا و، دەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خوا، مۆڵەتم بدە زینا بکەم! چونکە بەڕاستی توانای خۆ گرتنەوەم نییە." بێگومان کاردانەوەی ئامادەبووانی مەجلیس جۆراوجۆر دەبێت. هی وایان تیابوو دەیویست دەمی بگرێت و ئاماژەی ئەوەی بۆ بکات کە: "تۆ چۆن لە بەرامبەر پێغەمبەری خوادا وەها قسەیەك دەکەیت؟!" لەولاشەوە یەکێکی تریان چمکی کراسەکەی بەری ڕادەکێشا و، یەکێکی تریش گوڕی دەخواردەوە لێی بدات. لەم نێوەندەدا تەنها کەسێك کە دەنگ ناکات و چاو لە هەموو شتێك دەپۆشێت، پێغەمبەری بە شان و شەوکەت و کانیاوەکەی شەفەقەت و بەزەیی دەبێت. گوێی لێ دەگرێ، دواتر بانگی دەکاتە لای خۆی و دای دەنیشێنێ. خۆ هەر تەنیا ئەم تۆزە مامەڵەیە بەس بوو بۆ ئەوەی گەنجەکە مەست بکات، ئینجا لێی دەپرسێت:

- ئایا ڕازی دەبوویت گەر کەسێك هەمان کاری لەگەڵ دایکت ئەنجام بدایە؟

- دایك و باوکم بە فیدات بن پێغەمبەری خوا، نەخێر هەرگیز ڕازی نەدەبووم.

- دەی هیچ کەسیش ڕازی نییە کاری وا لەگەڵ دایکیدا بکرێت.

ئەی ئەگەر کچێکت هەبوایە، ڕازی دەبوویت کاری وای لەگەڵ بکرێت؟!

- گیانم بە فیدات پێغەمبەری خودا، نەخێر هەرگیز ڕازی نەدەبووم.

- دەی هیچ کەسێکیش بە کارێکی وەها ڕازی نابێت بۆ کچەکەی.

ئەی ڕازی دەبوویت کارێکی وەها لەگەڵ پورت ئەنجام بدرێت؟!

- نەخێر پێغەمبەری خودا، ڕازی نەدەبووم.

-ئەی ڕازی دەبوویت کەسێك لەگەڵ خوشکەکەت ئەو کارە ئەنجام بدات؟!

-نەخێر، هەرگیز ڕازی نەدەبووم.

وە کۆتا قسەی پێغەمبەرمان:

- دە کەواتە باش بزانە کە هیچ کەسێکیش نییە ڕازی بێت بەوەی کارێکی وا لەگەڵ دایکی، کچی، پوری یان خوشکی ئەنجام بدرێت.

بەڵێ، بەم گفتوگۆ مەنتیقییە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) ئەم گەنجەی خستە مشتییەوە و، دەتوت لەسەر تەختەی مردووشۆر پاڵی خستووە و وەك مردووی لێ کردووە. ئیتر هەر شۆردنی مابوو. ئەوجا دەستی موبارەکی دەخاتە سەر سنگی گەنجەکە و، ئەم دوعایەی بۆ دەکات: اللّٰهُمَ اغْفِرْ ذَنْبَهُ وَ طَهِّرْ قَلْبَهُ وَ حَصِّنْ فَرْجَهُ "خوایە لە گوناهی خۆش بە، دڵی پاك بکەرەوە و داوێنی پارێزراو بکە!"[1]

لە پاش ئەم دوعایەوە جولەیبیب بوو بە نموونەی داوێن پاکی و عیففەت. بەڵام لەبەر شێوازی ژیانی پێشووی، کەس کچی خۆی نەدەدایە. تا ئەوەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةِوَسَلَام) میانگیری کرد و لە کۆتاییدا جولەیبیبیش خێزانی پێك هێنا.[2] دوای هاوسەرگیرییەکەشی، لەیەکەم غەزادا شەهید دەبێت. دوای تەواو بوونی غەزاکە، پێغەمبەری خوا لە هاوەڵان دەپرسێت: "کەستان کەم نییە؟" ئەوانیش دەڵێن: "نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، کەسمان کەم نییە." بەدوای ئەم وەڵامەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَصَحبِهِوَسَلَّمْ) دەفەرموێ: "بەڵام من کەسێکم دیار نییە!" ئینجا دەگەڕێت تا جولەیبیب دەدۆزێتەوە. دەبینن حەوت کەسی کوشتووە و خۆشی شەهیدکراوە. پێغەمبەر (صَلَوَاتُاللهِوَسَلَامُهُعَلَيْهِ) سەری جولەیبیب دەنێتە سەر ڕانی و، دەفەرمووێت: هَذا مِنِّي وَانَا مِنْهُ "ئەم جولەیبیبە لە منە و، منیش لەوم." ئیتر بەم شێوەیە جولەیبیب بەدەم گەیشتن بەم پایە بڵندەوە، بەرەو ئاسۆی ڕۆحی لە شەقەی باڵ دەدات.[3]

بەڵێ، فەتانەتی هەرە مەزنی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَفْضَلُ الصَّلَاةِوَأَتَمُّالتَّسلِيم) بوو کە گەنجێکی زیناکاری لەو ماوە کەمەدا بەرەو ئاستێکی وا بەرز کردەوە کە عەقڵ

١ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٦/٥؛ الطبراني، المجمع الكبير ١٦٢/٨، ١٨٣.
٢ أحمد بن حنبل، المسند ٤٢٢/٤.
٣ مسلم، فضائل الصحابة ١٣١؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤٢٠/٤، ٤٢١، ٤٢٥.

لە بەرامبەریدا دۆش دابمێنێت. جا با ئێستا تەواوی پەروەرشیار و پێگەیەنەرانی دنیا کۆببنەوە و برۆنە نیوە دورگەی عەرەبی، بزانین داخۆ دەتوانن ئەو پەروەردە و کامڵ بوونە ئەخلاقییەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بەرپای کرد، پەروەردە و کامڵ بوونی ئەخلاقی بە لایەك، بگرە تەنها یەك دوو بنەمای ئەخلاقی بچەسپێنن؟

واقیعی حاڵ، بە هەموو ڕوونییەکییەوە پێمان دەڵێت کە وەڵامێکی ئەرێنیمان دەست ناکەوێت.

بەڵێ، ئەو سەردەمەی پێغەمبەری خوای تێدا دەژیا، سەردەمێك بوو هەموو جۆرەکانی بێ ڕەوشتی لە مرۆڤی ئەو ڕۆژگارەدا وەك فیترەتی لێهاتبوو. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُوَالسَّلَام) تەنیا بەوەوە نەوەستا کە بێخی ئەو ڕەوشتە خراپانە لە دەروونیاندا دەربێنێت، بەڵکو لەهەمان کاتدا، بە جوانترینی خووڕەوشتەکانیش ڕازاندنیەوە. بەجۆرێك، مرۆڤایەتی نە لە پێش ئەوان ڕەوشتێکی لەو جۆرە و مرۆڤگەلێکی بەرەوشتی لەوجۆرەی دیوە، نە لەپاش ئەوانیش. جا وەك چۆن مێژووی ئیسلامی بە هەزاران نموونەیەوە ڕاستگۆترین شاهیدی ئەم ڕاستییەیە، هەر بەو جۆرەش، بێ ئاکامی هەموو ئەو هەوڵ و کۆششەی لەمڕۆدا دەدرێت بۆ قەڵاچۆکردنی هەندێك خووی خراپ، سەلماندنێکی تری ئەم ڕاستییە حاشاهەڵنەگرەیە.

ئەمەش نموونەیەك: ئەوەتا دەوڵەتێك بەتەواوی مەزنیی خۆیەوە، هەڵمەتی بەرەنگاری دژ بە جگەرە ڕادەگەیەنێت. وەزارەتەکان بە چەندین پرۆژەوە دێنە مەیدان، بە سەدان زانا بە شێوازی جۆراوجۆر لەسەر ئەم بابەتە کۆنفرانس و مێزگرد سازدەکەن، چەندین کتێبی لەسەر دەنووسرێت و لە ڕێگەی جۆرەها دروشمەوە وەك بڵێی جەنگی نیشتمانی دژ بە جگەرە ڕادەگەیەنرێت، کەچی هێشتاش ئەنجام هەر سفرە و هیچ بە دەستەوە.

ئینجا ئێستا ڕووتان وەربچەرخێنن و سەرنجێکی ئەو کۆمەڵگایە بدەن کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَلْفُ صَلَاةٍوَسَلَام) پێی گەیاندووە. بە چاوی خۆتان ببینن کە چۆن هەرچی دەفەرموێت، یەکسەر دەکەوێتە بواری جێبەجێ کردنەوە. فەرموون ئێوەو ئەم نموونەیە:

حەزرەتی ئەنەس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) بۆمان دەگێڕێتەوە: "لە ماڵی تەڵحە بادەی شەرابنۆشانم پڕدەکرد و ساقییەتیم دەکرد. لەو کاتەدا لە دەرەوە دەنگێك هات. دەنگەکە دەیوت: 'ئاگادار بن، مەی قەدەغەکرا.' هەر بە بیستنی ئەمە، ئەوەی کاسەی مەیی بە دەستەوە بوو داینا، ئەوەشی دەمی بۆ بردبوو، تفییەوە و هەموو بەجارێ هەرچییەك لە کوپەڵەکانیاندا هەبوو ڕژاندیانە کۆڵان. بە جۆرێك، بە درێژایی چەندین ڕۆژ شەراب لە کۆڵانەکانی مەدینەدا جۆگەلەی بەستبوو..."[1]

بەڵێ، ئەو پێغەمبەرە مەزنە (عَلَيْهِ أَكْمَلُ التَّحَايَا) هەموو ئەم کارانەی بە سەرکەوتوویی ئەنجامداوە. ئەوانەش کە چاویان بەرایی نایەت، نیوە دورگەی عەرەبییان پیشان دەدەین و پێیان دەڵێین: "فەرموون ئێوە لە ملیۆنێکدا یەکی ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەنجامی داوە! هەرگیز بۆتان ئەنجام نادرێت."

## ٢. بەکردەوە کردنی ئەو شتانەی بانگەوازیان بۆ دەکرێت

دووەم: یەکێکی تر لەو بزوێنەرانەی کە حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە تەبلیغدا بەکاری دەهێنا، گونجاویی تەواوی ژیانی بوو لەگەڵ ئەو مەقامەی نمایندەیی دەکرد. بەڵێ، بە شێوەیەکی وا گوفتار و قسەکانی بەکردە دەکرد، هەرکەسێ تەماشای بکردایە، بێ ئەوەی پێویستی بە هیچ بەڵگەیەکی تر بێ، ڕاستەوخۆ باوەڕی بە خوای گەورە دەهێنا. تەنانەت زۆر جار تەنها بینینێکی بەس بوو بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنی کە پێغەمبەری خوایە. عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) چەند جوان فەرموویەتی:

لَوْ لَمْ تَكُنْ فِيهِ آيَاتٌ مُبَيِّنَةٌ      لَكَانَ مَنْظَرُهُ يُنَبِّئُكَ بِالخَبَرِ

"خۆ ئەگەر ئەو بەڵگە و نیشانە ڕوون و ئاشکرایانەش نەبووایە کە لەودا هەبوون، ئەوا هەر دیمەنەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنیت."[2]

ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنا و دڵبەستەی بوون و بە "یا رسول الله" بانگیان دەکرد،

---

١ بخاري، المظالم ٢١، تفسير (٥) ١٠؛ مسلم، الأشربة ٣-٩.
٢ قاضي عياض، الشفاء ٢٤٩/١.

کەسانێک بوون دوای خۆی جڵەوی بەڕێوەبردنی دنیایان گرتە دەست. واتە تەنها لای سێ چوار کەسی ساویلکەی سادە خۆی پەسەند نەکردبوو. بەڵکو لەنێو ئەوانەدا کە پێی گەیاندن، ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان و عەلییەکی تێدابوو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ أَلْفَ أَلْفِ مَرَّاتٍ) کە هەر یەکەیان بەتەنیا خۆی توانای بەڕێوەبردنی هەموو جیهانی هەبوو. هیچ کامیشیان ئەوەندە لاواز نەبووە هەروا بەئاسانی تەسلیم بێت و مل بۆ فەرمانی یەکێکی تر کەچ بکات. ئەگەر ئەو زاتە پێغەمبەری خوا نەبوایە، دڵنیابن هیچ کامیان تەسلیمی نەدەبوون. جا ئەگەر کەسایەتییەکی خاوەن بەسیرەتی وەك حەزرەتی عەلی (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کە لە پلەی "حق اليقين"ی ئیماندا بووە و فەرموویەتی: "ئەگەر پەردەش لابدرایە، یەقینم زیادی نەدەکرد."[1] پێغەمبەرایەتیی ئەوی قبووڵ کردبێت، ئەوا ئەمە بەتەنها بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەکی درەخشان لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی.

هەر حاڵێکی بگریت وەها ڕەنگی دوارۆژی گرتبوو، ئەوەتا زانایەکی جوولەکەی وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، بەیەکجار بینین ئیمانی هێنا و، وتی: "ئەم سیمایە، سیمای درۆزن نییە. خاوەنی ئەم سیمایە هەر دەبێت پێغەمبەری خوا بێت."[2]

بەڵێ وایە، تەنها بینینی بەس بوو بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بێنێت. ئەو کەسانەی خۆیان و ژیانیان تەرخان کردووە لە پێناو گەیاندنی حەق و حەقیقەت بە کەسانی دی، لە هەموو کەس زیاتر دەرك بە دژواری و ناڕەحەتی وەها قبووڵ کردنێك دەکەن. ئەوەتا زۆرێك لەوانە بەدرێژایی تەمەنێك ڕەنج دەکێشن و کۆشش دەکەن، کەچی ناتوانن کاریگەرییان لەسەر هەشت نۆ کەس هەبێت و لە هەواری ڕۆحیاندا دەوارێك هەڵبدەن. ئەوجا تەماشایەکی پێغەمبەری خوا بکەن. مەگەر کەسێك هەیە لە ئێستادا لەنێو دڵی زیاد لە ملیارێك مرۆڤدا تەختی ئەوینی دانابێت؟ ئایا کەسێکی تر شك دەبەن ڕۆژی پێنج جار، بە ئاوازێك کە تەواوی دنیا بێنێتە جۆش و خرۆش، ناوی لە منارەکانەوە شاباڵ بگرێ؟!!

کەوابێ مرۆڤایەتی ئەو سەروەرەی خۆش دەوێت و ڕۆژی چەند جارێکیش وابەستەیی خۆی بۆ دووپات دەکاتەوە. ئەمە سەرباری هەموو ئەو کەس و سیستەمە ناحەزانەش

---

١ علي القاري، المصنوع ١٤٩.

٢ ترمذي، قيامة ٤٢؛ إبن ماجة، إقامة الصلاة ١٧٤.

که چاویان پێ هەڵنایە. بەڵی، سەرەڕای هەموو شتێك، حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەردەوامە لە ڕووناك کردنەوەی دڵان بە نووری خۆشەویستی خۆی. چونکە ئەو شتانەی خەڵکی بۆ بانگ دەکرد، سەرەتا لە خۆیدا پەیڕەوی دەکرد و هەمیشە نموونەیەکی زیندووی گوفتارەکانی بوو. هەر بۆیە هەرچییەکی فەرمووە، ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەکان جێ هێشتووە و، هەمیشە فەرمایشتەکانی جێبەجێ کراون و لە ڕێیاندا گیان بەختکراوە.

کاتێك مرۆڤەکانی بۆ بەندایەتی و پەرستشی پەروەردگار بانگ دەکرد، خۆی هەردەم لە بەرزترین ئاسۆی بەندایەتیدا، جوانترین تابلۆی بەندایەتی پێشکەش دەکرد.

دایکمان حەزرەتی عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) دەگێڕێتەوە:

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا هاتە لام و، پێی فەرمووم: "ئەی عائیشە، مۆڵەتم دەدەی ئەمشەو لەگەڵ خوای خۆمدا بەسەر بەرم؟" ئەمەی وت و، دەستی کرد بە نوێژ.

ئەو شەوە تا بەرەبەیان ئایەتی ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ . . . ﴾ (آل عمران : ١٩٠) خوێند و فرمێسکی ڕشت. ئەوەندە گریا، ئەگەر بەرماڵەکەی بگوشرایە، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی لێ دەتکا.[١]

هەتاوەکو پێیەکانی دەئاوسان نوێژی دەکرد. ڕۆژێکیان ئەوەیان بیر خستەوە کەوا خوای گەورە لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووشی خۆشبووە و، وتیان: "بۆچی هێندە خۆت دەخەیتە نارەحەتییەوە؟" ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً "ئەی بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم؟"[٢] بەڵێ، دەرگای شوکری بە ڕوودا واڵا کرابوو. ئیدی هەموو ئەم ڕەنج و کۆششەی لەبەر ئەوە بوو.

دووبارە دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بۆمان دەگێڕێتەوە: لە نیوەشەودا بەخەبەر هاتم و دیتم کەوا پێغەمبەری خوا لە لام نەماوە. دڵم خورپەیەکی کرد و، وتم: "تۆ بڵێی چووبێت بۆ لای یەکێك لە خێزانەکانی تری؟!" وەختێ ویستم

١ إبن حبان، الصحيح ٣٨٦/٢.
٢ بخاري، تهجد ٦؛ مسلم، صفات المنافقين ٧٩-٨١.

له جێ ڕاپەڕم، دەستم بەر قاچی کەوت. کە سەرنجمدا، بۆم دەرکەوت لە سوجدەدایە و سەرگەرمی نزا و پاڕانەوەیە. ئیتر منیش گوێم دایە دوعا و پاڕانەوەکانی. ئەم دوعایەی دەخوێند: سُبْحَانَكَ وَ بِحَمْدِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ "پەروەردگارا! تۆ لە هەموو ناتەواوی و کەموکوڕییەك پاك و بێگەردیت، سوپاسگوزارم. هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تۆ."[1]

خۆ ئەگەر بیویستایە، وەك پاشایان دەیخوارد و دەیخواردەوە و کەیفی لە ژیان دەبرد. جا هەر ئەو کاتەی لە مەککە بوو - بە مەرجی واز هێنان لە بانگەوازەکەی - ژیانێکی لەو جۆرەیان خستە بەردەمی،[2] بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە پێناو بانگەوازەکەیدا ژیانی چەرمەسەریی هەڵبژارد بەسەر ژیانی ئاسودەیی دنیایدا. چونکە بەڕاستی ئەو وەفاداری دەرگانەی حەق تەعالا بوو. ڕۆژێ برسی دەبوو و پەنای بۆ خوا دەبرد، ڕۆژێکی تر تێر دەبوو و شوکرانەی دەبژارد.[3] بوونە پێغەمبەرێکی بەندەی بەسەر پێغەمبەرێکی پادشادا پەسەند کرد.[4] هەر ئەم سادەییەشی گەورەترین ئەفسوونی کەمەندکێشی کۆمەڵانی دەوری بوو.

هەرچەندە حەزرەتی عومەر (رَضِيَاللهُعَنْهُ) خۆشی ژیانێکی سادەی بەسەر دەبرد، کەچی ژیانی پێغەمبەری خوا تەنانەت ئاوی لە چاوی ئەویش دەهێنا. ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) لێی پرسی: "عومەر بۆ دەگریت؟" حەزرەتی عومەر لە وەڵامدا فەرمووی: "یا رسول الله، پاشاکان لە سەر دۆشەکی پەڕ دەحەوێنەوە، کەچی تۆ لەسەر پارچە حەسیرێك دەنویت. کاتێکیش هەڵدەستیت، جێی حەسیرەکە لە سەر لاشەت دەرچووە. لە کاتێکدا تۆ پێغەمبەری خوایت و لە هەمووان زیاتر شایستەی ژیانێکی ئاسوودەیت." پێغەمبەر (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَصَحبِهِوَسَلَّمْ) لە وەڵامدا پێی دەفەرموێ: أَمَا تَرْضَىَ أَنْ تَكُونَ لَهُمُ الدُّنْيا وَ لَنَا الآخِرَةَ؟ "مەگەر ڕازی نابیت دنیا بۆ ئەوان بێت و پاشەڕۆژیش بۆ ئێمە؟!"[5]

---

١ مسلم، صلاة ٢٢٢؛ ترمذي، دعوات ٧٥؛ أبو داود، صلاة ١٤٧.
٢ إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٦٢-٦٣.
٣ ترمذي، زهد ٣٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٤/٥.
٤ أحمد بن حنبل، المسند ٢٣١/٢؛ أبو يعلى، مسند ٤٩١/١٠.
٥ بخاري، تفسير (٦٦) ٢؛ مسلم، طلاق ٣١.

بەڵێ، دەبوو جڵەوی دنیا بە دەست موسوڵمانانەوە بێ. پێغەمبەری خواش لە هەموان زیاتر داخوازی ئەمە بوو. بەڵام کاتێك دەهاتە سەر ژیانی کەسیی خۆی، سادەترین ژیانی بەسەر دەبرد. ڕاستتر بڵێین، ئەو بۆ خۆی نەدەژیا، بەڵکو لەپێناو ژیاندنی کەسانی تردا دەژیا. مەگەر نهێنی چوونە نێو تەواوی ڕۆحەکان و، دانانی تەختی خۆشەویستی لە دڵاندا، هەر لەم جۆرە شێوازی نواندنەوە سەرچاوەی نەگرتبوو؟!!

جا بۆیە ئەو کەسانەی بانگەواز و تەبلیغیان کردووەتە ئەرکی خۆیان، لەم هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی پێغەمبەری خوادا وانەگەلێکی زۆر هەن کە لێوەی فێربن. بەڵێ، تاکە مەرجی کارتێکردنی کەسانی تر و، چوونە نێو دڵانەوە، بریتیە لە: شتانێك باس بکە کە لەژیانتدا هەن. ئەو شتانەشی باسیان دەکەی با لە ژیانتدا هەبن. ئەمەش زۆر بەڕوونی لە ژیانی ئەو سەروەرەدا دەبینرێت.

ئەگەر ویستت باس لە گرنگی گریان لە ترسی خوای گەورە بۆ یەکێك بکەیت، ئەوا سەرەتا پێویستە خۆت لە نیوەی شەودا هەستیت و ئەوەندە بگریت هەتا بەرماڵەکەت تەڕ دەبێت. ئیدی ئەوکات، ئەو قسانەی کە لە ڕۆژی ئەو شەوەدا دەیکەیت، بە شێوەیەك کە خۆشت پێی سەرسام دەبیت، شوێنکار لە ناخی بەرامبەرەکەتدا جێ دەهێڵن. وەگەرنا، بەر زللەی ئایەتی: ﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ (الصف : ٢) ''بۆچی شتێك دەڵێن کە خۆتان ئەنجامی نادەن؟!'' دەکەون و، ببڕای ببڕا کاریگەریتان نابێت.

## ٣. چاوەڕێ نەکردنی پاداشت

سێهەم: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە بەرامبەر بەجێ گەیاندنی ئەرکی تەبلیغدا، هیچ داخوازییەکی دنیایی یان ئاخیرەتی نەبووە. ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیەکی ترە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی. چونکە ڕەفتارێکی لەم جۆرە، ڕەفتارێکی پێغەمبەرانەیە و هەر لەو مرۆڤە بژاردانە دەوەشێتەوە. ئەوانەش کە لە پاش خۆی لەسەر ئەم ڕەوشتە ڕەفتار دەکەن، ئا ئەوانە بانگخوازی ڕاستەقینە و مەردی مەیدانی پەیامدارین. قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات بە شوێن کەوتنی ئەو کەسانەی کە چاوەڕوانی هیچ پاداشت و

کرێیەك نین لە هیچ کەسێك و، دەفەرموێت: "شوێن ئەوانە بکەون!"[1]

هەموو سەروەت و سامانەکەی حەزرەتی خەدیجە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) لە ڕێی بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەتدا بە خەرج درا، کەچی پێغەمبەری خوا سەرباری هەموو ئەمانە، داوای هیچ شتێکی لە هیچ کەسێك نەکردووە بۆ خۆی.

حەزرەتی ئەبوبەکر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) هاوڕێی پێغەمبەری خوا و هاودەمی هیجرەتی بوو. ئەوەبوو لو کاتی هیجرەتدا حەزرەتی ئەبوبەکر وشترێکی ئامادە کردبوو بۆ پێغەمبەری خوا، کەچی لەو هەلومەرجە دژوارەدا کە هەموو بیر و هۆشێکی مرۆڤ لای ئەوەیە داخۆ دوژمن بە دوایەوەیەتی یان نا، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەتاوەکو نرخی وشترەکەی نەدا، ئامادە نەبوو سوار ببێ و بکەونە ڕێ.[2]

دەی هەر ئەمە بەس نییە تاوەکو ببێتە بەڵگەی سەلمێنەر لەسەر ئەوەی کە ئەو پێشەوا سەرومرە چەندە لە کارەکانیدا حەسبی بووە؟ ئایا دەکرێت کەسێك کە لە کاتێکی وەها ناسك و هەستیاردا بیری لای بابەتێکی وەها بێت، لە کاتی ئاساییدا لەبیری بکات؟! وا دەزانم تەنها ئەم ڕووداوە وانەیەکی سەروزیاد بێت بۆ بانگخوازان.

ئەبوو هورەیرە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بۆمان دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوام بینی بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد، پرسیم: "ئەی پێغەمبەری خوا نەخۆشیت؟" پێغەمبەری خواش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە وەڵامدا فەرمووی: "نەخێر ئەبوهورەیرە، برسێتی... لەتاو برسێتی هێزی هەستانە سەر پێم نەماوە" ئیتر منیش دەستم کرد بە گریان، ئەوجا فەرمووی: "مەگری، سەختی لێپرسینەوە کەسانی برسی ناگرێتەوە."[3]

جا خۆ برسێتی مەینەتیی بەردەوامی پێغەمبەری خوا بوو...

دیسان جارێکیان لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی شاری مەدینەدا لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر بێ ئەوەی ئاگایان لە یەکتری بێت، بەیەك دەگەن و

١ ﴿ اتَّبِعُوا مَن لَّا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ (يس : ٢١) "شوێن ئەو کەسانە بکەون کە هیچ کرێ و پاداشتێکیان لێتان ناوێت. خۆیشیان لەسەر ڕێی ڕاستن."

٢ بخاري، مناقب الأنصار ٤٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٩٨/٦.

٣ أبو نعيم، حلية الأولياء ١٠٩/٧.

لەیەکتری دەپرسن: "چ شتێك ئێوەی بەم درەنگانەشەوە لە ماڵ هێناوەتە دەر؟" وەڵامی هەرسێکیان هەر هەمان شت بوو: "برسێتی!" بەڵێ، هەرسێکیان هەرچییەکیان هەبوو لەپێناوی خوادا بەخشیبوویان و لەبەر نەبوونی پاروە نانێك کە برسێتییان بشکێنێت، خەو نەچووبووە چاویان و هاتبوونە دەرەوە.[1]

بەڵێ، لەو ڕۆژەدا، ئەم بارە قورسەی تەبلیغ لەسەر دەستی ئەم خاوەن مەچەك و بازووە بەهێزانە بەرز کرایەوە. جا بۆیە لەمرۆشدا، ئەوانەی شانیان داوەتە بەر هەمان بار و، دەستنیشانکراوی هەڵگرتنی هەمان گەنجینەن، هەر چۆنێ بێ دەبێ خاوەنی هەمان هێز و بازوو بن.

ئەوەتا فاطمەی کچی، ئەو فاطیمە نازدارەی کە دەربارەی فەرموویەتی: "فاطیمە پارچەیەکە لە من. هەرکەس دڵی ئەو خۆش بکات، دڵی منی خۆش کردووە. هەرکەسیش ئەو بڕەنجێنێت، منی ڕەنجاندووە."[2] کەسێك نەبوو لە کاروباری ناوماڵدا یارمەتی ئەم کچە نازدارەی بدات. لەبەر ئاو هەڵگرتن و دەستاڕ سووڕاندن، پێستی دەستی ئەستور و قڵیشاو بووبوو و، شانیشی یەك پارچە بووبووە برین. حەزرەتی عەلی زۆر خەمباری حاڵی هاوسەرەکەی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچی لە دەست نەدەهات، دەورانێ بە چەرمەسەری ئەم نازارەوە ژیانیان بردەسەر.

ئاخر ئەو هەڵگری خووڕەوشتی باوکی بوو. ئەم خەسڵەتەش - ئەنجامدانی کاری خۆی بەدەستی خۆی - لە باوکییەوە بە میراتی بۆی مابووەوە. بەڵێ، هەر لە هەستان و دانیشتنیەوە بیگرە، هەموو شتێکی لە باوکی دەچوو.[3]

دوای سەرکەوتن لە یەکێك لە غەزاکاندا، کاتێك غەنیمەت و دیلەکان هێنرانەوە بۆ مەدینە. ئەوەی پێویستییەکی هەبوایە دەهاتە لای سەروەرمان و بە گوێرەی حاڵ و باری خۆی شتێکی وەردەگرت و دەگەڕایەوە. حەزرەتی فاطیمەش بە هاندانی حەزرەتی

---

١ مسلم، الأشربة ١٤٠؛ موطأ، صفات النبي ١٠.

٢ بخاري، فضائل الأصحاب ١٢؛ مسلم، فضائل الصحابة ٩٣-٩٤؛ حاكم، المستدرك ١٧٢/٣. (شێوەی تەواوی حەدیثەکە لە مستدرکەوە وەرگیراوە)

٣ ترمذي، مناقب ٦٠، أبو داود، أدب ١٤٣.

عەلی، بۆ هەمان مەبەست کەوتە ڕێ. بەڵام باوکی ئازیزی لەماڵ نەبوو. بۆیە مەبەستی هاتنەکەی بۆ یەکێك لە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ڕوون کردەوە و گەڕایەوە ماڵەوە.

هەر کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) هەواڵەکەی بیست، بێ وەستان بەرەو ماڵی کچەکەی بەڕێکەوت. لەو کاتەدا حەزرەتی فاطیمە ڕاکشابوو. کاتێك بینی کەوا پێغەمبەری خوا دێتە ژوورەوە ویستی هەستێتەوە، بەڵام ئەم مرۆڤە فیترەتناسە یەکسەر لەسەر کەناری جێگەکەی دانیشت، بە جۆرێك کە حەزرەتی فاطمە هەستی بە ساردی قاچی پێغەمبەر دەکرد لە سینەیدا. ئەوجا فەرمووی: "کچی شیرینم! هەتاوەکو پێداویستییەکانی ئەصحابی صوففە[1] دابین نەکەم، ناتوانم هیچ شتێك بدەم بە تۆ. بەڵام با شتێکی لەمە باشترت فێر بکەم.. وەختێ چوویتە سەر جێی نوستن، سی و سێ جار سُبْحَانَ الله و، سی و سێ جار اَلْحَمْدُ لله و، سی و سێ جار(لە ڕیوایەتێکی تردا سی و چوار جار) اللهُ أَكْبر بخوێنە، ئەمە بۆ ئاخیرەتت زۆر لەو شتە باشترە کە داوای دەکەی."[2] هەروەها ڕۆژێکیان کە دەستبەندێکی ئاڵتوونی لە دەستی حەزرەتی فاطمەدا بینی، یەکسەر ئاگاداری کردەوە و، فەرمووی: "کچم، ئایا پێت خۆشە بڵێن کچەکەی پێغەمبەری خوا دەستبەندێکی لە ئاگر کردووەتە دەست؟ کەواتە خێرا دایبکەنە!" ئەمەی وت و ڕۆیشت. حەزرەتی فاطمەش بەم دەستبەندە، بەندەیەکی کڕی و لە ڕێی خوادا ئازادی کرد. پاش کەمێك بابەتەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە... خۆزگە دەتانزانی پێغەمبەری خوا چەندە بەم هەواڵە دڵخۆش بوو![3]

دیوێکی تری ئەم بەشی سێهەمە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَلْفُ صَلَاةٍوَسَلَام) نەك هەر هیچ داواکارییەکی لە دوێنراوەکانی نەبووە، بەڵکو بەرگەگری کۆڵنەدەری

1 ئەصحابی صوففە: ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەری خوا بوون کە ژیانی خۆیان بۆ خزمەت کردنی قورئان و سوننەت تەرخان کردبوو. لە لایەکی سەرداپۆشراوی بەرکراوەی ناو مزگەوتی نەبەویدا دەمانەوە. ئەم هاوەڵە بەڕێزانە، لە پێناو فێربوون و فێرکردن و بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا دەستبەرداری هەموو بەرژەوەندییەکی خۆیان بووبوون.

2 بخاري، فرض الخمس ٦، دعوات ١١؛ مسلم، ذكر ٨٠؛ ترمذي، دعوات ٢٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/١٠٦-١٠٧.

3 نسائي، زينة ٣٩؛ أحمد بن حنبل، المسند ٥/٢٧٨-٢٧٩.

ئازار و مەینەتییەکانی دەستیشیان بووە. چەندین جار سەرتاپا خۆڵبارانیان کردووە و جگە لە زەینەب و فاطمەی کچی، کەسی تر نەهاتووە بە لایەوە.[1] چەند جاری تریش ڕێی هاتوچۆی دڕکرێژ دەکرا و پێیە پیرۆزەکانی خەڵتانی خوێن دەبوون.

جارێکیان لە کەعبەدا نوێژی دەکرد. کاتێك بێباوەڕان چاویان پێی کەوت، لێی کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە لێدان و ئازاردانی. حەزرەتی ئەبوبەکر کە لەو کاتەدا لەو ناوە بوو، خێرا گەیشتە فریای. ڕووی کردە بێ باوەڕان و، پێی وتن: أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللّٰهُ وَ قَدْ جَاءَكُمْ بِالْبَيَانُ مِنْ رَبِّكُم "ئایا دەتانەوێ پیاوێك بکوژن هەر لەبەر ئەوەی کە دەڵێ پەروەردگارم "الله"یە و لە لایەن پەروەردگاریشتانەوە چەندین بەڵگەی بۆ هێناون؟!" ئیتر بەم شێوەیە گیانی خۆی کردە قەڵغانی پارێزگاریی لە خۆشەویستەکەی.[2] هەموو ئەمانەش بەبێ هیچ وچان و پچڕانێك ڕووی دەدا. بەڵام هیچ کام لەم ڕووداوە گیان هاڕێنانە نەیانتوانی ئەو سەروەرە لە ڕێگەکەی بگەڕێننەوە. بە کچەکەیی دەفەرموو: "مەگری کچم، خوای گەورە باوکت بە زایە نادات."[3] هەرواش بوو، خوای گەورە هیچ کات دەستبەرداری پێغەمبەرەکەی نەبوو. دڵی ملیۆنانی بۆ فەراهەم کرد و بۆ هەمیشە ناوی لە دڵاندا زیندوو ڕاگرت.

با ئێستا بۆ دوا جار چاوێك بە بابەتی تەبلیغدا بخشێنینەوە و بەدوایدا بڕۆینە سەر بەشێکی تر.

وەك لە سەرەتاوە هەوڵماندا ڕوونی بکەینەوە، تەبلیغ مەبەستی بوونی تەواوی پێغەمبەران و پێغەمبەری خۆشمانە. ئەوان بۆ تەبلیغ بەدیهێنراون. کاتێك ئێمە ئەم ئەرکە بەجێ دەهێنین، تەنها وەك لێپرسراوییەك بەو ئەرکە هەڵدەستین. کەچی پێغەمبەران وەك ئامانج و مەبەستی بەدیهاتنیان دەڕواننە تەبلیغ و، بەو ڕۆحیەتەوە ڕایدەپەڕێنن.

---

١ بخاري، صلاة ١٠٩؛ مسلم، جهاد ١٠٧؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٦٨/٣؛ إبن عبدالبر، الإستيعاب ١٣٨١/٣؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٦٤/٢؛ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٥٥٤/١.

٢ بخاري، فضائل الصحابة ٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٠٤/٢، ٢١٨.

٣ طبراني، المجمع الكبير ٢٦٨/٣؛ إبن عبد البر، الإستيعاب ١٣٨١/٣؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٦٤/٢، طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٥٥٤/١.

لەلایەکی ترەوە، هەروەك چۆن هەوڵماندا لەسەروبەندی شیکارکردنی ئەم بابەتەدا، نەخشاویی دروشمی "مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰه" بەسەر دیوی ڕوونی پەیامەکەی پێغەمبەری خواوە (صَلَّىٰاللّٰهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) پیشان بدەین، هەر بەو جۆرەش، کۆمەڵە سەرەداوێکمان خستە بەردەست کە دەکرێ بە هۆیانەوە بگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئەو شێواز و میتۆدانەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَفْضَلُالصَّلَاةِوَأَتَمُّالتَّسْلِيم) لە دەمی بانگەوازکردنیدا بۆ پەیامەکەی بەکاری هێناون، لە ڕوویەکەوە دەبنە بەڵگەی گومانبڕ لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی، لە ڕوویەکی تریشەوە، ڕاستترین و دروستترین نەخشەی ڕێن بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت ئەرکی تەبلیغ بەجێ بێنن.

ئێمە تا سەر ئێسقان بڕوامان وایە کە بێ پەیڕەو کردنی شێوازی تەبلیغی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام)، باس کردن لە سەرکەوتنێکی ڕاستەقینە و بەردەوام نامومکینە. هەزاران نموونەش لە واقیعدا ڕاستیی ئەم قسەیە دووپات دەکەنەوە. لەبەر ئەوە، بە قەناعەتێکی تەواو و ئیمانێکی پڕ یەقینەوە جارێکی تر بیری خۆمان و هەموو لایەکی دەخەینەوە کە: ئەوانەی دەیانەوێت ببنە پێشەوا و ئیمامی خەڵکی، ئەوانەش کەوان لەو مەقامەدا، پێویستە لەسەریان کە گوێڕایەڵی ئیمامی ئەبەدیی ئەم میحرابە، حەزرەتی محمد المصطفى (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) بن. ڕێبەری حەقیقی هەر ئەوە و، ڕێی هیدایەتی ڕاستەقینەش ئەو شاڕێگەیەیە کە ئەو کردوویەتیەوە. ئاخر چونکە ئەو ''هەر لە خۆوە قسە ناکات و هەر چی دەیڵێ لە وەحیەوەیە...''[١]

١ بڕوانە: سورەتی النجم ئایەتی ٣-٤.

## فەتانەت

فەتانەت، تێپەڕاندنی عەقڵە بە عەقڵ. پێشتریش عەرزم کردبوون کە دەکرێت ناوی "مەنتیقی پێغەمبەرانە"شی لێ بنێین. هەروەك چۆن ئەم مەنتیقە ناوی ئەو جۆرە تێڕوانینەیە کە تیایدا: ڕۆح و دڵ و هەست و لایەنە ناسکەکانی مرۆڤ کە بە (لَطَائِف) ناسراون، گشت پێکەوە کارا دەبن و تێکڕا بە ئاڕاستەی ئەو بابەتەی تاووتوێ دەکرێت، دەخرێنە گەڕ.

فەتانەت هەرگیز کایەیەکی وشك و ڕەقی فەلسەفی نییە. هەر بۆیە لکاندنی ئیسلام بە وەها عەقڵ و مەنتیقێکەوە و، بانگەشە کردنی ئەوەی کە "ئیسلام دینێکی عەقڵانییە"، یان "ئیسلام دینێکی مەنتیقییە"، نەك هەر لە بێ ئاگاییەوە بەرامبەر بە ئیسلام سەرچاوەی گرتووە، بەڵکو زیاد لە بێئاگایی، بە هەنگاوی یەکەم دادەنرێت بەرەو شێواندنێکی گەورە. نەخێر، ئیسلام نە دینی عەقڵە و نە دینی مەنتیق، بەڵکو ڕاستە و ڕاست دینی وەحییە.

دژ یەك نەهاتنەوەی کایە ئیسلامییەکان لەگەڵ عەقڵ و مەنتیقدا، لە ڕوویەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم پەیامە لە (عیلمی موحیط)ی خوای گەورەوە هاتووە و، سەرجەم بابەتەکانی بە دەروازەی تەصدیقی عەقڵدا تێپەڕ دەکات. لە ڕوویەکی تریشەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەورەدان (الإحاطة) و، شمولیەتی مەنتیقی پێغەمبەر کە بە جۆرێکی وا ڕاڤەی کردووە، کە هاوشانی ئاسمانی بوونی پەیامەکەی بێت. واتە شتێکی تر نییە جگە لە ئیلهامی پێغەمبەرانە و مەنتیقی پێغەمبەرانە. ئەو مەنتیقەی کە لە ئاستێکی وادا بەدیهێنراوە توانای وەرگرتنی وەحی هەبێت. هەروەها ئەو مەنتیقەی کە کراوەیە بەڕووی هەست و داوەری عەقڵانی و دڵ و لایەنە ناسکەکان و ئەو فەلسەفەیەدا کە بە واتای دانایی (الحِكَمِيَّات) دێت. ئەو، مەنتیقێکی سەروو مەنتیقە، یان بەتەنها دەستەواژەیەك: "فەتانەتی ئەعظەم"ە.

گوزەرکردنی هەر وەحییەك کە لە لایەن خوای گەورەوە دێ، بەم مەنتیقەدا و، ڕەنگدانەوە (أنعكاس)ی تیایدا، پێویستی و ئاتاجییەکە. بەڵام ئەم ئاتاجییە، ئاتاجییەکە

ڕووی لە مرۆڤەکانە. تێگەیشتنی مرۆڤەکان داخوازی وەها پرۆسەیەکە. چونکە ئەگەر لەپێشدا وەحی بە مەنتقێکی وەهادا تێنەپەڕیایە و، لەوێدا ڕێکخستنی بۆ نەکرایە، یاخود گۆڕانکارییەکی چەشنی گۆڕینی تەزووی گۆڕاو (AC) بۆ تەزووی نەگۆڕ (DC)ی بەسەردا نەهاتایە و هەر ڕاستەوخۆ بگەیشتایە بە مرۆڤەکان، ئەوا ئەو کات مرۆڤایەتی لەبەردەم ئەو وەحی و ئیلهامانەدا کە لە فەیزی ئەقدەس و موقەددەسەوە بە "مەشیئەتی عامەوە" دەهاتن، دەسووتا و، دەبووە ڕەژوو و خۆڵەمێش. وەك چۆن ئەگەر خوای باڵادەست پەردە لەسەر سوبوحاتی وەجهی خۆی لابدات تەواوی بونەوەران دەبنە سوتوو، هەمان شتیش لە بابەتی ناردنی وەحیدا ڕاستە.[1]

بەڵێ، ئەوە فەتانەتی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ السَّلام) کە ئەرکی بەرگە هەوا (الغلاف الجوي) دەبینێت لە بەرامبەر ئەیزەکە سووتێنەرەکانی وەحیدا. جا خۆ دینیش هەر ئەمەیە. واتە، دابەزاندنە ئیلاهییەکان بۆ ئاستی ئیدراکی مرۆڤ. ئەوەشی بەم کارە هەڵدەستێت، مەنتیقی تایبەت بە پێغەمبەرانە، واتە فەتانەتە. هەر بۆیە فەتانەت تایبەتمەندییەکە کە پێویستە لە هەموو پێغەمبەرێکدا هەبێت و، مەنتیقێکیشە تەنها لای پێغەمبەران هەیە. لەبەر ئەوە، ئاماژە کردن بۆ ئەم مەنتیقە بە وشەی "بلیمەتی" ڕاست دەرناچێت. واتە مەنتیقی پێغەمبەران لە سەرووی هەموو مەنتیقێکەوەیە، بەمەش دەوترێت فەتانەت.

ئاخر ئەگەر ئەم فەتانەتە لە پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ السَّلام) نەبووایە، چۆن دەگونجا لە بەرامبەر سەرجەم ئەو پرس و بابەتانەی کە ڕووبەڕووی دەبوونەوە، لە ڕەخنە و گومانی نەیارەکانیانەوە بیگرە هەتاکو پرسیاری دۆستەکانیان، ڕاڤە و وەڵامی ساڕێژکەر و گومانبڕ پێشکەش بە دوێنراوەکانیان بکەن؟ بێ گومان وەها ئەگەرێکیش ناڕوونی و ئاڵۆزیی تێگەیشتنی ئایینی لێ دەکەوتەوە. لەوەها بارێکیشدا، واتایەك بۆ داواکارییەکان (التكاليف)ی ئایین نەدەمایەوە. وەختێکیش داواکارییەکانی ئایین خاڵی دەبوون لە واتا و ناوەرۆك، بەدیهێنانی مرۆڤیش واتایەکی بۆ نەدەمایەوە و سەری لە بێ هودەییەوە

---

[1] حِجَابُهُ النُّورُ (و في رواية النَّارُ) لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ.
(مسلم، أيمان ٢٩٣-٢٩٤؛ إبن ماجة، مقدمة ١٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤٠١/٤.)

دەردەچوو. جا بۆیە سەرهەڵنەدانی سەرجەم ئەم دەرەنجامە نەرێنییانە، بەستراوەتەوە بە پڕچەك کردنی پێغەمبەران بە وەها مەنتیقێکی دەراسا و لە عادەت بەدەر. بەڵێ، پێغەمبەران سەرفراز کراون بە فەتانەتێك کە زۆر بەئاسانی بتوانێت بەسەر هەموو کێشە و ناڕەحەتییەکدا زاڵ ببێت.

## أ) فەتانەتی پێغەمبەرمان

با ئەو سەردەمە بێنینە پێش چاومان کە پێغەمبەری خوای (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تێدا ژیاوە: لە کاتێکدا کە هاوەڵان ئەو بابەتە شەرعییانەی کە بۆیان شیکار نەدەکرا دەیانهێنا بۆ لای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) و داوای ڕێگەچارەیان دەکرد، لە هەمان کاتیشدا گومان و دوودڵییەکانی ئەو کەسانەی تازەکی دەیان ویست بێنە ناو ئیسلامەوە، چاوەڕوانی وەڵامیان لە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەکرد. ئینجا با ئەو گومان و دڵەڕاوکێیانەش لەلاوە بوەستن کە پەیڕەوانی ئەهلی کیتاب لە ئەنجامی حەسوودییانەوە بە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، دەستیان دابوویە و بانگەشەیان بۆ دەکرد. جا وەستانەوە لە ڕووی هەموو ئەمانەدا و، وەڵامدانەوەی دروست و گومانبڕ بۆ ئەو هەموو پرسیار و گومانانە، تەنها و تەنها لە ڕێگەی مەنتیقی پێغەمبەرانەوە، واتە لە ڕێی فەتانەتەوە دەکرا بەدیبێ.

بێ لەمەش، ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) فەرمان و ئامۆژگارییەکانی ئاڕاستە دەکردن، وەك یەك نەبوون. بەڵکو لە ئاست و پلەی جیاوازدا بوون. تاقمێك لەمانە پیاوی ئایینیین. ئەم کەسانە بە قوڵاییەکانی ڕۆحدا ڕۆچوون و، لە کڵێسە و خەڵوەتگاکاندا هەر هیچ نەبێت لە چەند مەیدانێکی دیاریکراودا ئەزموونیان پەیدا کردووە و قووڵ بوونەتەوە. تاقمێکی تری دوێنراوەکانی کەسانێکن لە کایە فەلسەفییەکاندا بەتەواوی ڕۆچوون و وەك بڵێی سەرتاپا کەسانێکی مەنتیقی و عەقڵانین.. هەروەها لە نێویاندا بازرگان و ئابووریناسی گەورە و، سەرکردەی سەربازی بەتوانا و، سیاسەتمەداری بلیمەتیش هەبوون.. ئیتر هەروا بڕوات تا دەگاتە ئەو دەشتەکییەی کە ئاستی فەرهەنگی نزیك لە هیچە. هەر یەك لەمانەش بە گوێرەی

خۆی پرسیارانێکی هەیە کە چاوەڕێی وەڵامیان بۆ دەکات. لەوەها بارێکدا دەبوو پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) قسەکانی بە جۆرێك بکات و، ڕوونکردنەوەکانی بە تەرزێك بخاتە ڕوو، کە هەر لە دەشتەکیترین کەسەوە تا ئەوەیان کەوا لە لوتکەدایە، بتوانن بەشی خۆیان لە قسەکانی هەڵبگۆزن. هەروەها پێویست بوو ئەم کارە وەك یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئایینێکی گشتگیری جیهانی، هەتا ڕۆژی قیامەت هەروا بەردەوام بووایە...

مرۆڤ بوونەوەرێکی گۆیایە و توانای بیرکردنەوەی خەڵات کراوە. لەم ڕووەشەوە بووەتە ئاوێنەی درەوشانەوەی یەکێك لە سیفاتەکانی کردگاری مەزن. گەر بیرکردنەوەکان بسپێرین بە گوفتارەکان و، گوفتارەکانیش ڕادەستی نووسراوەکان بکرێن، ئەوکات بەردەوامی و مانەوە بە دەست دێنن. هەر بۆیە ئەو هزر و بیرانەی کە خۆیان لە چوارچێوەی گوفتار و نووسیندا نابیننەوە، ناتوانن لە ژیاندا جێی خۆیان بکەنەوە و لەگەڵ خاوەنەکانیاندا دەنێژرێنە نێو خاکی نەمان و فەوتان. هەروەك چۆن توانست و بەهرەی بیرکردنەوە لوتفێکی گەورەی خواییە، بە هەمان شێوەش، قسەکردن و توانای دەربڕینی ئەو شتەی بیری لێ دەکەینەوە، بەخششێکی مەزنی پەروەردگارە. ئا لەبەر ئەمەیە کە قورئانی پیرۆز لە گۆشەنیگای باسکردنی ڕەحمانییەتی خوای گەورەوە، پاش باسکردنی خەلقی ئادەمیزاد، ڕاستەوخۆ سەرنجەکان ڕادەکێشێت بۆ لای ئەو ڕاستییەی کە خوای گەورە "دەربڕین"ی فێری ئادەمیزاد کردووە. ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴾ (الرحمن : ٤) ”هەر ئەو مرۆڤی فێری دەربڕین کردووە.“ هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە مرۆڤەکان بیردەکەنەوە و دەبێژن.. هەتا دنیاش دنیا بێت، هەروا بەردەوام دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، نە بیرکردنەوە، نە دەربڕین، نە قسەکردنیش هیچیان دواییان نایەت. ئەمەش لە سۆز و میهرەبانیی بێ سنووری پەروەردگارمانەوەیە.

بەڵێ، لەنێو گرۆی ئادەمیدا کەسانێك کە لە فراوانترین و گشتگیرترین ئاستدا بەهرەمەندی درەوشانەوەی ئەم ڕەحمەتە بووبێتن، پێغەمبەرانن، لە سەروو هەمووشیانەوە خاتەمی ئەنبیا، حەزرەتی محمد المصطفى (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). ئەگەر بمانەوێ لەم بەهرەمەندییەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلام)، لە پێشی هەمووشیانەوە پێغەمبەری سەرەوەرمان

(عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) تێبگەین، ئەوا پێویستە لە ڕوانگەی فەتانەتەوە بۆ ئەم بابەتە بڕوانین. وەگەرنا، مەحاڵە بە بێ بوونی فەتانەت ئەم پایەیە بەدەست بێت. کەواتە فەتانەت تایبەتمەندییەکی زۆر گرنگی پێغەمبەرانە.

هەموو پێغەمبەرێك خاوەنی هێزێکی ئیدراکی بەرز و، مەلەکەی گوزارشت کردنە لەو ئیدراکانە. بە جۆرێك، تەنانەت ئاڵۆزترین و گرفتاویترینی بابەتەکان بەوپەڕی ئاسانی چارەسەر دەکەن. کاتێکیش دێن و مەبەستەکانیان ڕوون دەکەنەوە، هەمان شەقڵی سانایی و ئاسانی بە ڕوخساری دەربڕینەکانیانەوە دیارە. هەموو دەربڕینێکیشیان وەك بڵێی "سەهلی مومتەنیع"ە. واتە ئەوانەی گوێیان لە قسەکانیان دەبێ، وا گومان دەبەن کە خۆشیان بە هەمان شێوە بتوانن قسەی لەو جۆرە بکەن. بەڵام کاتێك دەست دەدەنە ئەم کارە، بۆیان دەردەکەوێت کە قسە و گوفتاری هاوشێوەی ئەوان هەرگیز لە توانادا نیە. چونکە هەر لەسەرەتاوە باسکردنی ئەو مەسەلە زۆر گرانانەیان لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئاسان کراوە. بەڵێ، ئەو ڕەونەق و جوانییەی گوڵی پشکوتووی گوفتاری پێغەمبەران هەیەتی، هەرگیز لای کەسانی دی بەدی ناکرێت!..

ئەوەتا هەر کێشەیەك بهاتایەتە بەردەم پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، بێ شك چارەی بۆ دەدۆزرایەوە. جا کێشەکە هەرچەندێکیش سەخت و گیرخواردوو بوایە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەك یەکێك کە تەمەنێك شارەزایی هەبێت، قسەی دەکرد و کێشەکەی چارەسەر دەکرد. هەر لەبەر ئەمەشە کە بێرنارد شۆ ناچاری وتنی ئەم وشانە بووە سەبارەت بە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ): "لەم سەردەمەدا کە کێشەکان بەسەریەکدا کەڵەکە بوون و چاوەڕێی چارەسەرێك دەکەن، لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستمان بە حەزرەتی موحەممەدە، کە بەدەم خواردنی کوپێك قاوەوە تەواوی کێشەکانی چارەسەر دەکرد." ئەوەتا ئەم سەدەیەی تیایدا دەژین، جەنجاڵە بە گرفت و قەیرانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و هەمووشیان چاوەڕێی چارەسەرێکن. جا بۆیە ئەمڕۆ هەموو لایەك بە دۆست و دوژمنیشەوە، بۆیان دەرکەوتووە کە بەبێ گەڕانەوە بۆ کانیاوە سازگار و ڕوونەکەی پەیامی نەبەوی، ئەستەمە شەوگاری گرفت و کێشەکان ڕۆژگاری چارەسەر بەخۆیانەوە ببینن.

قسەگەلی زۆر هەن سەبارەت بە فەتانەتی ئەو سەروەرە. گەر هەموو ئەو قسە و وتانە بدەینە دەم یەك، کتێبێکی قەبارە گەورەی لێ دەردەچێت. بۆیە بە ئاماژەدان بە یەک دووانێکیان هەوڵ دەدەین خاڵی کۆتایی ئەم باسەش دابنێین.

حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کە بە "زاناترینی ئوممەت" و "فەقیهی ئوممەت" ناسراوە، دەفەرموێت: "فەزیلەتدارترین و عاقڵترین کەس لەنێو مرۆڤەکاندا، پێغەمبەرەکەتان حەزرەتی موحەممەدە (عَلَيْهِ أَكْمَلُ التَّحَايَا)."[1]

"وەهبی کوڕی مونەببیهـ"یش کە لە تابعینە و دێڕ بە دێڕ شارەزای تەورات و ئینجیل بووە، سەبارەت بە فەتانەتی پێغەمبەری خوا ئەم چەند دێڕە دەفەرموێت: "ئیدراك و فامی تەواوی مرۆڤەکان لەچاو ئیدراك و فەتانەتی پێغەمبەری خوادا، هەروەك دەنکە لمێکە لەچاو تەواوی لمی دنیادا..."[2]

## ب) چەند نموونەیەک

### نۆژەنکردنەوەی کەعبە

مرۆڤی سەردەمی جاهیلی وەك بلێی ڕۆڵەی فیتنە و ئاشووب گێڕان بوو. دەتوت تاکە ئەرك و مەبەستی بوونیان بریتییە لە نانەوەی ئاشووب و گێچەڵ. گەر سیانیان لە جێیەك کۆ ببونایەتەوە، بێ شك ئاشوبێکیان هەڵدەگیرساند. جا یەکخستنی ئەمانە و پێگەیاندنیان بە جۆرێك کە ببنە مامۆستای تەواوی شارستانیەتەکانی سەر زەوی، موعجیزەیەکە تەنها تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). هەموو ئەمانەشی بەو فەتانەتە ئەنجام دەدا کە ڕەهەندێکی ئاسمانی هەبوو. نۆژەنکردنەوەی کەعبەی پیرۆز بەر یەکێك لە ساڵەکانی پێش پێغەمبەرایەتی دەکەوێت. ئەوەبوو کەعبە بنیاد نرایەوە، بەڵام دانانەوەی بەردەڕەشەکە (الحجر الأسود) لە جێی خۆی، بووبووە جێی ناکۆکی و دوویەرەکی لە نێو هۆزەکاندا. هەموان دەیانویست ئەم شەرەفە بە

١ إبن حجر، المطالب العالية ٢١٤/٣.
٢ قاضي عياض، الشفاء ٦٧/١.

باڵای خۆیاندا ببڕێت. وەك وتمان، حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) ئەودەم هێشتا بە پلەی پێغەمبەرایەتی سەرفراز نەکرابوو. بەڵێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ئەرکە - ئەرکی پێغەمبەرایەتی - هەتا ئەو کاتە چەکەرەی نەکردبوو و نەکەوتبووە میوە بەخشین، بەڵام لە شێوەی تۆوێکدا لە ڕۆحیدا هەر هەبوو. تەنها بەهارێك مابوو بێت و نەش و نما بەو تۆوە بدات.

ئەوەبوو تەم و مژێکی بارگاویی خوێنڕەنگ ئەو ناوەی تەنیبوو. شمشێرەکان لە کێلان دەرهێنرابوون و، تیر لە جێ تیران ڕاکێشرابوو و لەسەر کەوان دانرابوو، ڕۆژ بۆنی عەرەفەی جەنگی لێ دەهات. ئەگەر ڕێگەچارەیەك نەدۆزرایەتەوە، مەگەر خوا بزانێت شەڕێکی ناوخۆیی چەندە درێژ خایەن و گیان خەراش هەڵدەگیرسا و، چ قوربانییەکی گیانی وماڵی لێ دەکەوتەوە! هەرچۆنێك بێت یەکێك لەناویاندا بیرۆکەیەکی بۆ هات و، وتی: "با یەکەم کەس کە لەو دەرگایەی کەعبەوە دێتە ژوورەوە، بیکەین بە نێوبژیوان و هەرچی وت پێی ڕازی بین." پێشنیارەکە قبووڵ کرا. ئیتر هەمووان چاو لەدەرگا، بە پەرۆشییەوە چاوەڕێی ئەوە بوون کە کێ یەکەم کەس دێتە ژوورەوە. ئەوەندەی نەبرد کە حەزرەتی محمد المصطفى خۆی کرد بە ژووردا. بە بینینی حەزرەت، هەموو بەجارێك وتیان: "وا ئەمین هات!" ئەوجا لە گرفتەکە ئاگاداریان کردەوە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَفْضَلُ الصَّلَاةِوَأَتَمُّالتَّسلِيم) هەر بیریشی لێنەکردەوە. گورج وتی: "پارچەیەك پەڕۆی گەورەم بۆ بێنن." هێنایان و ئەویش بەردەڕەشەکەی لە ناوەڕاستیدا دانا. سەرگەورەی هەر هۆزێکیش چمکێکی پەڕۆکەی بە دەستەوە گرت و تا جێگەکەی خۆی بەرزیان کردەوە. ئەوجا پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُتَعَالَىعَلَيْهِوَسَلَّمْ) بە دەستی موبارەکی خۆی بەردەکەی هەڵگرت و لە جێی خۆی داینایەوە.[1]

بەم شێوەیەش ڕێگری کرد لە بەرپابوونی جەنگێکی ناوخۆیی ترسناك. ئاخر چارەسەر کردنی کێشەیەکی وا ئاڵۆز و گەورەکراو، بەبێ بیرکردنەوە لەوەی چی بکات و، لە کورتترین ماوەدا و هەروەك ئەوەی موو لە ماست دەربێنێت، گەر نەدرێتە پاڵ مەنتیقی پێغەمبەرانە، بە چی تر لێك دەدرێتەوە؟ خۆ هێشتا نەبووبوو بە پێغەمبەر تا

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/١٨-١٩؛ طبري، تأريخ الأمم والملوك ١/٥٢٦.

بڵێین وەحییە. ئەوە تەنها مەنتیقێکی خەڵاتکراوی خوایی و، فەتانەتێکی تایبەت بە پێغەمبەرانە کە توانای هەڵگرتنی بارێکی گەورەی وەك پێغەمبەرایەتی هەیە و بەئاسانی ئەو کێشەیەی چارەسەر کردووە. بەڵێ، ئەو خاوەنی مەنتیقێك بوو لە سەرووی خودی مەنتیقیشەوە. دارای داوەرییەك بوو، باڵاتر لە خودی داوەری و، ئیدراکێك تیایدا شەپۆلی دەدا کە خودی ئیدراکیشی داپۆشیبوو.. جا خۆ لە ڕاستیدا بۆ مرۆڤێك کە بڕیار بێت قورئان بگرێتە خۆی، ئەمە مەرجێکی بنەڕەتی بوو...

## چاک ناسینی دوێنراوەکانی

حوصەین جارێکیان دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا. نییەتی وابوو ڕێنمایی پێغەمبەری خوا بکات. داینابوو قەناعەتی پێبکات و لە بانگەوازەکەی پاشگەزی بکاتەوە. سەروەری هەردوو جیهان توانایەکی ناوازە و دەراسای هەبوو لە ناسینی دوێنراوەکانی و دیاریکردنی ئاستیاندا. بێ ئەوەی هیچ بیری لێبکاتەوە، بە وتەگەلێکی وەها بەرامبەرەکەی دەدواند، کە ئەگەر بێیت و جێی یەك دوانێك لەو وشانە بگۆڕیت، یاخود ئەو وشە و دەربڕینانە لە بەرامبەر مرۆڤێکی تردا بەکار بێنیت کە کەسایەتییەکی جیاوازی هەبێ، ئەوا هەموو شتێك تێك دەدەیت بەسەریەکدا و هەرگیزیش ناگەیتە ئامانج. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەم لە هەڵبژاردنی وشەکان، هەم لە دەستنیشانکردنی حاڵ و مەقامی دوێنراوەکەیدا، بێ هاوتایە. مەحاڵە کەسێکی هاوشێوەی ئەوت بەرچاو بکەوێت. لەگەڵ کێ و لە کوێ و چۆنێتی قسە کردنەکەی بە جۆرێکی وەها خێرا ڕێکدەخست، کە تەنانەت بۆ ساتێکیش بیری لێ نەدەکردەوە. هەرچی دەوت، دەرەنجام دەردەکەوت کە هەموو ئەو شتانەی وتوونی، ئەو شتانە بوون کە دەبوایە بوترانایە. وەك چۆن لە هیچ گوفتارێکیدا ئامانج نەپێکان بەدی ناکرێت، هەر بەو جۆرەش، وتەیەکت بەرچاو ناکەوێت کە ناپێویست بێت، یاخود هەروا لە زیادە وترابێت. بڕۆن لە وشە بە وشەی بکۆڵنەوە و بچنە بنج و بناوانیەوە، هەرگیز ڕێتان لە دەربڕینێکی زیاد لە پێویست ناکەوێت. ئەگەر ئەمە فەتانەت نەبێ، ئەدی چییە؟ جا بڕوانن ئەم فەتانەتە چۆن حوصەینی تواندەوە!

کاتێك حوصەین لە قسەکانی دەبێتەوە، پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە دەربڕینێکی پڕ لە ویقار و ئەدەب لێی دەپرسێت:-

- ئەی حوصەین! تۆ چەند خوا دەپەرستیت؟

- هەشت خواوەند، حەوت دانە لەسەر زەوی و یەکێکیش لە ئاسمان.

مەبەست لەوەی ئاسمان، (الله)یە کە نەیانتوانیوە بە هیچ جۆرێك لە دەروونەکاندا بیسڕنەوە. بوونی خوای گەورە بیروباوەڕێکی لە ویژدان ڕەگ داکوتاوی ئەوتۆیە، تەنانەت سەردەمی جاهیلیش بە هەموو تاریکی و درێژخایەنی خۆیەوە نەیتوانیوە بیسڕێتەوە. ویژدان درۆ ناکات. هێندە بەسە کە زوبان بەڕاست و ڕەوانی تەرجەمەی ئەوای ویژدان بکات.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) بەردەوام دەبێت لە پرسیار کردن:-

- ئایا کاتێك تووشی زیانێك دەبیت، ڕوو لە کامیان دەکەیت و لێی دەپاڕێیتەوە؟

- لەوەی ئاسمانیان.

- کە ماڵت تیا دەچێت لە کامیان دەپاڕێیتەوە؟

- لەوەی ئاسمان.

پێغەمبەری خوا بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت لە پرسیار کردن و وەڵامیش هەر هەمان وەڵام دەبێت. دەربارەی هەرچی بپرسێت، حوصەین لە وەڵامدا دەڵێت: "لەوەی ئاسمان." حوصەین بێ ئاگایە لەو ڕستەیەی کە لە دوای هەموو ئەمانەوە دێت. سەروەرمان (عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کۆتا قسەی خۆی دەکات و، دەفەرموێ:

- ئەو زاتە هەر خۆی بەتەنها وەڵامی هەموو نزاکانت دەداتەوە، کەچی تۆ دەچی هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەیت بێ ئەوەی هیچ پێویستییەکی پێی بێ. ئەی بۆ من چی دەڵێم؟ موسوڵمان ببە، ڕزگارت دەبێت![1]

---

١ إبن حجر، الإصابة ٢/٨٧.

لە بنەڕەتدا ڕستەکانی ئەم گفتوگۆیە لەوپەڕی سادەییدان. وەك دەبینین، ئاستی فیکریی دوێنراو بەجۆرێك هەڵسەنگێنراوە، ئەوەتا لە کۆتایی گفتوگۆکەدا حوصەین شتێکی پێ نامێنێت بۆ وتن. بەڵێ، پاش کۆتا وتەی پێغەمبەری خوا، تەنها یەك دێڕ دەمێنێت کە دوێنراو بیڵێت، ئەویش "لَا إِلٰهَ إِلَّا الله مُحَمَّد رَسُولُ الله"یە. بە واتایەکی تر، کەسی دوێنراو یان ئەم دێڕە دەڵێت و بە سەرفرازی ئەبەدی شاد دەبێ، یان لە یاخی بوون و سەرکەشیی خۆی بەردەوام دەبێت و بێ ئەوەی وشەیەکیش لە زاری بێتە دەر، پشت هەڵدەکات و دەڕوات. لەم نێوەندەدا هەڵبژاردەی سێیەم بوونی نییە.

## قسەکردن بە گوێرەی دوێنراو

مرۆڤی دەشتەکی مرۆڤێکە لە بیاباندا ژیان بەسەر دەبات. زۆر جار وشترەکەی لێ ون دەبێت، یان کۆڵ و بارەکەی لەبیر دەچێت، یان لە ناکاو تووشی دەبێت بە تووشی گێژەڵووکەیەکی لمینەوە و دەست دەکات بە هاوار و فوغان. جا بیر لە حاڵەتی ڕۆحی کەسێکی لەم جۆرە بکەنەوە. وەختێ ئەم مرۆڤە تووشی نەهامەتی و تەنگانە دێ، چی دەکات؟ هەبێ و نەبێ شتێکی جیاوازتر لەو قسانەی حەزرەتی حەمزە نایەت بەسەر زاریدا کە جارێکیان عەرزی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)ی کرد..! حەزرەتی حەمزە لەو کاتەدا کە موسوڵمان دەبوو، بە پێغەمبەری خوای وت: "ئەی موحەممەد! لە تاریکی نۆتەکەچاوی شەوانی بیاباندا تێگەیشتم کە خوا زۆر لەوە گەورەترە کە قەتیسی نێو چوار دیواران بکرێت."

بەڵێ، نزیکەی هەموو ئەوانەی بێ کەڵکی و دەستەوسانی لات و عوززا و هوبەلیان بۆ دەرکەوتبوو، هەمان شتیان دووپات دەکردەوە. چونکە ئەوە ویژدان بوو کە لە دەروونی ئەواندا نەعرەتەی ئەم حەقیقەتەی دەکێشا. ویژدانیش ڕاستی دەوت. ئەوەتا، چەندین کەس بەم چەشنە حاڵەتە ڕۆحییەوە هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەری خوا و پرسیارە دەشتەکییەکانی خۆیانیان کردووە و لە ڕێی وەڵامە نایابەکانی پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) کە پڕاوپڕی دنیای ڕۆحیان بووە، بە هیدایەت سەرفراز بوون و شوێنی خۆیان لەنێو ئەستێرەکانی ئاسماندا کردووەتەوە.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، لە ئەبو تەمیمەوە، ئەویش لە هاوەڵێکی ترەوە (ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دانیشتبووین، پیاوێکی دەشتەکی هات و ڕاستەوخۆ ڕووی کردە پێغەمبەری خوا و، پرسی: "تۆ موحەممەدیت؟" پێغەمبەری خواش بە دەربڕینێکی نەرم و لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە: "بەڵێ من موحەممەدم."

- بانگەواز بۆ چ شتێك دەکەیت؟

- بانگەواز بۆ لای خوای عەزیز و جەلیل دەکەم. بە تەنها بۆ لای ئەو خوایەی کە تاك و تەنیایە و هیچ شەریك و هاوەڵێکی نییە. ئەو "الله"یەی کە ئەگەر تووشی زیان بوویت و داوات لێکرد، لەسەرتی لادەبات. ئەو خوایەی کە ئەگەر تووشی قاتی و وشکەساڵی بوویت و هانات بۆ برد، وەڵامت دەداتەوە و پاراو و تێراوت دەکات. ئەو خوایەی کە ئەگەر لە زەوییەکی سارای تەختدا بوویت و ڕێگە و توێشووت لێ ونبوو، تۆش لێی پاڕایتەوە، بە دەمتەوە دێت و بۆت دەگێڕێتەوە.

ئای لە ناوازەیی ئەو وتانەی بەو دەشتەکییە وتران! بزانن چۆن تەواوی ڕستەکان پەیوەندییان بەو لایەنانەوە هەیە کە لەگەڵ خوێنی ئەو دەشتەکییەدا تێکەڵ بوون! برسێتی، وشکەساڵی، نەهامەتی و مەینەتی ناو بیابان، هەموو ئەمانە چی دەگەیەنن؟ ئەوەتا ئەو دەشتەکییەی کە چاك شارەزای ئەم شتانەیە، وا ئێستا باسی ئەو خاوەن توانستە ڕەهایەی بۆ دەکرێت کە لە تەواوی ئەو حاڵ و بارانەدا دەبێتە تاکە دەرەتان و پەناگەی. جا خۆ ئەو هەستانەش کە لە ویژدانی ئەوەوە هەڵدەقوڵان، هەر هەمان ئەم واتایانە بوون. بەڵام بابای دەشتەکی هێشتا نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی لە زوبانی ئەو واتایانە تێبگات. وەك بڵێی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم دەربڕینانەی، ئەلفوبێی زوبانی ناخ و ویژدانی فێربکات، وەها بوو. قسەکان بە جۆرێك کاریان لە کابرای دەشتەکی کرد، بە چەشنێك ڕەگی گومانەکانی دەروونیان وشك کرد، جگە لە خۆ تەسلیم کردن بە پێغەمبەری خوا و هاتنە ناو ئیسلامەوە ڕێگەیەکی تری بۆ نەمایەوە.

ئەوەبوو بەیعەتیدا و، شەرەفی بوونە صەحابی پێغەمبەری خوای بەدەست هێنا.[1] وشەکان زۆر سادەن. شێوازی قسەکردن، هیچ گەمەیەکی ڕەوانبێژی و زمانەوانی تێدا نەکراوە. بەڵام ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر هەیە، ئەویش ئەوەیە کە دوێنەر بە جۆرێك دواوە کە کتومت هاوتای داخوازییەکانی حاڵەتی دوێنراو بێت. ئیتر دوای ئەمە کابرای دەشتەکی بە چۆکدا هات...

جا ئایا جگە لە حەزرەتی موحەممەد (عَلَيۡهِ أَفۡضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسۡلِيمِ) بۆ کێی تر لواوە لە سەرزەویدا کە لە کۆمەڵە مرۆڤێکی دڵبەردین ئوممەتێکی فریشتەئاسا بەرهەم بهێنێت؟ ئەو وزە و توانایەی کردگاری مەزن پێی بەخشیبوو، وەها وەستایانە و لە جێی خۆیدا بەکاری هێناون، کە ئەوەتا ئەو وەرچەرخانە بێ وێنەیەی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەرپای کردووە، تا ئێستاش مێژووناس و کۆمەڵناسانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە و، وەك تەلیسمێکی سەیر ماوەتەوە لە لایان. ئەو گەوهەرانەی حەزرەتی موحەممەد (عَلَيۡهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەڵیدانە دەریای ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، کۆمەڵە شەپۆلێکی وایان هێنایە مەیدان، کە بە کەناراوی هەموو سەردەمەکانی دوای خۆیدا درێژبوونەوە و ئەم چەرخەی ئێمەشیان خستە ژێر کاریگەری خۆیانەوە، هیچ گومانێکیش لەوەدا نییە کە ئەم کارە تا قیامەت هەروا بەردەوام دەبێت.

ئەمڕۆکە لە هەموو لایەکی دنیاوە خەڵکی بەلێشاو دێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە. ئەمەش، جگە لە بەریەککەوتنی ڕۆخی ئەم سەردەمەمان، لەگەڵ ئەو شەپۆلانەی کە لە ئەنجامی شڵەقانی دەریای ژیانی کۆمەڵایەتییەوە بە گەوهەرە بەنرخەکانی پێغەمبەری خواوە هاتوونەتە مەیدان، چی دی نییە. جا ئایا کەسێکی تر هەیە ئەم جازیبە قودسییەی بدرێتە پاڵ کە بە درێژایی چەندین سەدە هێزی کاریگەرییەکەی لە کاردایە. مەگەر جگە لە حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمْ) کەسێکی تر هەیە کە خاوەنی وەها جازیبەیەك بێت تا بڵێین هی ئەوە؟ ببڕای ببڕای، هەر ئەوە کە دانەی دانسقە و، فەریدی کەون و زەمانە.. هەموو شتێکیش لەبەر خاتری ڕووی ئەوە.

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٦٥/٤. (هەمان فەرموودە بە جیاوازییەکی کەمەوە لە أبو داود، اللباس ٢٥ یشدا هاتووە)

## وتارەکەی حونەین

وەك چۆن سوڵتانی ئەنبیا سەختترین کێشەکانی بەوپەڕی ئاسانی چارە دەکرد و بە خێراییەکی بێ وێنە گرێکوێرەی ئەو گرفتانەی دەکردەوە کە بە مەحاڵ دەبینران، هەر بەو جۆرەش، لە بەرامبەر ئەو ڕووداوە چاوەڕواننەکراو و کتوپڕانەدا کە تەنانەت زرنگترین مرۆڤەکانی ڕاپێچی گێژاوی دوودڵی، بگرە تۆقان دەکرد، ئەم بێ ئەوەی هیچ شتێك لە ویقار و هێمنییەکەی لەدەست بدات، یەکسەر دەکەوتە جووڵە و، بەگورجی ئەو گرفت و ئاڵۆزییەی چارەسەر دەکرد و دەستی دەگرت بەسەر بارودۆخەکەدا. ئەگەر چاوی وردبینیمان ئاڕاستەی ورد و درشتی بزاوتەکانی ژیانی موبارەکی بکەین، واتە، ئەگەر لە هەر جووڵەیەك کە پێی هەستاوە، لە هەر هەنگاوێك کە هەڵی ناوە، یان لە هەر ڕستە و بگرە هەر وشەیەکیش کە لە زاری شیرینیەوە هاتووەتە دەر بکۆڵینەوە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو جووڵە و هەنگاو و وتەکانی بەگوێرەی تەرازوو و پێوانەیەکی زۆر هەستیار بەرنامەڕێژکراوە. تەنانەت ڕەهەندە زەمەنییەکانیشی هەر لە چرکەوە بیگرە تا عاشیرە[1]، بەوپەڕی هەستیاری و لێهاتوویییەوە ڕەچاو کراوە. خۆ ئەگەر چرکەیەك دواکەوتن ڕووی بدایە، یاخود ڕستەیەك لە قسەکانی فەرامۆش بکردایە، ئەوا ئەو کات مەبەستی چاوەڕوانکراو نەدەهاتە دی و، بەو ئەندازەیە سەرکەوتن بەدەست نەدەهات. لە کاتێکدا ئێمە دەزانین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێوانە و کێشانەی هەڵسوکەوتەکانی نەکردووە، چ جای ئەوەی دابنیشێ و بە دوور و درێژی لەمەڕ کارەکانی بیر بکاتەوە! جا کە حاڵ وابوو، ئەوا جگە لەوەی کە ڕاڤەی ئەم ڕووداوانە بسپێرینە فەتانەتی ئەعزەمی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، هیچ ڕێگەیەکی تر هەیە بۆ لێکدانەوەیان؟!

بەڵێ، ئەو پێغەمبەر بوو، مەنتیقەکەشی مەنتیقی پێغەمبەرانە بوو. پێغەمبەرانە بیری دەکردەوە و پێغەمبەرانەش دەجووڵایەوە. بۆیە لە هیچ کام لە کارەکانیدا نشوستی نەدەبینرا. نەك نشوستی نەدەبینرا، بەڵکو بەیداخی سەرکەوتنەکانی هەردەم لە لوتکەدا دەشەکایەوە. واتە مەحاڵ بوو کەسێکی تر بگاتە ئەو شوێنەی کە ئەو سەروەرە پێی

[1] عاشیرە: واتە یەك لەسەر دەی چرکەیەك.

گەیشتبوو. بە سەدان ڕووداو و بەسەرهاتیش هەن کە پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە. بەڵام ئێمە تەنها ئەو دانەیەیان هەڵدەبژێرین کە بەلامانەوە لە هەموویان گرنگترە:

کاتی ڕووداوەکە پاش غەزای حونەینە. ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئیبن ئیسحاق ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕنەوە:

غەزای حونەین لەپاش فەتحی مەککە ڕوویدا. ئەو غەنیمەت و دەستکەوتانەی لە جەنگەکەدا بەدەست هاتبوون، پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەزۆری بەخشینی بەو کەسانەی کە دەیویست دڵیان بەرەو ئیسلام نەرم بکات. زۆرێك لەمانەش سەرگەورە و پیاوماقوڵی ناو تیرە و هۆزەکانی خۆیان بوون. لەپاش فەتحی مەککە، سەقامگیر بوونی ئیمان لە دڵی ئەو جۆرە کەسانەدا، لە ڕوانگەی بەردەوامی فەتحەکانەوە جێی بایەخ و گرنگی بوو. چونکە زۆرێکیان بەبێ ویستی خۆیان موسوڵمان بووبوون. خۆ ئەگەر بە تێپەڕبوونی کات شەختەسەهۆڵەکانی ناو دەروونیان نەتوێنرایەتەوە، ئەوا زۆر لەو کاتە مەترسیدارتر دەبوون کە لە بەرەی کوفردا بوون. بەڵێ، تەنانەت ئا لێرەشدا فەتانەتی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت.

دەستکەوتەکان بریتی بوون لە: شەست هەزار دیل، بیست و چوار هەزار وشتر و چل هەزار سەر مەڕ و بزن لەگەڵ چوار هەزار هۆقە ئاڵتوون و زیو. لە کاتی دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا وەك بڵێی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) زیاتر ڕەچاوی مەککەییەکانی کرد و زۆربەی دەستکەوتەکانی بەسەر ئەواندا دابەش کرد. ئەمە بەدەر لەوەی کە چەند کەسایەتییەکیان پشکی تایبەتییان پێدرا. ئەم کەسانە، وەك وتمان، لەوانە بوون کە پێویستییەك و سوودێکی گەورە هەبوو لە وابەستە بوونیان بە ئیسلامەوە. بۆ نموونە: سێ سەد وشتر و سەد و بیست هۆقە زیوی بەخشی بە ئەبوسوفیان و خێزانەکەی، دوو سەد وشتر بۆ حەکیمی کوڕی حیزام، سەد وشتر بۆ نەصیری کوڕی حاریس، سەد وشتر بۆ قەیسی کوڕی عەدی، سەد وشتر بۆ صەفوانی کوڕی ئومەییە، سەد وشتر بۆ حوەیتیبی کوڕی عەبدولعوززا، سەد وشتر بۆ ئەقرەعی کوڕی حابس، سەد وشتر بۆ عویەینەی کوڕی حیصن و سەد وشتریش

بۆ مالیکی کوڕی عەوف. جگە لەمانەش یەکی چل تا پەنجا حوشتری بەخشی بە هەندێك لە گەورە پیاوانی دیکە.[1]

ئەوەی دابەشکرا، وشتر و ئاڵتوون و زیو بوو، بەڵام لە بەرامبەریدا دین دەپارێزرا و ئیسلام لە دڵەکاندا دەچەسپێنرا. ئاخر ماوەیەکی زۆر نەبوو مەککە فەتح کرابوو، بۆیە تا ئەو کاتە جۆرێك لە دڵشکاوی لای هەندێك لە مەککەییەکان هێشتا هەر مابوو. هەر هیچ نەبێ، غروور و شکۆی هەموویان، با کەمێکیش بێ، شکابوو. لە چاوی خەڵکی مەککەشدا شان و شکۆ هەموو شتێك بوو. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بەچاکترین شێوە ئەم دەرفەتە ئیلاهییەی قۆستەوە، بەم جۆرەش ئەو زامانە تیمار کران کە دەکرا لە داهاتوودا ئازاری گەورە بە جەستەی ئوممەت بگەیەنن. بەڵام ئەم دابەشکردنە بوو بە مایەی نیگەرانی هەندێ لە ئەنصار، بەتایبەتی گەنجەکانیان. بگرە هەندێکیان دەیانوت: "هێشتا خوێنیان لە شمشێرەکانمان دەتکێ، کەچی ئەوانیش لە ئێمە زیاتر وەردەگرن." ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەستپێکی فیتنەیەك بوو. کەمی ژمارەی ئەوانەی ئەم قسەیەیان دەکرد گرنگ نەبوو. ئەگەر لە کاتی خۆیدا ئەو فیتنەیە چارەسەر نەکرایە، ئەوا دەکرا ببێتە ئاگرێك کە بەرگرتنی مەحاڵ بێت. با ئەوەش لەلاوە بوەستێت کە بچووکترین ڕەخنە لە بەرامبەر رسول الله دا مرۆڤ لە دین و ئیمان دەکات و خەسارەتمەندیی هەمیشەیی دەکاتە بەشی. ئەمەش بۆ خۆی بەڵایەکە کە زۆر لە فیتنەی یەکەم گەورەترە.

دەستبەجێ سەعدی کوڕی عوبادە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) هەواڵی بارودۆخەکەی گەیاندە پێغەمبەری خوا. ئەگەرچی ئەم قسانە هەر لەنێو گەنجەکاندا دەماودەمی دەکرد و بەتەمەنەکان شتی وایان بە مێشکیشدا نەدەهات، بەڵام هەلومەرجەکە وای دەخواست کە ڕێوشوێنی بەپەلە بگیرێتە بەر و ڕێ لە تەشەنەسەندنی بگیرێ.

بۆیە ڕاستەوخۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمانیدا کە ئەنصار لە شوێنێکدا کۆببنەوە و جگە لە خۆشیان ڕێگە بە هاتنە ناوەوەی کەسی تر نەدەن. ئەنصار کۆبوونەوە و پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) ئەم وتارەی ئاراستە کردن:

١ ابن سعد، الطبقات الكبرى ٢/١٥٢-١٥٣.

”ئەی کۆمەڵی ئەنصار! پێم گەیشتووە کە دڵشکاوییەکتان بەرامبەر بە من لە دڵدا دروست بووە...“

دەستپێکێکی لەم جۆرە، لە ڕوانگەی سایکۆلۆژیای کۆمەڵەوە بە دەستپێکێکی زۆر سەرسووڕهێنەر دادەنرێت. چونکە بەکارهێنانی ئەم چەند وشەیە لە سەرەتای قسەدا، بەرامبەر بە کۆمەڵێك کە چاوەڕێی شتی وایان نەکردووە، بگرە زۆرێکیان بێئاگاش بوون لە هۆکاری کۆبوونەوەکە، بە وێنەی وەشاندنی زللەیەکی کتوپڕ، هەموویانی دەهێنایەوە هۆش خۆ. لە ڕاستیشدا هەروا بوو...

هاوەڵە بەڕێزەکان هەرگیز بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە ڕەخنە لە رسول الله بگرن. ئەگەر ئەوپەڕی شتێکیش ببوایە، ئەوا تەنها دڵیان زویر دەبوو. لە وەها حاڵەتێکیشدا ڕاستەوخۆ بە ڕەفتارێکی پێغەمبەرانە دڵیان دەهێنرایەوە جێی خۆی. وا ئێستاش هەر بەم دەستپێکە تەمی دڵشکاویی لە دەروونی هەمووواندا ڕەوییەوە. بەڵێ، ئەم یەکەمین ڕستەیەی پێغەمبەری خوا، کاریگەرییەکی سەرسامکەری لە دڵی ئەوانەدا جێهێشت کە ئەو حاڵەتەیان لا دروست بووبوو. دەمودەست هەموویان خۆیان کۆکردەوە و چاویان بڕییە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). ئیدی هەر وتەیەك لەپاش ئەم ئامادەکارییە دەروونییە، بەدڵنیاییەوە دارای بایەخ و گرنگیی خۆی بوو. هەمووان گوێیان شل کردبوو و پەرۆشی ئەوە بوون کە دەوترێ. ئەم یەکەمین هەڵمەتەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شوێنی خۆی گرتبوو، بەڵام پێویست بوو زنجیرە هەڵمەتێکی تری یەك لەسەر یەکی ئەنجام بدایە. ئەگەر ئەم هەڵمەتانە ئامانجی خۆیان نەپێکایە، ئەوا زیاد لە سوود، زیانیان بە دوای خۆیاندا دەهێنا و، پێچەوانەی ئەنجامی خوازراویان دەدا بە دەستەوە. هەر بۆیە پاراستنی ئەم هاوسەنگییە زۆر گرنگ بوو. ئەمەش هەڵمەتەوتەکانی پێغەمبەری خوا بوون:

”ئایا کە من هاتم ئێوە لە گومڕاییدا نەدەژیان؟ ئەی خوای گەورە بە هۆی منەوە هیدایەتی نەدان؟“

"ئایا کاتێك من هاتم بەدەست هەژاری و نەدارییەوە گیرتان نەخواردبوو؟ ئەی خوای گەورە بەهۆی منەوە دەوڵەمەندی نەکردن؟"

"ئایا کە من هاتم ئێوە دوژمنی یەکتری نەبوون؟ ئەی خوای گەورە بەهۆی منەوە خۆشەویستی نەخستە نێوانتانەوە؟"

لە کۆتایی هەر پرسیارێکیشدا ئەنصار بە یەك دەنگ دەیانوت: "بەڵێ، بەڵێ، منەت هی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی."

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) ڕێك لە کات و شوێنی خۆیدا ڕێچکەی قسەکانی گۆڕی. لەم ساتە ناسکەدا کە هەستەکان هاتبوونە جۆش و کوڵین، هەر خۆی، بەڵام ئەمجارە بەناوی ئەنصارەوە دەستی کردەوە بە قسەکردن. ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُ عَلَيْهِوَسَلَّمْ) خۆی ئەو قسانەی دەکرد کە لەوانە بوو ئەنصارییەکان لە خراپترین ئەگەردا بیانکردایە. جا خۆ ئەگەر هەر موسوڵمانێك بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەی بکردایە، ئەوا بەرەو کەندەڵانی تیاچوون گلۆر دەبووەوە. سەروەری هەردوو جیهان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍوَسَلَام) بەردەوام بوو لەسەر فەرمایشتەکانی:

"ئەی کۆمەڵی ئەنصار! ئەگەر بتانویستایە دەتانتوانی بە شێوەیەکی تریش وەڵامم بدەنەوە. بۆ نموونە دەتانتوانی بڵێن: بە دەربەدەری و بێ کەسی هاتی بۆ لامان، ئێمەش ئامێزمان بۆ کردیتەوە و پەنامان دایت. بە هەژاری و بێنەوایی هاتیت، ئێمە دڵمان دایتەوە و پشتمان گرتیت. بەترسەوە هاتیت و ئێمە داڵدەمان دایت. بێ پشت و پەنا بوویت و ئێمە سەرمانخستیت! خۆ ئەگەر بەم شێوەیە وەڵامتان بدامایەتەوە، ڕاست دەبوون لە قسەکانتاندا و کەسیش بە درۆی نەدەخستنەوە.

ئەی کۆمەڵی ئەنصار! ئەگەر بەوە دڵتەنگ بوون کە کەمێك ماڵی دنیام داوە بە کەسانێك کە دەمەوێت ببن بە موسوڵمان، ئەوا لێتان دەپرسم کە ئایا ئێوە حەز ناکەن لە کاتێکدا کە هەمووان بە وشتر و مەڕ و بزنەوە بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوە، ئێوە بە رسول الله وە بگەڕێنەوە؟ سوێند بەو خوایەی کە نەفسی منی بەدەستە، ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی بچنە دۆڵێك و ئەنصاریش بچنە دۆڵێکی تر، بێ هیچ دوودڵییەك

بەرەو ئەو لایە دەچم کە ئەنصاری بۆ چووە. ئەگەر هیجرەت نەبووایە، ئەوا زۆر حەزم دەکرد یەکێك بم لە ئەنصار. خوایە! ڕەحم بە ئەنصار و ڕۆڵەی ئەنصار و ڕۆڵەی ڕۆڵەی ئەنصار بکە.“

لە بەرامبەر ئەم وتانەدا تاکە کەسێکیش نەمابوو کە نەگری. هەمووان پڕمەی گریانیان دەهاتێ و، بە هەموو دەنگیانەوە دەیانوت: ”خوا و پێغەمبەرەکەی بۆ ئێمە بەسن. هیچ شتێکی ترمان ناوێت.“[1]

ئەم وتارە پوخت و پڕ ناوەرۆکەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) و، دەستبەجێ ڕەواندنەوەی ئەو فیتنەیەی کە ئەگەری سەرهەڵدانی هەبوو، هەروەها پلەیەك زیاتر چوونە نێو دڵی گوێگرانییەوە، ڕووداوێکی هێندە بێ وێنە و سەرسوورهێنەرە، پێم وایە گەر بمانەوێت لێکدانەوەی بۆ بکەین، جگە لە پەنا بردن بۆ دەستەواژەی فەتانەت، هیچ ڕێگەیەکی ترمان لەبەردەمدا نابێت...

یەك بە یەکی ڕستەکان شی بکەنەوە.. سەرنجێك لە ڕەهەندی وەخت و کاترێژیی وتارەکە بدەن.. ئەوجا پێوانەی ئەو ماوەیە بکەن کە هاوەڵان لە جیهانی ڕۆحیاندا لە نێوان یەکەم ڕستە و کۆتا ڕستەدا بڕیویانە... پاشان هەر بەمەوە مەوەستن و ئەوەشی بخەنە سەر کە هەموو ئەمانە بێ هیچ بیرکردنەوە و خەملاندنێك و هەروا ڕاستەوخۆ وتراون. ئەوجا لە دواییدا ڕوو بکەنە ویژدانتان و لێی بپرسن کە داخۆ دەبێ ئەو سوڵتانی گوفتارە کێ بێ؟ بێگومان ئەو وەڵامەی بە دەستی دێنن: محمد رسول الله دەبێت. لە ڕاستیدا هەر مرۆڤێك ناخ و ویژدانی نەگەنیبێت، ئەم وەڵامە لە ویژدانی خۆیدا هەست پێدەکات. تەنها ئەوەندە بەسە کە سەرکێشی و بیرتەسکیی وەلاوە نابێت و بە چاوێکی بابەتییانە بۆ ڕووداوەکان بڕوانێت...

ئێمە لێرەدا تەنها لێکدانەوەیەکی کورتی ڕووداوەکە دەکەین و درێژەی بابەتەکەش بۆ کۆمەڵناس و دەروونناسە بەختەوەرەکانی داهاتوو جێدێڵین.. بەڵی، با بۆ ئەوانی جێبێڵین، تاکو لە گۆشەنیگای تایبەتیی خۆیانەوە لێی بکۆڵنەوە و ڕەهەندێکی تری

١ بخاري، مناقب الأنصار ١-٢، المغازي ٥٦؛ مسلم، الزكاة ١٣٢-١٤٠؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣/٧٦-٧٧؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٥/١٦٩-١٧٧؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٣٥٥-٣٦٠.

دەرك كردن بە فەتانەتی پێغەمبەر (عَلَيْهِ اَلْفُ صَلاةٍوَسَلَام) بخەنە سەر مەلۆی مەعریفەی مرۆڤایەتی...

یەکەم: وتارەکە تەنها ڕووی لە ئەنصارییەکان بوو. چونکە نە مەککەیی و نە موهاجیرەکانیش نیاز و ڕەفتارێکی وایان نەنواندبوو کە پێویست بە وتارێکی لەم جۆرە بکات. هەر بۆیە وتارێکی لەم جۆرە، وتارێك نەبوو کە لە سەرەتادا لە لایەن ئەوانەوە بەبایەخەوە بۆی بڕوانرێت. بەم پێیە، بوونی ئەوان لەنێو گوێگراندا بە شێوەیەکی ئەرێنی کاری دەکردە سەر ئەو دیققەت و سەرنجەی کە دەبووایە لە ئەنصاردا هەبوایە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە ڕوانگەی کاریگەریی وتارەکەوە خاڵێکی گرنگ بوو.

دووەم: جیاکردنەوەی ئەنصار و کۆکردنەوەیان بەتەنها لە شوێنێکدا، جۆرە ڕێزلێنانێك بوو بۆیان. هەروەك چۆن کۆبوونەوە و چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆیان بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) و، بەشداری پێ نەکردنی کەسانی دی لە کۆبوونەوەکەدا، لە ڕووی باری دەروونییەوە ڕۆڵێکی ئەرێنی گەورەی بینی.

سێیەم: لەوانە بوو لەنێو قسەکاندا چەند بڕگەیەك هەبن کە دڵی هاوەڵە موهاجیرەکان و ئەهلی مەککە بڕەنجێنن. بۆ نموونە دوور نەبوو کە ڕستەی "کاتێك خەڵکی بە وشتر و مەڕ و بزنەوە بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوە" یەکێك بێت لەوانە.

چوارەم: لە کۆتایی وتارەکەدا ئەنصار ستایش دەکرێن و دوعای خێریشیان بۆ دەکرێ. جا لەوانەبوو جیاکارییەکی لەو جۆرە، لەسەر دڵی هاوەڵە موهاجیرەکان، کە لە پێناو ئیسلامدا کۆچیان کردبوو و ماڵ و حاڵی خۆیان جێهێشتبوو، هەروا ئاسان نەبوایە.

پێنجەم: دەقی ڕەسەنی وتارەکە لە ڕووی ڕەوانبێژی و زمان پاراوییەوە لە ئاستێکی ناوازە و دەگمەندایە.

شەشەم: هەژاندنی گوێگران لە سەرەتای وتارەکەدا و پاشان نەرم کردنیان، هەروەها قسەکردنی پێغەمبەرمان بە ناوی ئەوانەوە و هێشتنەوەیان لە مەقامی گوێگردا، مامەڵەیەکی دروست و لەباری بارودۆخەکە بوو.

حەوتەم: بەرێنەکردنی بارودۆخەکە بە قسە هێنان و قسە بردن و، هەڵقوڵانی قسەکان لە قووڵایی ناخ و هەستی دڵسۆزانەوە، بواری دەربڕینی هیچ شتێکی بۆ گوێگران نەهێشتەوە. ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگ بوو لە ڕوانگەی بەدەست هێنانی ئەنجامەوە.

هەشتەم: دەربڕینی هەموو ئەو وتانە بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەك و بە تەرزێکی ڕەوان و ڕاستەوخۆ، ڕەهەندێکی تری دەخستە سەر کاریگەریی قسەکان.

ئەمەو چەندین تایبەتمەندیی تر کە بە مێشکی مرۆڤدا دێن، ئەوەمان پیشان دەدەن کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە ئارەزوو و ویستی خۆی نەدەدوا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە ڕوانگەی ئەو فەتانەتەوە دەدوا و کێشەکانی چارەسەر دەکرد، کە بە وەحی و ئیلهامی خوایی بارگاوی بووبوو.

## ج) گوفتارەکانی پێغەمبەرمان لە ڕوانگەی فەتانەتەوە

ڕەهەندێکی تری فەتانەتی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە پەنجەرەی گوفتارەکان و خاوەندارێتییەوە بۆ "جَوَامِعِ الكَلِم"[1] دەردەکەوێت.

بەڵێ، ئەو سوڵتانی گوفتار بوو. جا چۆن وا نەبێ، لە کاتێکدا خوای گەورە ئەوی ناردبوو تا ببێتە وەرگێڕ و مامۆستای گوفتارەکانی خۆی.

تا ئەمڕۆ زۆر کەس، هەر یەکەو بە گوێرەی توانا و ئاستی خۆی و لە قاڵبێکی دیاریکراودا، وشەی جوان و وتەی ناسکیان داوە بە گوێی ژیاندا، بەڵام ئەو قووڵی و ناسکی و چێژەی لە گوفتارەکانی ئەو سەروەرە نازدارەدا دەبینرێت، زەریایەکی بەرینی بێ بن و، پەڕەی گوڵانی بەهاری زۆزان و، میوەی باخی بەهەشتی جاویدانە.

دەربڕینەکانی هێندە شیرین و، وشەکانی هێندە غارەتگەر بوون، وەختێ دەدوا، سەران حەیران دەمان و، ڕوانینەکان مەست دەبوون و، دڵانیش لەدەست دەچوون. هەرچی عەقڵ و داوەریشە چەك دەبوون و، هەستە مرۆییەکان دەژیانەوە و، ڕۆحەکانیش وەك

---

[1] جَوَامِعِ الكَلِم: یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی گوفتاری سەرداری پێغەمبەران (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، کە بریتیە لە دەربڕینی ناوەرۆکی دەوڵەمەند و واتاگەلێکی زۆر لە ڕێگەی چەند وشەیەکی کەمەوە.

بڵێی لە شەقەی باڵیان دەدا. خوای گەورە هێزێکی وەهای بەخشیبوە زوبانی ئەو ئازیزە، ئەوانەی سەرفرازی سەر سفرەی پەیڤە شیرینەکانی دەبوون، لە ویقاری حوزووری ئەو سوڵتانی گوفتارەی کە خاوەنی پوختترین دەربڕین و ڕاستترین قسەیە، وەك بڵێی لە گۆ دەکەوتن و بە جارێك سەماع دەیگرتن.. چ کاتێك گەوهەری حیکمەت لە لێوانییەوە بدرەوشایەتەوە، ئەریابی عەقڵ و داوەری نوتقیان لێ دەبڕا. هەرکاتیش دەربارەی باشە و جوانی و ڕاستی بدوایە، ڕۆحی گوێگرانی بە تامی گەزۆی وێژەکانی شیرین دامان دەبوو. کەنگیش زوبانی ئاگرینی گڕی لە خەرمانی چەوتی و خراپە بەردایە، کوفر و ناڕەوایی لە نێو گومڕایی خۆیاندا دەخنکاند. جا با ئەو کاتەش بوەستێ کە بۆ بانگەوازەکەی نەعرەتەی بەڵگە و دەلیل و بورهانی دەکێشا، زنجیری دەکردە زوبانی هەرچی ڕۆحی ڕەش هەیە و، تاریکییەکانی مەحکومی شکست دەکرد...

ئەو زۆر چاك بە ئاگا بوو لە تەواوی ئەم بەخششە ئیلاهییانە و، وەك تەحدیثی نیعمەتیش (باسکردنی بەخششەکانی پەروەردگار بە نییەتی سوپاسگوزاری) کێشەیەکی نەدەبینی لە باسکردنیاندا. ئەوە بوو دەیفەرموو: "من موحەممەدی پێغەمبەری نەخوێندەوارم، دوای من پێغەمبەر نایەت. من سەرفراز کراوم بە دەستپێك و پایانی گوفتار و "جوامع الکلم"."[1] هەروەها دەیفەرموو: "ئەی خەڵکینە! من شەرەفمەند کراوم بە "جوامع الکلم" و، وتنی ئەو دوا پەیڤەی کە شیکار و چارەی هەموو شتێك دەکات."[2] ئیدی بەم دەربڕینە نوور ئەفشانانەی، هەم بەخششەکانی خاوەندی مەزنی دەژمارد و سوپاسگوزاری لەسەر دەردەبڕین، هەم ڕاشیدەگەیاند کە وتارێژی پایەبڵندی ڕابردوو و داهاتوو هەر خۆیەتی.

بەڕاستی ئەو سەروەری سەرومرانە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) بولبولێکی وەها بوو کە هەرکات بە چریکەی هەناسە ژیانبەخشەکانی سروودی بۆ گوڵزاری باخی ڕازێنەری گەردوون دەچڕی، دڵی دەهاتە گۆ و، لە زمانی دڵیەوە ئەفسووناویترین ئاواز باڵیان دەگرت. ئەو پەیڤە نوێتر لە نوێیانەی لە نەمامە تازەکانی باخی ئەوەوە چرۆیان

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ١٧٢/٢، ٢١٢.

٢ إبن أبي شيبة، المصنف ٢٦١/١، ٣١٨/٦؛ أبو يعلى، المسند ٢٠٩/١٣.

دەکرد، هیچیان نەدەچووەوە سەر ئەو خونچانەی لە بەهاری ئەوانی تردا تۆمەیان تەقاندووە و، لەو گوڵانەش نەدەچوون کە لە شەبەقی کەسانی تردا تیرۆژی بەیان بەخەبەری هێناون. هەموو شتێك لەسەر سفرەی دەربڕینی ئەو سەروەرە ڕەوانگۆیەدا، بە وێنەی چرۆی شەونم لەسەرلێو، تازە و نۆبەرە بوو. ناسین و چەشتنی نۆبەرەی ئەم باخەش بە تەواوی لایەنەکانیەوە و، گەیشتن بە لوتکەی چێژی ئەو ناسینە، تەنها بۆ یەکەمین خۆشبەختەکانی ئەم کاروانە دەستی داوە.

ئەو سەرداری دەربڕینە لە گەوهەری وشەکانی شمشێرێکی وەهای دروست کرد، هەر ئەوەندەی یەك جار ئەو شمشێرەی بەسەر سەراندا سووڕاندەوە، چی قسەی درۆ و هەڵبەستراو هەبوون، هەڵهاتن و لە کونی شەمشەمەکوێراندا خۆیان شاردەوە و، هەموو ئەفسانە و داستانەکانیش لە پشتی کێوی قافدا خۆیان دایە پەنای عەنقاوە. لە وتە و دەربڕینەوە کانیاوی وەهای هەڵقوڵاند، کە لە چاوتروکانێکدا هەر چوار لای بیابانی جەهالەتیان گۆڕی بە باخی بەهەشت و، تاڤگەی وەهایان لێ تەقی، کە هەموو ئەو سینانەی بە ڕووی ئیماندا کراوەبوون، لەگەڵ تافە و قەڵبەزەیاندا بەرەو زەریای ئەبەدییەت بەڕێکەوتن.

کارێزی وتەکانی ئەو لە جیهانێکی ترەوە ئاویان تێدەڕژا.. ئەگەر گوڵ و گوڵزاری وتەکانی ئەو - کە بە بارانی وەحی ئاودێر دەکرا - نەبوونایە، ئەوا جیهان بۆ هەمیشە لەنێو چنگی پشێویدا دەتلایەوە. ئەوەبوو پەردەی سەر ڕووی سروشتی بە شمشێری وتەکانی پەرت پەرت کرد و، هەر بە نەخشی ئەو وشانەش کتێبی دینی ڕازاندەوە. گوفتار، شمەکی لێ جیا نەبووەوەی سەر پشتی ئەسپەکەی و، تیرێکی ئاڵتونی نێو تیردانەکەی بوو. بە هەر جێیەکدا بڕۆشتایە، دامێنی ئەوانەی لە قسە تێدەگەن، پڕ لە گەوهەر دەکرد و، تیری لە کەوان دەکێشا و، بە ئەسپەکەی تاریکییەکانی دەبەزاند. کاتێکیش خوای گەورە (جَلَّ جَلالُهُ) موورادی فەرموو کە بۆ دواجار لە وشە دەوڵەتێك لەسەر زەویدا بنیات بنێت، ئەو سوڵتانی دەربڕینەی بۆ سەرکردایەتی هەڵبژارد و، سککە و تووڕەی دەربڕینی دا بە دەستیەوە.

بە درێژایی مێژوو، چی مەردی وێژە و گوفتار هاتوون و دێن، لەوانەی ئاشنای

ئەودیو جیهانی بینراون، هەریەکەیان تاکێکن لەو کۆرسەی کە عەرشی تەجەللی دەچڕن.. ئەویش بووەتە سەرتیپ و سەرکۆرسی ئەم کۆمەڵە بولبولانە.. ئەنبیا و ئەولیا یەك لە دوای یەك دەهاتن و کۆڕی زیکرێکیان وێك دەنا. ئەویش بە ئەرکی خۆی هەستا و بووە پێشەنگی زیکرخوێنانی ئەم کۆڕی قودسییانە.. بەڵێ، هات و بە دەنگە بەگوڕەکەی عەرش و فەرشی هێنایە خرۆش. هەر میوەیەك کە لە سفرە ئاسمانییەکەیەوە هەڵیدەگرت و بە وشەکانی دەیڕازاندەوە و پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکرد، سەرگوڵی هەڵبژاردەی مەحرەمترین گۆشەکانی باخی دۆستە و، لەو میوە تایبەتییانەی بەخششی شاهانەیە کە کەس نەیبینیوە و، هەر لەنێو بەرگەکەیدا پێشکەشی ئەو کراوە. پێش ئەو نە کەس ئەو میوانەی دیوە، نە کەسیش دەستی پێیان گەیشتووە...

جا ئای بۆ ئەو کاتەی کە قومری ئیلهامی ئەم عەندەلیبە پایەبڵندە بەرەو ئاسمان شاباڵی دەگرت! داستانی تایبەتیترین گوڵی تایبەتیترین باخچەی مەحرەمی مەحرەمەکانی بە ناسکترین ئاوازەکانی دەچڕی و، سینەکان لە خۆشی ئاوازی ئەو، هەموو دەبوونە گوێ و، زمانەکان لە گۆ دەکەوتن و، ڕۆحەکان لە بەرامبەر قەڵبەزەی وێژەکانی ئەودا لەهۆش خۆ دەچوون.

بەڵێ، پەیڤەکانی ئەو وەك دەریایەك بوون کە لەگەڵ هەر شەپۆلێکیدا کەناراوی بە مرواری دەڕازاندەوە. وەك تاڤگەیەك کە لە لوتکەوە بڕژێتە خوار و دڵ پڕ کات لە خرۆش، وا بوو. ئاوازەکانیشی بەو فوارانە دەچوون کە لە قووڵاییە نادیارەکانەوە هەڵدەقوڵین.. نە پەسنی ئەو دەریایانە بە دەوڵەمەندی و ناوەڕۆکی ناویانەوە، نە ڕاڤەی تافی ئەو تاڤگانە و، نە گەیشتنیش بەو جێیانەی ئەو فوارانە پێی گەیشتوون، لە تواناداا نییە.

تا ئێستا بە سەدان لێکۆڵەر و وێژەوان بە دەوری گەوهەری قسەکانی ئەودا پەروانەئاسا سەرگەرمی سووڕان بوون. هەزاران هەزار بیریار هاتوونەتە سەر ئەو سەرچاوەی ئاوی ژیانە و، چەندین کەسی بلیمەتیش ژیانیان لە پەیبردن بە قووڵاییەکانی ئەودا بەسەر بردووە. بەڵام ئەو هێشتاش لەودیوی هەموو ئەو وێستگانەوەیە کە مرۆڤایەتی توانیویەتی

لە ناسینی ئەودا پێی بگات. گەر بە کەمێك دەستکارییەوە ئەو شیعرەی یەکێك لە شاعیرانمان دەربارەی قورئان وتوویەتی، بەکار بهێنین، وا دەزانم لە جێی خۆیدا بێت:

بیکری فیکری کائینات پەرت پەرت بوو، کەچی

هەر لە پەردەی عیصمەتدایە هێشتا بەیانی رەسوول!

بەڵێ، وەك چۆن دڵۆپ ناتوانێت گوزارشت لە تەواوی دەریا بکات و، گەردیلەش دەستەوسانە لە دەرخستنی تەواوی تایبەتمەندییەکانی خۆر، هەر بەو شێوەیەش، عولەما و ئەصفیا و ئەولیا، کە هەریەکەیان پارچەیەکن لە حەقیقەتی موحەممەدی، هەرچەند لەچاو کەسانی تریشدا کامڵ بن، کەچی هەرگیز ناتوانن بەتەواوی واتا نمایندەیی ئەو سەروەرە بکەن و وێنەدانەوەی کامڵی ئەو بن.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) مورشیدێکی کامڵی ئەوتۆ بوو کە نە مەدرەسەی دیبوو، نە قوتابخانە. بەڵێ، ئەو سەروەرە مورشیدێکی کامڵ و موکەممەلی ئەوتۆ بوو، کە لەپەنا پتەویی بونیادە ماددی و مەعنەوییەکەی و، سازگاریی هەست و نەستەکانی و، تۆکمەیی هزر و بیرەکانی و، فراوانی ویژدانی کە هەمیشە ڕووی لە بەرزییەکان بوو، چ جای باڵفتەیی ڕۆحی و پاکیزەیی گەوهەری کە هەروەك خۆی مابووەوە و نەکەوتبووە ژێر کاریگەری پەروەردە و فێرکردنی سیستەمە مرۆییەکان، پاشانیش ئارایشتدانی بە وەحی و، ئەوەش کە پەروەردگاری لەسەر فیترەتێکی وا دروستی کردبوو کە ساز بێ بۆ وەرگرتنی پەیامەکانی پەروەردگاری باڵادەست وەك خۆی و، ئامادەباشییشی تێدا بێت کە ئەو پەیامانە - لەگەڵ پاراستنی ڕەسەنایەتییەکەیاندا - پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات. هەموو ئەمانە لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕابەرە هەرە کامڵەن.

سروشت و خووڕەوشتەکانی، هەستە ناوەکی و دەرەکییەکانی، عەقڵ و داوەرییەکانی، لەگەڵ ئەرکی پێغەمبەرایەتییەکەیدا بەجۆرێك یەك دەهاتنەوە، هەر پەیامێك، هەر شنەی ئیلهامێك لە لای پەروەردگارەوە بهاتایە، بێ ئەوەی بچووکترین گۆڕانکاری

یان شکانەوەی بەسەردا بێ، لەنێو ناوێزەی نوورینی ماهییەتە نوورانییەکەیدا، وەك بلوور دەرازایەوە و، دواتریش لە ڕێگەی درێژە شەپۆلەکانی تەنەزوولات (دابەزینە ئاستی دوێنراو)ەوە دەگەیشت بە ئامانجەکەی.

پەیامە ئیلاهییەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە، لە زولاڵترین کانیاوەوە هەڵدەقوڵێن و دەڕژێنە ناو ئەو پاکیزەترین گیانەوە. ئەویش بە ناسکترین و خاوێنترین و پاراوترین زمان و، بەگوێرەی ئاستی ئیدراکی ئادەمییانە، دەیدات بە گوێی مرۆڤەکاندا. ئەمە هەروەك چۆن پیشاندەری پێغەمبەرایەتییەکەی و بەڵگەی پەیامدارییەکەیەتی، هەرواش، پریاسکە و توێشووی ئەو ڕێ پڕ لە هەوراز و نشێوانە بووکە پیایدا دەڕۆشت و، مەشخەڵ و ڕووناکی دەستی و، دەلیل و بورهانی بوو لەبەرامبەر نەیارانیدا. لە کاتێکدا کە پەیامەکانی پەروەردگاری بە خەڵکی ڕادەگەیاند، نبووەت و ریسالەتەکەی خۆشی ئاشکرا دەکرد. ئینجا هەروەك لە چارەسەرکردنی کێشەی دوێنراوەکانی و بەدەمەوە هاتنی پێداویستییەکانیاندا لە خەزێنە پڕنهێنی و ئەفسوناوییەکانی گەوهەری وەحی سوودی وەردەگرت، هەر بەو جۆرەش، لە دەمکوت کردن و بێ دەنگ کردنی دوژمنانیدا هەر هەمان شمشێری ئەڵماسینی بەکار دەهێنا.

قورئان بۆ ئەو هەموو شتێك بوو: هەوا بوو، ئاو بوو.. چەك بوو، زرێ بوو.. قەڵا بوو، بورج بوو.. وە ئەو ئالآیە بوو کە بەسەر بورجەکانەوە دەشەکایەوە... ئەو بە قورئانەوە هەناسەی دەدا.. هەر بە قورئانیش بە وێنەی هەورەکان بەرەو ئاسمان بەرز دەبووەوە.. لەگەڵیشیدا وەك بارانی ڕەحمەت دووبارە بە هانای بوونەوەرانی سەرزەوییەوە دەهاتەوە.. بە قورئان لەگەڵ تاریکییەکاندا دەجەنگا و، هەر بەویشەوە لە شەڕ و شەڕویستان خۆی دەپاراست. بەدەم قورئانەوە نەعرەتەی دەکێشا و، لەگەڵیشیدا دەبووە ڕووناکی و بەسەر هەموو لایەکدا دەباری.

ئەو سوڵتانی گوفتارەی کە زوبانی پاراوی حیکمەتە، لەپاڵ ئەو گەنجینەی زانستە ئیلاهییەی کە هەرگیز تەواو بوون و خاڵی بوون نازانێت، زۆرێك لەو پرسیارانەی ڕووبەڕووی دەبوونەوە و، زۆرێك لەو کێشانەی پێویستیان بە چارەسەر دەکرد و، تەواوی ئەو بابەتە دینی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییانەی پەیوەست بوون بە ئوممەتەکەیەوە، بە

دڵە پاکە ئەحمەدییەکەی و زوبانە شیرینە موحەممەدییەکەی، کە بە ئاوێنەی تەجەللیی زانستی بێ پایان و، جێ نزول و نێوەند و بێستانی واریداتی سوبحانی دادەنرێت، وەڵامی شایانی دەدانەوە و، گرفتەکانی چارە دەکرد و، ناڕوونییەکانیشی ڕۆشن دەکردەوە و، زۆرێك لە مەسەلە ڕەهاکانی قورئانی سنووردار دەکرد و، سنووردارەکانیشی ڕەها دەکرد. ئەوانەش تایبەتی بوون، دەیگشتاندن و، گشتییەکانیشی تایبەت دەکرد. بەمەش، لەپاڵ قورئانی پیرۆزدا روکنییەت و مەصدەرییەتی دەربڕین و فەرموودەکانی خۆشی بیر دەخستینەوە. جا خۆ لە ڕاستیدا ئەو زاتەی کە ئەرکی موبەللیغ و مورشید و موصلیح و موجەددید دەبینێ و، لە ڕێی پێغەمبەرایەتییە جیهانییەکەیەوە گشت مرۆڤایەتی کردووەتە دوێنراوی و پەیامی خۆی ڕادەگەیەنێت پێیان، هەر ئەمەی لێ دەوەشایەوە و نەدەکرا بە جۆرێکی تر بێ!

ئەو دەمەی سەروەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە پێغەمبەرایەتیی سەرفراز کرا، باشترین و بەبرەوترین شمەکی دوێنراو و گوێگرەکانی لە بازاڕی بازرگانیاندا، زمان پاراوی و ڕەوان بێژی بوو. جا ئەم میللەتە زیرەك و وێژەوانەی کە لە دواییدا بە هۆی باڵادەستییان لە زرنگی و گوفتار و دەربڕیندا، حوکمی دنیایان کرد و جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست، چ لە ڕوانگەی ئەو قورئانەوە بێت کە "وحي المتلو"ە، یان لە ڕوانگەی ئەو پەیام و ڕێنمایی و وتار و گوفتار و ئامۆژگارییانەوە بێ کە لە دەرەوەی وەحین، هەمیشە لە ئاست ئەو نوێنەرە موبارەك و مونەووەرەی پەیامی ئیلاهیدا حەیران مابوون و، سەری ڕێز و نەوازشیان بۆ نەوی دەکرد. جا ئیتر ئەویش دوێنراوەکانی کەمەندکێشی خۆی دەکرد و، دەچووە دڵیانەوە و، بواری ڕەخنەی بۆ نەدەهێشتنەوە. جا خۆ ئەگەر لە بەرامبەر وتە و دەربڕین و بۆچوونەکانیدا بچووکترین ڕەخنە، یان بێ بایەخترین بەرهەڵستی ڕووی دابایە، ئەوا بێگومان دوژمنانی، هەر لە کۆنەوە تا ئێستا دەیانقۆستەوە و فوویان تێدەکرد، مێشێکیان دەکردە گامێشێك و تا ئەو ڕۆژەی هەموو دنیایان بە کەڕ و کوێرییەوە لێ تێدەگەیاند، دەهۆڵیان بۆ لێدەدا. چونکە شتێکی لەو جۆرە، هەلێکی زۆر باش بوو بۆ ئەوانەی کە لەپێناو لەرزەپێخستن و ڕووخاندن و لەبەر چاوخستن و سڕینەوەی ئەو سەروەرەدا، هەر لە بچووکترین بیانووەوە تا دەگاتە بێ ئابڕووترین بوختان،

هەموو شتێکیان بۆ خۆیان بەڕەوا دەبینی. بەڵام خەیاڵیان خاو بوو. ئەمە لە کاتێکدا کە سەبارەت بە هێز و کاریگەریی گوفتار و دەربڕینەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەنانەت هێندەی ئەوەشیان نەوت کە فیرعەون بە حەزرەتی موسای وت. بەڵێ، نەیانتوانی ئەوەندەش بڵێن، خۆ هەر نەشدەکرا بوترێ.

زایەڵەی ئەو دەنگە بەگوڕوتینە، کە لەسەر لوتکەی أَدَّبَنِي رَبِّي فَأَحْسَنَ تَأْدِيبِي بەرز دەبووەوە، نەك بە تەنها دۆستانی، بەڵکو دوژمنانیشی سەرسام کردبوو. هەموویان لە ئاست ئەو گوفتارە بان ئادەمییەدا دۆش دامابوون.

لەنێو هاوەڵە بەڕێزەکاندا بە سەدان بلیمەت و مامۆستای گوفتاری وێنەی حەزرەتی لەبید و خەنسا و کەعب و حەسسان و ئیبن رەواحە، بەسەدان وتاربێژی کاریگەری وەك حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عەلی و موعاویە و عەمری کوڕی عاص، هاودەم لەگەڵ سەدەها ئەربابی حیکمەتدا، لە هەموو بابەتێکدا ئەویان وەك مامۆستا و مورشید و ڕابەری خۆیان قبووڵ کردووە. هەر بەو جۆرە لە سەدەکانی دواتریشدا، حافظ و لێکۆڵەرەوە مەزنەکانی فەرموودە و، ئیمامە بلیمەتە وردەکارەکانی تەفسیر و، موجتەهیدە نایابەکانی فیقهـ و، موجەددیدە چاخ بڕە بێ هاوتاکانی دین و، هەزاران ئەولیا و ئەصفیا و ئەبرار و موقەڕڕەبینی ئاسمانی مەعنەویيات، عەللامە و کەڵەزاناکانی کەلام و مەنتیق و داوەری و زانستە ئەزموونیەکان و هەزاران زانا و شارەزای سەدان بواری جۆاوجۆری تر، هەمیشە گەوهەری دەربڕینە دەریاناساکانی ئەویان بە زوڵاڵترین و سازگارترین و بەبەرەکەتترین و متمانەبەخشترین کانیاو زانیوە و، هەمیشە هاتوونەتە سەری و، پەنایان بۆ هێناوە و، برسێتی و تینوێتییان لەسەر ئەو سفرە ئاسمانییە شکاندووە و، بە دڵنیایی و ئاسوودەیی گەشتوون.

بەڵێ، سوننەتی ئەو، هەر لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ، بێ هەڵەترین و دروستترین سەرچاوەی موجتەهیدەکان و، بەهێزترین باڵی ئەوانەی لە ئاسمانی مەعریفەتدا لە پەروازدان و زوڵاڵترین کانیاوی زانایان و نوورانیترین سەرچاوەی واریداتی ئەولیا و ئەسفیا بووە. زانستە جۆراوجۆرەکانی شەریعەت و، ڕێبازە جیاوازەکانی تەسەووف و، کاکڵە و پوختەی زانستە ئافاقی و ئەنفوسییەکان، هەموو لە گەوهەری گوفتاری نوورینی ئەوەوە درەوشاونەتەوە.

ئەو هەر لە سەرەتای دروست بوونی گەردوونەوە تا کۆتاییەکەی، لە بەدیهێنانی مرۆڤەوە تا گەیشتنی بە بەهەشت یان دۆزەخ، هەر لە بێداربوونەوەی ویژدانەکان بەڕووی مەعریفەتی ڕەببانیدا، تا بینینی جەماڵی ئیلاهی لە دوارۆژدا، هەر لە ئیمان و عەقیدەوە تا دەگاتە ناسکترین وردەکاری عیبادەت و، چەندین بابەتی تریش، هەرهەموویانی بە شێواز و زوبانێکی هێندە کامڵ ڕوون کردووەتەوە، کە ئەگەر قورئانی لێ دەربکرێت، مەحاڵە ڕێت بکەوێ لە گوفتار و دەربڕینێکی تر کە هاوشانی گوفتاری رسول الله بێت.

ئەوەتا لەنێو هاوسەنگییەکی دەراسادا و، هاودەم لەگەڵ ڕەچاو کردنی ناسکی و هەستیاریی بابەتەکە، باس لە خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) دەکات بە زات و سیفات و ناوەکانییەوە. ئینجا دێتە سەر باسی قیامەت و حەشر و نەشر و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخ، هەموو ئەمانەش ئاوێتە بە سامێکی نومێدبزوێن و، ترسێکی بە شادی هەڵگەڕاوەدا. لەودیو کریستاڵێکی تەماوی و، لە نێوەندی ڕازاوەیی غەیبدا، لە فریشتە و ڕۆح و پەری و شەیتانەکان دەدوێت. ئیمان و کردەوە و ئیخلاسی نێو کردەوەمان وەها ڕێکوپێك بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، هەر دەڵێی دەربارەی توانایی تۆو و، هێزی پیت و فەڕی خاك و، ژیانبەخشیی باران و، ڕەنگرێژ بوونی بەهار دەدوێ. وەختێکیش مرۆڤ تەماشای ئەو تابلۆ نایابانە دەکات، هەروەك بڵێی لەبەرچاویدایە کە چۆن خاوەن فیترەتە پاکەکان بە ئیمان قابیلیەتی نەش و نما پەیدا دەکەن، ئینجا بە ئیسلام چڵوپۆپ بەملا و ئەولادا پەخش دەکەن و، لە ڕێگەی ئیخلاسیشەوە باڵا دەکەن و هەروەك درەختی توبای بەهەشتیان لێدێت.

لە دەربڕین و پەیڤەکانی ئەودا نوێژ: هاوڕێ و هاودەمی مرۆڤە لە هەڵسان و دانیشتنیدا و، تەنهایی ناهێڵێ و بە ڕووناکییەکەی ڕێگاکانی بەردەمی ڕۆشن دەکاتەوە. دەستنوێژ: وەك گیان، وەك خوێن بە دەمارەکانی مرۆڤدا هاتوچۆ دەکات، وەك ڕووبار بە بەردەوامی بە بەردەم دەرگایماڵیدا لە هاژە و قەڵبەزەدایە و، هەرچی پیسی و لەکەی ڕۆحی و جەستەیی هەیە، لەگەڵ خۆیدا دەیبات.. بانگ و قامەت: وەك سەروو بە ئاسماندا سەردەکێشن و، بە وێنەی شریخە زراوی شەیتانەکان دەتەقێنن و، دەشبنە بۆن و بەرامەی گوڵ و ڕێحانە و، ڕۆحی بۆ نوێژ ڕۆشتووان دەکەنە گوڵستان.. زەکات

و صەدەقە: هەروەك پردێك بارستە لەیەك دابڕاوەكانی ناو كۆمەڵگە بەیەك دەگەیەنن و، هاوشێوەی لەحیمێكی پتەو پارچە پەرتەوازەكان بە یەكەوە دەلكێنێت.. ڕۆژوو: وەك قەڵغانێك خاوەنەكەی دەپارێزێت و بۆ چوونە ناو بەهەشتی ئەو، دەبێتە دەرگایەكی تەلیسماوی لەنێو شوراكانی بەهەشتدا و بە وێنەی ساقی كاسە بەدەست، ئاوی بەهەشت پێشكەش دەكات.. حەج: وەك بەرگدروویەك بەرگە دڕاوەكان پینە دەكات و، بە وێنەی جلشۆر لەكەكانمان بۆ پاك دەكاتەوە و، وەك كۆڕی ڕاوێژێكی گشتیش، ساڵانە تەواوی باوەڕداران لە ئامێزیدا كۆدەكاتەوە.. جیهاد: وەك گیانفیدایەك سینەی دەكاتە سوپەر و، تەواوی ئەو ڕێیانە دادەخات كە دەچنەوە سەر دۆزەخ و، هاوشێوەی پێشوازكارێكیش ڕێگەكانی بەرەو بەهەشت دەكاتەوە و "فەرموو" لە مرۆڤەكان دەكات، وەك باوكێكی بەسۆزیش ئەوانەی كەللەڕەقی دەنوێنن لە زنجیر دەكێشێت و بەرەو باخەكانی فیردەوس ڕایان دەكێشێت.. زیكر و دوعا: وەك تەلەفۆنێكی بێ تەل بەندە بە خاوەنی خۆی دەگەیەنێ و لەگەڵیدا دەیخاتە ڕاز و نیاز.. فەرمان دان بە چاكە و ڕێگری كردن لە خراپە: هەریەكەیان وەك كارمەندێكی هاتوچۆ، وەك دەرگاوانێك، سەرەڕێ و بەردەرگاكان دەگرن و كاروباری تێپەڕین یا تێنەپەڕین بەو ڕێگایانەدا و، چوونە ژوورەوە یا نەچوونە ژوورەوە لەو دەرگایانەوە ڕێك دەخەن.. سیلەی ڕەحم: وەك دایكێكە، ئامێزی كردبێتەوە و لە چاوەڕوانیدا بێ، دەعوا لەسەر مرۆڤەكان تۆمار دەكات و، دەیانداتە دادگا، لەگەڵیان دەدوێ و بەڵێنیان پێ دەدا، لە ترسی ئەوەی نەبادا تووشی لادان بن، هەڕەشەیان لێدەكات و بەرۆكیان دەگرێت و ڕایاندەتەكێنێ. هەموو ئەمانەش دەبنە كۆمەڵە بزوێنەرێكی زیندوو و، گوێگرانی مەست و حەیران دەكەن.

بەڵێ، چنینی وێنەی تەواوی ئەو بابەتانە كە هەروەك جوانترین پارچەی دەستچن خۆ دەنوێنن، هەروەها تایبەتمەندی ئەو ماددە خامانەی لە چنینی ئەو وێنەیەدا بەكاریهێناون، جووڵە و ئاماژە و دیمەن و هێزی مۆسیقی نێو دەربڕینەكانی و، بەكارهێنانی تەواوی هونەرە ئەدەبییەكان بێ هیچ زۆر لەخۆكردنێك لە جێی خۆیاندا، بابەتانێكن كە هەر یەكێكیان بە تەنها خۆی بەرگێك كتێبی پێویستە بۆ ڕوون بوونەوە و لێ تێگەیشتنی.

هەر بۆیە ئێمەش وتە و دەربڕینە جۆراوجۆرەكانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، كە داخوازی شیكار و توێژینەوەی جۆربەجۆرن و، سەبارەت بە بابەتە جۆربەجۆرەكان

فەرموونی، حەواڵەی توێژەر و پسپۆڕەکانی داهاتوو دەکەین و، لێرەدا تەنها بە ئاماژە کردن بۆ چەند فەرموودەیەك کە لای هەموان زانراون و، هەڵوێستە کردن لەسەر قووڵی ناوەرۆك و، هێزە دەربڕین و، پتەویی وشەکانیان دەست هەڵدەگرین.

## شیکاری چەپکێک فەرموودە

دیارترین تایبەتمەندیی فەرموودەکانی پێغەمبەری سەرورمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەوەیە کە لە هەر بابەتێك دوابێت، گشتگیرترین پەیڤی دەربارەی ئەو بابەتە دەربڕیوە. لەم ڕووەشەوە بەهەزاران نموونە دەبنە پاڵپشتی ئەم قسەیەمان. بەڵام ئێمە لێرەدا هەڵوێستە لەسەر هەندێك لەو فەرموودانە دەکەین کە لە دیدی هەموو کەسێك و، لە هەموو سەردەمێکدا بە "جَوَامِعِ الكَلِم" ناسراون. بەڵام دەبێ چەندبارە جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە تەواوی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە چوارچێوەی ئەم واتایەدا خۆیان دەبیننەوە. فەرموون ئێوە و چەپکێك لەو فەرموودانە:

## ١. چەند ترۆپکەپەیڤێک سەبارەت بە تەوحید

ئیمامی تیرمیذی لە ئیبن عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

يَا غُلَامُ! إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: اِحْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ. اِحْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تِجَاهَكَ. إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ، وَ إِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ. وَ اعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَد كَتَبَهُ اللهُ لَكَ. وَ لَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ. رُفِعَتِ الْأَقْلَامُ وَ جَفَّتِ الصُّحُفُ

"ئەی گەنج! با چەند وشەیەکت فێربکەم: تۆ مافەکانی خوا بەسەرتەوە بپارێزە، تا خوای گەورەش تۆ بپارێزێت. بەڵێ، تۆ ڕەچاوی فەرمانەکانی ئەو بکە تا ئەویش بتداتە پەنای خۆی. کە داوایەکت هەبوو، هەر لە خوا داوای بکە. گەر پێویستت بە یارمەتی

بوو، هەر ڕوو لە دەرگای ئەو بنێ. بشزانە، گەر تەواوی مرۆڤایەتی کۆببنەوە و هەوڵ بدەن سوودێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن هیچ سوودێکت پێ بگەیەنن، مەگەر ئەوە نەبێت کە خوا بۆی نووسیویت. هەر بەو جۆرەش، گەر تەواوی مرۆڤانی دنیا لێت کۆببنەوە تا زیانێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن بچووکترین خراپەت دەرهەق ئەنجام بدەن، مەگەر ئەوە نەبێت کە خوای گەورە لەسەری نووسیویت. جا ئیتر قەڵەمەکان هەڵگیراون و نووسراوەکانیش وشک بوونەتەوە."[1]

جا بڕوانن چۆن لەم چەند ڕستە کورت و پوختەدا، ئاڵۆزترین و سەختترین بابەتەکانی قەدەر و تەسلیمییەت جێیان کراوەتەوە و، لە ڕێی سادەترین شێوازیشەوە ئەم باسە قووڵە ڕۆشن کراوەتەوە! هەروەك چۆن واتای عیبادەتی، تێهەڵکێشی چەمکی بزاوت و هەڵسووڕان کردووە و بەمەش واتاگەلێکی فراوانی لە یەك دوو ڕستەدا کورت کردووەتەوە.

## ٢. مرۆڤ ڕێبوارە

دیسان تیرمیذی لە ئیبن عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) دەگێڕێتەوە:

كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ وَ عُدَّ نَفْسَكَ فِي أَهْلِ الْقُبُورِ

"لە دنیادا وەك غەریب بژی، یان وەك ڕێبوارێك بە، (بەر لەوەش کە بمریت) خۆت لە خەڵکی گۆڕستان بژمێرە."[2]

هەروەك دەبینن، فەرموودەیەکی سێ ڕستەیی، پڕواتاترین و پوختترینی ئەو وتانەی لە خۆ گرتووە کە دەکرێ دەربارەی زوهد و تەقوا و پاراستنی هاوسەنگی دنیا و ئاخیرەت بوترێ. خۆ ئەگەر دەربڕینێکی لەمەش پوختتر هەبێت، بەدڵنیاییەوە ئەوەشیان هەر هی پێغەمبەری خوا دەبێت، با هیچ کەسیش گومانی لەمە نەبێ!

غەریبیی مرۆڤ لەم دنیایەدا ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە. مەولانا وتەنی، مرۆڤ

١ ترمذي، قيامة ٥٩.
٢ ترمذي، زهد ٢٥، بۆ بەشێك لە فەرموودەکە بڕوانە: بخاري، الرقاق ٣.

وەک قامیشی ئەو نەیە وایە کە لە قامیشەڵان لێ کراوەتەوە. ئیتر لەتاو دووری لە خاوەنی ڕاستەقینەی، هەردەم لە ناڵیندایە. وە تا پشکۆی ژینی گەش بێ، ناڵەی ئەم جوداییە دانامرکێتەوە.

مرۆڤ ڕێبوارە. ڕێبوارییەکەشی لە جیهانی ڕۆحەوە دەستی پێکردووە و، بە سکی دایکدا تێپەڕیوە و، بەرەو دنیا ملی ڕێی گرتووە. لێرەش گرۆگاڵی منداڵی داوێتیە دەست بەهاری گەنجی و، گەنجێتیش بەبێ وەستان ڕادەستی پایزی پیری کردووە. ئیدی پیری بە گۆڕ و، گۆڕیش دەرگایەکی بەرەو بەهەشت یان دۆزەخی بە ڕوودا واڵا کردووە. بەڵام پرسیارەکە ئەمەیە: داخۆ مرۆڤ تا چ ڕادەیەك دەرکی بەم ڕێبوارییەی کردووە؟ چونکە ئەگەر بەردەوام وەك ڕێبوارێك تەماشای خۆی بکات، ئەوا بەبێ سەرسم دان و ئاڵۆسکانە داوی جوانییە جۆراوجۆرەکانی دنیاوە، ئەو جوانییانەی کە جگە لە قورسکردنی هەنگاوەکانی ڕێی چ کەڵکێکی تریان نیە، ڕێ دەکات و تا دوا وێستگە بەسەلامەتی بەردەوام دەبێ.

گەر مرۆڤ خۆی وەك یەکێك لە مردووانی گۆڕستان هەژمار نەکات، بە دەربڕینێکی تر، گەر حەقیقەتی "بمرن پێش ئەوەی بمرن."[1] لە ژیان و کردەوەکانیدا بەرجەستە نەکات، ئەوا مەحاڵە بە تەواوی مانا لە فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان پارێزراو بێت. بەڵێ وایە، پێویستە مرۆڤ بە دیوە جیسمانی و نەفسانییەکەدا مردن بچێژێت، بۆ ئەوەی دیوە ویژدانی و ڕۆحانییەکانی زیندوو بێتەوە. جا مەگەر ئەوانەی هەموو شتێکیان بەستووەتەوە بە خواستە جەستەییەکانەوە، هەر ئەو داماوانە نین کە لە ژێر چەپۆکی تەن و لاشەیاندا وردوخاش بوون؟!

## ٣. سەرەنجامی ڕاستی و درۆ

ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەبوداوود لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمویەتی:

عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَ إِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَ مَا

١ عجلوني، كشف الخفاء ٣٨٤/٢.

يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَ يَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقًا. وَ إِيَّاكُمْ وَ الْكَذِبِ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَ إِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ. وَ مَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَ يَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّابًا

"ڕاستگۆ بن! چونکه ڕاستگۆیی مرۆڤ دەگەیەنێته چاکه و، چاکەش مرۆڤ بەرەو بەهەشت دەبات. جا هەر ئەوەندەی مرۆڤ جارێك خۆی دایه دەست ڕاستی و ڕووی کرده ئەو ڕێیه، ئیتر بەردەوام ڕاستبێژ دەبێ و بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێ، تا ئەوەی ئەو مرۆڤه لای خوای گەوره به صِدِّیق "زۆر ڕاستگۆ" تۆمار دەکرێت.

خۆتان بپارێزن له درۆ! چونکه درۆ مرۆڤ دەگەیەنێته خراپه و، خراپەش مرۆڤ ڕاپێچی دۆزەخ دەکات. جا هەر ئەوەندەی مرۆڤ جارێك خۆی دایه دەست درۆ، ئیتر بەردەوام درۆ دەکات، تا دەرەنجام لای خوای گەوره به کَذّاب "زۆر درۆزن" تۆمار دەکرێت..."[1]

ڕاستگۆیی دروشمی پێغەمبەران و، درۆش سیفاتی کافر و مونافیقانه. ڕاستگۆیی بناغەیەکی گرنگه که ئێستا و ئایندەی لەئامێز گرتووه. درۆش لەکەیەکی ڕەشه بەسەر تەوێڵی ڕۆژگارەوه. تاکه کەسێك نییه لەم دنیایەدا که له سایەی درۆدا به ئاسوودەیی ژیابێ و به بەختەوەری هەمیشەیی شاد بووبێ. لەسەر شاڕێی ڕۆشنی بەرەو بەختەوەری ئەبەدی درێژبووەوەی ڕاستیشدا، هەرگیز ڕێت له سیاچارەیەکی دنیا و دواڕۆژ لەدەستچوو ناکەوێت.

درۆ گرنگترین بناغەی کوفر و، دیارترین نیشانەی نیفاق و، ناونیشانی بانگەشه کردنی پێچەوانەی ئەو شتەیه که خوای گەوره دەیزانێت. درۆ - بەتایبەتی له ڕۆژگاری ئەمرۆماندا - بەجارێك پێکهاتەی ئەخلاقی کردووەته وێرانه. دەردێکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆشه، به هۆیەوه دنیا بووەته پاسەوانی درۆزنەکان. هەر نەتەوەیەك دەرگای بەڕوودا کردبێتەوه و، لەنێو خانه و ماڵیدا، له دوکان و بازاڕیدا، له پەرلەمان و سەربازگەیدا

---

١ بخاري، الأدب ٦٩؛ مسلم، البر ١٠٣-١٠٥؛ أبو داود، الأدب ٨٠. (دەقی فەرمودەکه له موسلیمەوه وەرگیراوه)

مافی "گەڕانی سەربەست"ی پێدابێت، بە سەربەرزی نەگەیشتووە و ناشگات. لە بەرامبەریشیدا، بایەخدارترین بنەمای ئیسلامەتی و، دیارترین تایبەتمەندیی ئیمان و، بەردی بناغەی ئەخلاقی موحەممەدی و، جیاکارترین پەسنی ئەنبیا و ئەولیا و، تاقانە تەوەرەی پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی، تەنها و تەنها صیدق و سەرڕاستییە.

یەکێکیان سیمای فریشتان و ئەوی تریان سیمای ئەهریمەنانە. یەکێکیان تایبەتە بە بەندە ڕێزلێگیراوەکانی خودا و ئەوی دیشیان تایبەتمەندیی ڕۆحە پیسەکانە. یەکێکیان پەسنی فەخری کائینات (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) و ئەوی تریشیان سیفەتی دەججالەکانە.

یەکێك لەو وشانەی کە لە دەقەکەدا بەشێوەی بەرابەرکێ بەکارهاتووە، وشەی "بِرٌّ"ە. ئەم وشەیە، کە واتای: گرتنەخۆی گشت جۆرەکانی خێر و چاوگی هەموو کارێکی چاکە دەگەیەنێت، وشەیەکی هێندە گشتگیر و فراوانە کە هەر لە هزری دروست، وتەی دروست و نییەتی دروستەوە بیگرە، هەتاوەکو کردەوەی دروست و ژینی دروست و چەندین بابەتی دیکە دەگرێتەوە. بە کورتی، دەتوانین هەموو واتاکانی خێر و چاکەخوازی بۆ ئەم وشەیە بگێڕینەوە.

لە بەرامبەریشیدا "فُجُورٌ" بەکارهاتووە، کە پێچەوانەی وشەی یەکەمە و لەو ڕووەوە کە لانکەی شەڕ و خراپەیە و داخراوە بەڕووی هەموو جۆرە چاکەیەکدا، بە پێرستی هەموو بیرێکی چەوت و، گوفتارێکی چەوت و، ڕەفتارێکی چەوت دادەنرێت. هەر دەڵێی تۆوی دۆزەخی لەخۆیدا هەڵگرتووە.

هەروەها لە دەقی فەرموودەکەدا هەڵسەنگاندنێکی بەرابەرکێیانە بۆ هەردوو چەمکی "صِدِّيق" و "كَذَّاب" بەرچاو دەکەوێت. پێم وایە گەر چەمکی یەکەمیان بریتی بێت لەو مرۆڤە دروست و سەرڕاستەی کە ڕاستبێژی و ڕاستڕەوی تێیدا وەك فیترەتی دووەمی لێهاتووە، ئەوا چەمکی دووەمیان پێناسێك دەبێت بۆ ئەو درۆزنە زۆرزان و پسپۆڕەی کە سرووشتی لەگەڵ درۆدا ئاوێتە بووە. هەردوو وشەکەش بە شێوەی موبالەغە بەکار هاتوون. وەك بڵێی ئاماژەیەك بێت بۆ ئەوەی کە: ئەو مرۆڤەی سەرڕاستیی کردووەتە کاڵای باڵای و، دروست بیر دەکاتەوە، دروست دەدوێ، دروست هەڵسوکەوت دەکات،

دروست دادەنیشێ و دروست هەڵدەستێ، ئەمڕۆش نەبێت سبەی، بێ شك دەبێتە هێمای ڕاستی و لەخوا نزیکی لە زەمین و ئاسمانەکاندا. لەولاشەوە، ئەو مرۆڤەی خۆی لە لیتاوی درۆدا نوقم کردووە و، بیرکردنەوەی درۆیە، قسە و گوفتاری درۆیە و لەگەڵ درۆدا هەڵدەستێ و دادەنیشێ، زوو بێت یا درەنگ، دەبێتە سیمبولی درۆزنی.

دوا وێستگەی ئەم دوو ڕێگە جیاوازەش، کە تا بڵێی یەکێکیان درێژ و ئەوی تریان کورت، تا چاو برکات ئەمیان ڕووناك و ئەویان تەماوی، تا ئەوپەڕی سنوور یەکێکیان سەلامەت و ئەوی دیکەیان مەترسیدار، بەهەشت و دۆزەخە. لە هەر مەنزڵێك لە مەنزڵەکانی یەکێك لەم دوو ڕێگەیەدا، بزەی پاداشتێکی تاسەبزوێنی پێشوەختی و، پاداشتێکی گوڵڕەنگ بە ڕووی ڕێبوارەکەیدا دەنوێنرێ، تا ئەوەی ڕێ لە بەهەشتدا دەگاتە پایان، ڕێبواری ڕێش نیشتەجێی بەهەشت دەبێت. هەرچی ڕێگەکەی تریشە، لە پاش ئەو هەموو چەرمەسەری و ماندوێتییە، کەچی لە کۆتاییدا ڕێبوارانی فڕێ دەداتە ناو دۆڵی شومی بەدبەختی هەمیشەییەوە.

گەر بیرتان بێ ئەم فەرموودەیەمان لەو جێیەشدا باسکرد کە تایبەت بوو بە "صیدق"ی پێغەمبەری خواوە (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ). بەڵام ئەو خاڵەی دەمانەوێت لێرەدا بە وردی لێی ڕابمێنین، ناوازەیی و لێهاتوویی پێغەمبەری خوایە ) لە بەیان کردنی سەرەنجامی سەرڕاستی لە هەردوو دنیادا، لەلایەکی تریشەوە دیاریکردنی زیانە کەسی و کۆمەڵایەتییەکانی درمی کوشندەی درۆ لە ڕێی چەند ڕستەیەکی کورت و پوختەوە. ئەوەی بەتەنها ئەم فەرموودەیە بخوێنێتەوە، بێ گومان زۆر بە جوانی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە باسکردنی ئەو هەموو بابەتە دوور و درێژ و پڕ لە وردەکارییە، بەو چەند ڕستە کەم و شێوازە بێ وێنەیە، بەهرەمەندییەکە تەنها پێغەمبەری خوای پێ شەرەفمەند بووە. جگە لەویش بۆ هیچ کەسێکی تر نەلواوە و ناشلوێت.

## ٤. مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدایە کە خۆشی دەوێت

ئیمامی بوخاری و موسلیم دووبارە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕنەوە: اَلْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ "مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت."[١]

ئەگەر هەستین بە شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی ئەم فەرموودەیە، بەلایەنی کەمەوە کتێبێکی یەك بەرگی لێ دەردەچێت. ئەم فەرموودەیە، کە پەرداخە ئاوی کەوسەر، بگرە ئاوی ژیان پێشکەشی ئەو دڵە شکاو و خەمبارانە دەکات کە لە ڕێ کردندا بوون بەڵام لە کاروان جێماون.. ئەوانەی نەیانتوانیوە بەتەواوی جێ پێی ڕابەرەکانیان هەڵبگرن.. ئەوانەی خوازیار بوون ئەرکەکانی سەرشانیان بەجوانی بەجێ بێنن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، ئەم فەرمایشتە بە ڕێژنەی ئاوی خۆی، پشکۆی داگیرساوی دڵیان دەکوژێنێتەوە و، پێیان دەڵێت کە لە هەردوو جەمسەرە ئەرێنی و نەرێنییەکەدا مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسە دەبێت کە خۆشی دەوێت. مرۆڤ چ لێرە و چ لەولا، هەر لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبێت کە خۆشی دەوێن. مادەم وایە، ئەو کەسەی دەیەوێ لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیداندا بێت، سەرەتا دەبێت ئەوانی خۆش بوێت، تا بتوانێت هاوبەشی کۆڕیان بێت. یاخود بە دەربڕینێکی تر، ئەوانەی لە بەهەشتدا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیداندا پێکەوەن، ئەوانەن کە لێرە تۆوی خۆشەویستی ئەوانیان لە سینەدا چاندووە و، لە هاودەمی و مەعییەتی ئەواندا ژیاون. بیرمان نەچێت، حوکم و واتاکانی فەرموودەکە بۆ ئەوانەش کە نوێنەرایەتی خراپە دەکەن، هەر هەمان شتە.

جا هەروەك بینیتان، ئەم فەرموودە تاك ڕستەییە، بە هەزاران مانا و ناوەرۆکی لەم جۆرەی بەو شێوازە پوخت و کورتبڕە دەربڕیوە. خۆ ئەگەر ئەمە بەڵگە بێ لەسەر شتێ، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گوفتارێکی لەم جۆرە تەنها دەکرێ لە فەتانەتێکەوە سەرچاوەی گرتبێ کە هەڵقوڵاوی وەحی و ئیلهامی خواییە.

---

١ بخاري، الأدب ٩٦؛ مسلم، البر ١٦٥.

یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە ناوی نوعەیمان بوو، جاروبار مەیی دەخواردەوە و پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) حەددی شەرعی بەسەردا جێبەجێ دەکرد. ئەو کارەی نوعەیمان دەیکرد گوناهـ بوو. بەڵام کە جارێکیان یەکێك لە هاوەڵان قسەیەکی تەشەرئامێزی ئاڕاستە کرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بڕۆکانی لێکنا و، فەرمووی: "هاوکاری شەیتان مەکەن لە دژی براکەتان. سوێند بە خوا، ئەو (نوعەیمان) خوا و پێغەمبەرەکەیی زۆر خۆش دەوێت."[1]

جا لەبەر ئەوەی تۆوی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی بەهەشتەمیوەی هاودەمی و پێکەوەیی ئەوانی بەرهەم دەهێنا، ئەوا کەسێکی لەم جۆرە چەندە گوناهکاریش بێت، شایانی ئەوە نابێت کە قسەی ناشرینی پێ بوترێت. چونکە ئەو خوا و پێغەمبەرەکەیی خۆش دەوێت. ئەم خۆشەویستییەش بۆ کەسێك کە فەرزەکانی بە جێ دێنێ و، خۆی لە گوناهە گەورەکان دەپارێزێت، بەسە بۆ ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلاةٍ وَسَلام) کۆی بکاتەوە. چونکە مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت.

## ٥. تەقوا

ئیمامی تیرمیذی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر گیان (عَلَيْهِ أَكْمَلُ التَّحَايَا) فەرموویەتی:

اِتَّقِ اللهَ حَيْثُمَا كُنْتَ وَ أَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَ خَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ

"لە هەر کوێیەك بوویت، ترسی خوات هەبێ! بە دوای خراپەدا یەکسەر چاکە ئەنجام بدە تاوەکو بیسڕێتەوە. لە مامەڵە کردنیشدا لەگەڵ خەڵکی لە ڕەوشتی جوان لامەدە."[2]

هیچ شتێک نییە هێندەی ئاکار و ڕەوشتی جوان، مرۆڤ بەرەو عەرشی کەماڵات بەرز بکاتەوە. ئەو ڕەوشتە جوانەی کە ڕەوشتێکی خواییە و، واتای ڕەفتار کردن و ڕەنگدار بوون دەگەیەنێت بە ڕەوشتە خواییەکان.

١ بخاري، حدود ٤-٥؛ عبدالرزاق، المصنف ٣٨١/٧، ٢٦٤/٩.
٢ ترمذي، البر ٥٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٥٣/٥.

بەڵێ ئازیزان، لەبەردەم فەرمووودەیەکداین کە لە بابەتێکی هێندە قووڵ دواوە مەگەر بە چەندین بەرگ کتێب ئینجا بتوانرێت ڕاڤە بکرێت. ئەوەتا بە چەند وشەیەکی کەم ئاماژە دەکات بۆ چەمکی تەقوا و هۆکارەکانی پاراستنی و ڕێگەکانی بەرجەستە کردنی ئەم شعوورە لە گشت کایە و گۆشەکانی ژیاندا. جا لەبەر ئەوەی لێرەدا تەنها وەك نموونەیەك هێناومانەتەوە، ناچینە نێو لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی ئەو حەقیقەتە بەرزانەوە.

## ٦. خۆتان چۆن بن، وەها فەرمانڕەوایی دەکرێن

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەفەرموێت: كَمَا تَكُونُوا يُوَلَّى عَلَيْكُمْ "خۆتان چۆن بن، وەهاش فەرمانڕەوایی دەکرێن."[1]

بارودۆخی خۆتان چۆن بێت، هی سەرکردەکانیشتان بەو جۆرە دەبێت. خۆتان سەرچاوەیەکی چۆن بن، فەرمانڕەواکانیشتان بەرهەمی ئەو سەرچاوەیە دەبن. ئەم فەرمایشتە، فەرمایشتێکی هێندە بەرزە، دەتوانرێت چەندین فەرهەنگی بواری بەڕێوەبردنی لەسەر بنووسرێت. ئێستاش با بە کورتی هەڵوێستەیەك لەسەر فەرموودەکە بکەین:

فەرموودەی: "هەمووتان شوانن و هەمووشتان بەرپرسن لەوەی لەژێر دەستاندایە."[2] ئاسۆیەکمان بۆ وێنا دەکات کە بە پێی ئەو ئاسۆیە هەموو کەسێك سنوورێکی لێپرساوێتی هەیە. ئیتر ئەمە بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە ئاستی سەرۆکی وڵات. سەرۆکی وڵاتیش بەرپرسیارە لە تەواوی ئەو بازنەیەی کە سەرپەرشتی دەکات. جا بۆیە بەرمایشتی: "خۆتان چۆن بن، وەها فەرمانڕەوایی دەکرێن." لەڕوانگەی مافە کۆمەڵایەتییەکانەوە ڕەهەندێکی زۆر جیاواز دەبەخشێتە بابەتەکە:

یەکەم: فەرموودەکە ڕوو دەکاتە ئەوانەی فەرمانڕەوایی دەکرێن و، پێیان دەڵێت: "ئێوە زۆر گرنگن، چونکە ئەوانەی دەبنە فەرمانڕەواتان، لە هەر ڕێگەیەکەوە بێت

١ إبن جميع، مجمع الشيوخ ١٤٩؛ ديلمي، المسند ٣/٣٠٥.
٢ بخاري، جمعة ١١؛ مسلم، إمارة ٢٠.

ناچارن که له دەرگای ئێوه بدەن. واته، ئەوه ئێوەن که شکڵ و شێوەی ئەوان دیاری دەکەن."

هەروەك دەزانین زانستی کۆمەڵناسی کۆمەڵه بنەمایەکی نەگۆڕی تایبەت بە خۆی هەیە. وەك چۆن زانستەکانی فیزیا و کیمیا و ئەستێرەناسی، بنەماگەلێکی نەگۆڕی تایبەت بە خۆیانیان هەیە و بە یاساکانی "شەریعەتی فیتری" ناویان دەبەین، هەر بەو جۆرە، زانستی کۆمەڵناسیش خاوەنی کۆمەڵه پرەنسیپ و بنەمایەکه کە تا قیامەت گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت. هەر بۆیە گەر مرۆڤەکان ڕێگە بدەن بە نەش و نمای خراپە و خراپەکاری لەناویاندا و، ئامێزیان کراوە بێت بۆ لە باوەش گرتنی خراپە، ئەوا بەدڵنیاییەوە لە لایەن خراپەکار و شەڕخوازەکانەوە حوکمیان دەکرێت. ئەمەش یاسای نەگۆڕی خوداوەندە.

ئایا لە بونیادی کۆمەڵگەدا شەڕ و شەڕخوازی زەمینەی لەباری گەشەکردنی بۆ ڕەخساوە؟ داخۆ تۆوی خراپەکاری لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا چەکەرەی کردووە؟ جا هەر ئەوەندەی ئەمانە سەریان هەڵدا، ئەو کات خوای گەورەش لە هەمان گڵ و لە هەمان هەویر، مرۆڤانێك دەهێنێت و بەم جۆرە ئا ئەوانە دەبن بە فەرمانڕەوا بەسەریانەوە.

دووەم: لە لایەکی ترەوە فەرموودەکە ئاماژە بۆ ئەم خاڵەش دەکات: "دەستوور و یاساکان تەنها مەرەکەبی سەر کاغەزن و کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نیە. با خەڵکییش هەموو کۆببنەوە و بیر و هزریان یەك بخەن و تۆکمەترین دەستوور دابڕێژن، بایەخێکی وای نییە. ئەوەی گرنگە، ڕەچاوکردن یان پێشێلکردنی ئەو یاسایانەیە." بەم پێیە، خاڵی سەرەکی بریتییە لە پێکهاتەی ئەخلاقی ئەو خەڵکەی فەرمانڕەوایی دەکرێ. خۆ ئەگەر ئەوان کەسانێکی خاوەن ڕەوشت بن و، چارەسەرسازی کێشە و گرفتەکانی خۆیان بن، ئەوا ئەو کەسانەی فەرمانڕەواییان دەکەن هەرگیز کەسانێکی گرفتاویی دەرناچن.

مادەم باسەکە گەیشتە ئێرە، با بەسەرهاتێك بگێڕمەوە:

لەناو یەکەمین دەستەی ئەندامانی پەرلەماندا پیاوێك هەبوو بە ناوی تاهیر ئەفەندی. ئەم زاتە ئەهلی عیلم و فەزڵ بوو. وەختێك ئەندام پەرلەمانەکانی تر بۆ کۆکردنەوەی

(ئەمانەت - تەبلیغ - فەتانەت)

دەنگ لە مەیدانەکاندا خەریکی وتاردان بوون، ئەم هەمیشە دەخزایە گۆشەیەك و بێدەنگیی هەڵدەبژارد. بەڵام لە یەکێك لە جارەکاندا لایەنگرانی زۆری لیَ دەکەن تا بڕوات قسە بۆ خەڵکی بکات. هەرچۆنێك بێت قایلی دەکەن، ئەویش دێتە مەیدان و دەست دەکات بە قسەکردن. تاهیر ئەفەندی پیاوێك بوو کەم، بەڵام پوخت دەدوا. لەوێشدا کورت و پوخت پێیان دەڵێت: ”ئەی خەڵکینە! بزانن کە ئێوە "مُنتَخِب"ن و منیش "مُنتَخَب"م. ئەو شوێنەش کە بڕیارە ئێمە بۆی بچین "مُنتَخَب إلَيْهِ"یە. بەو کارەش کە ئێوە ئەنجامی دەدەن دەوترێت "إنتِخَاب". ئینتخابیش لە "نُخْبَة"وە دێت و، نوخبەش واتە "سەرتوێژ". جا بیرتان نەچێت، بنی هەر شتێك چی بێت، سەرتوێژەکەشی هەر لەوە دەبێت. لەسەر ماست سەرتوێژی ماست و، لەسەر شیریش سەر توێژی شیر دروست دەبێت...“

ئەگەر پێویست بکات ڕوونکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە دەستەواژە عەرەبییەکانی دەربڕینەکەی سەرەوە بخەینە پێش چاو، ئەوا دەڵێین: "مُنتَخِب" بەواتای "هەڵبژێر" و، "مُنتَخَب" بە واتای "هەڵبژێرراو" و، "مُنتَخَب إلَيْهِ" بە واتای ئەو جێیەی کە هەڵبژاردنی بۆ دەکرێت و "إنتِخَاب"یش بە واتای "هەڵبژاردن" دێت و لە وشەی "نُخْبَة"وە وەرگیراوە.

ئەمەش نموونەیەکی تر:

وەڵامەکەی حەجاج بۆ ئەو کەسەی کە باسی دادپەروەری حەزرەتی عومەری لەلا کرد لە سۆنگەی ڕوونکردنەوەی بابەتەکەمانەوە گرنگی خۆی هەیە: حەجاج لە وەڵامدا دەڵێت: ”گەر ئێوە ئەو مرۆڤانەی سەردەمی حەزرەتی عومەر بوونایە، بێ شك منیش حەزرەتی عومەر دەبووم.“

سێیەم: پێویستە هەر مرۆڤێك لە خودی خۆیدا بەدوای هەڵە و خراپەکاندا بگەڕێت. هەتا هەر یەکەمان پارێزەری خۆی بێت و بەردەوام لە دەرەوەی خۆمان بە شوێن هەڵەکاندا بگەڕێین، هەرگیز ناتوانین هەنگاوی ئیجابی بەرەو پێش بنێین... هەتاوەکو مرۆڤەکان لە جیهانی ناوەوە و ناخی خۆیاندا خۆیان نەگۆڕن، خوای گەورە نایانگۆڕێت.[1] ئەگەر

---

١ بڕوانە: سورەتی الرعد، ئایەتی ١١.

دارِمانێك لە ناخدا سەرهەڵبدات، ئەوا بە دڵنیاییەوە بە هەموو لایەكدا بڵاو دەبێتەوە. هەر ئەوەندەش نا، بەڵكو لوتكەكانیش دەگرێتەوە. ئەم قسەیە سەبارەت بە ئیستیقامەتی ناو ناخی مرۆڤەكانیش هەر هەمان شتە. لەمەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی كە كاریگەری بارودۆخی حوكمكراوان لەسەر حوكمڕانان، بە جۆرێك لە جۆرەكان هاوشێوەی ئەو كاریگەرییەیە كە "هۆكار" لەسەر "ئەنجام" هەیەتی. داخۆ كێ دەزانێ چەند حیكمەت و بنەمای تر لە ڕۆحی ئەم گەوهەری گوفتارەدا خۆیان حەشاردابێ؟! دەبێ كەسانی خۆی چ پەند و وانە گەلێكی لێ هەڵبگۆزن!..

بەڵێ، مەحاڵە ڕێت بكەوێ لە گوفتارێكی تری ئادەمی، كە بە شێوەیەكی وەها كورت و پوخت بونیادی كۆمەڵگەیەكی دروستی ڕوون كردبێتەوە و لە هەمان كاتیشدا ڕێوشوێنی گەیشتن بەو ئامانجەشی خستبێتە بەردەست. ئەوە تەنها حەزرەتی موحەممەدی خاوەن فەتانەتی ئەعظەمە (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) كە هەر پەیڤێكی شابازی ئاسمانی دەربڕین و گوفتارە...

بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە ڕووی دەربڕینەوە لەنێو تەواوی مرۆڤەكاندا خاوەنی بەرزترین و نایابترین پلەیە و ئەستەمە هیچ وێژەوان (أديب)ێك پێی بگاتەوە. وتەكانی ئەو قورئان نین، بەڵام سەرتاپا هەڵقوڵاوی كانیاوی ئیلهامی ئیلاهین. هەر بۆیە وەك لە سەرەتای باسەكەشدا ئاماژەمان پێدا، تێكڕای وێژەوان و شارەزایانی وێژە و ئەدەبیات، تەنها ئەوەندەیان پێ دەبرێت كە ببنە گەدای بەردەركی ئەو سوڵتانە.

حەسسانی كوڕی ثابت شاعیرێكی مەزنی بەتوانایە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا "خەنسا" لە شیعرێكی چوار بەیتییدا هەشت هەڵەی لێگرتووە. جا ئەم خاتوونە كە تا ئەو ڕادەیە لە شیعردا لێهاتوویی بەدەست هێنابوو، پاش ئەوەی گوێ لە پێغەمبەری خوا ڕادەگرێت، موسڵمان دەبێت و هەموو ئیش و كارێكی دەبێتە گوێگرتن لەو سوڵتانی دەربڕینە. بە گوێگرتن لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، بە جۆرێك لەهۆش خۆی چووبوو و كەمەندكێشی كەشە ئەفسوناوییەكەی بووبوو، ئەو ئافرەتەی لە سەردەمی جاهیلیدا بە لاواندنەوە بۆ مەرگی براكەی دنیای نوقمی ماتەم كردبوو، پاش ئەوەی لە قادسیەدا چوار كوڕی شەهید بوون، نەك ئەوەی تەنها وشەیەكیشی لە دەم دەرنەچوو

که بۆنی نارەزایی لێ بێ، بەڵکو هەڵوێستێکی نواند، شایستەی ئەوە بێ مێژوو لە شکۆدارترین لاپەڕەکانی خۆیدا تۆماری بکات، ئەو کەڵەئافرەتە لە بەرامبەر ئەو تابلۆ دەروون هەژێنانەدا تەنها ئەم چەند وشەیەی لە زار هاتە دەر: "خۆشبەخت خۆم، بوومە دایکی چوار شەهید. خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ."[1]

خەنسا ئافرەتێکی "مُلْهَمْ" بوو. واتە لەو کەسانە بوو کە بەهرەمەندی ئیلهامن. لەگەڵ پێکان و کەوتنە سەر زەوی هەر کوڕێکیدا، بەجۆرێك ئاگر بەردەبووە گیانی، دەتوت تیرەکان ئەمیان پێکاوە. بەڵام وابەستەیی ئەم ئافرەتە مەردە بە پێغەمبەری خواوە هێندە پتەو بوو، تەنانەت تاکە سکاڵایەکیش بەو زارە بە ئیلهام گوشادەیدا نەهاتووە.

## ٧. کار و کردەوەکان بەگوێرەی نییەتن

ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەبوداوود لە حەزرەتی عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی:

إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَ إِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ و رَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَ رَسُولِهِ، وَ مَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ

"کار و کردەوەکان تەنها و تەنها بەگوێرەی نییەتەکان هەڵدەسەنگێنرێن. نییەتی هەرکەس چی بێت، دەستکەوتیشی ئەوە دەبێت. هەر کەسێك هیجرەتی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی (بە مەبەستی ڕەزامەندی ئەوان) کردبێت، ئەوا هیجرەتەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بۆ هەژمار دەکرێت. هەر کەسێکیش لەبەر ماڵێك کە دەستی بکەوێت، یان ئافرەتێك کە مارەی ببڕێت، هیجرەت بکات، ئەوا هیجرەتەکەی بۆ لای ئەو شتەیە کە هیجرەتی بۆ کردووە."[2]

لەبەر ئەوەی هیجرەت هۆکاری شەرەف صدووری ئەم فەرموودەیەیە، هەربۆیە تەوەری

١ بڕوانە: إبن عبدالبر، الإستيعاب ١٢٨٩/٤؛ إبن الأثير، أسود الغابة ١٠١/٧.
٢ بخاري، بدء الوحي ١، أيمان ٢٣؛ مسلم، الإمارة ١٥٥؛ أبو داود، الطلاق ١٠.

سەرەکی فەرموودەکە هیجرەتە. بەگوێرەی ڕیوایەتەکە، سەروەری جیهانیان بە بۆنەی ئەم ڕووداوەی خوارەوە ئەم فەرمایشتەی فەرمووە:

هاوەڵان لەپێناوی خوادا مەککەیان بە جێ دەهێشت و بەرەو مەدینە هیجرەتیان دەکرد. بەڵام یەکێك لە هاوەڵان کە ناوەکەی نازانین، لەبەر خاتری ئافرەتێك بە ناوی "ئوم قەیس"ەوە کە خۆشیدەویست کۆچ دەکات.[1] بە دڵنیاییەوە ئەم زاتە باوەڕدار بوو، بەڵام نییەت و بیرکردنەوەکەی پێش ڕەفتارەکانی نەکەوتبوو...

ئەویش هەر موهاجیر بوو، بەڵام موهاجیری ئوم قەیس. ئەو هەموو زەحمەت و ناخۆشییانەی کە بە تەنها لەپێناوی خوادا دەچێژرا، ئەم لەپێناو ئافرەتێکدا چەشتی. ئیدی ئەم ڕووداوە، بێ ئەوەی ناوی کەسی تێدا بهێنرێت، بوو بە بابەتی ئەو فەرموودە پیرۆزەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا. جا لەبەر ئەوەی تایبەتی بوونی هۆکار، ڕێگر نییە لە گشتگیر بوونی حوکم، ئەوا حوکمی فەرموودەکە گشتگیرە و هەموو کەسێك و هەموو ڕووداوێك دەگرێتەوە.

## نییەت

بەڵێ، نەك تەنها هیجرەت، بەڵکو تەواوی کار و کردەوەکان بە گوێرەی نییەتە. ئەگەر مرۆڤ تەنها بە نییەتی خوا و پێغەمبەرەکەی هیجرەت بکات، ئەوا لە بەرامبەردا خوا و پێغەمبەرەکەی بەدەست دەهێنێت. ئەمە لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتیشدا هەر وایە. هەروەك لە فەرموودەیەکی پێشووتریشدا باسی لێوە کرا، ئەو مرۆڤەی ڕەچاوی مافەکانی پەروەردگار بکات، هەمیشە پەروەردگار لە پەنا خۆیدا دەبینێتەوە. ئەم لەپەنا بوونەش لە شێوەی ڕەحمەت و چاودێری و کەرەمی خوای گەورەدا تەجەللی دەکات. کاتێك مرۆڤ ئەمانەی دەستکەوت، دەجۆشێ و لەخۆ دەچێ و دەچێتە سوجدەوە و هەوڵدەدات کە زیاتر لە خوای خۆی نزیك ببێتەوە.. هەتا لە خوای خۆشی نزیک بێتەوە، ئەم هەست و شعوورە لە سەرجەم کار و کردەوەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە، وەختێکیش لێرە دەپەڕێتەوە و هەنگاو بەرەو ئەو جیهانە دەنێت کە هەموو شتێکی تێدا گۆڕاوە

١ طبراني، المجمع الكبير ١٠٣/٩؛ إبن حجر، فتح الباري ١٠/١.

و شکڵێکی تری وەرگرتووە، واتە لە گۆڕدا، لە بەرزەخدا، لە حەشردا، لەسەر پردی سیراتیشدا لە سایەی باڵادەستی ئەم شعوورەدا، هەمیشە خوای گەورە لە پەنای خۆیدا دەبینێتەوە. خۆ ئەگەر کردەوەکانی بتوانن بیگەیەننە "لِواءُ الْحَمْد"، ئەوا لەوێشدا بە دیداری سەروەری هەردوو جیهان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) شاد دەبێت و سەرفرازی هاوەڵێتییەك دەبێ، کە ئەندێشە لە دەرکیدا دەستەوسان دەمێنێ.

لە کاتێکدا ئەو کەسەی نییەتی بۆ خوا نییە، سەرباری هەموو ڕەنج و کۆششەکانی، ئەگەر مەبەستی لە هیجرەت دەستکەوتنی دڵی ئافرەتێك بووبێت، ئەوا تەواوی ئەو چەرمەسەرییانەی کێشاونی، بە خاتری چەند ئارەزوویەکی جەستەیی بوون و هیچی تر.. بە واتایەکی تر، هەموو ئەو ناڕەحەتیانەی چەشتوونی، دەبنە تۆزی بەربا و خەسارەتمەند و ڕەنجەڕۆ خۆیەتی.

ئەو مرۆڤانەی هەردەم ژیانێکی جەستەییانە بەسەر دەبەن و هەموو هەڵسوکەوتێکیان لە چوارچێوەی تێرکردنی ئارەزووە جەستەییەکانیاندا خۆی دەبینێتەوە و بۆ جارێکیش بێت گوێ نادەن بە دەنگی ڕۆح و ویژدانیان، ئەوانە لە پای هیچ دێن و دەچن و ژیانیان لە بێهودەییدا بەفیڕۆدەدەن و هەرگیز ئەو ئەنجامە بەدەست ناهێنن کە کەسانێ ژیانیان بۆ خوا تەرخان کردووە، بەدەستی دەهێنن. مەگەر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە فەرمایشتێکی تردا نافەرموێت: نِيَّةُ الْمُؤْمِنِ خَيْرٌ مِنْ عَمَلِهِ "نییەتی باوەڕدار لە کارەکەی خێرترە."[1] چونکە لە ڕاستیدا مرۆڤ هەرچەندێکیش هەوڵ بدات، هێشتا هەر ناتوانێت دەستی بگات بەو کارەی کە لە نییەتیدایە. ئەوە ڕەحمەتی بێ سنووری خوای باڵادەستە کە لە کار و کردەوەکانماندا زیاد لە خودی کردەوەکە، بەگوێرەی نییەتی دڵمان مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات.

هەربۆیە ئەو پاداشتەی نییەت دەستی مرۆڤی دەخات، بەدڵنیاییەوە زۆر لەوە زیاترە کە لە کردەوەکانییەوە دەستی دەکەوێت. جا بۆیە لەم ڕووەشەوە نییەتی باوەڕدار، لە کارەکەی خێرترە.

---

١ الطبراني، المجمع الكبير ٦/١٨٥-١٨٦؛ البيهقي، السنن الصغرى ٢٠.

لێرەدا سەرنجتان بۆ لای فەرموودەیەك ڕادەكێشم كە پەیوەندی بە بابەتەكەمانەوە هەیە. سەروەرمان لەو فەرموودەیەدا دەفەرموێت:

أَلَا وَ إِنَّ فِي الجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَ إِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَ هِيَ الْقَلْبُ

"ئاگادار بن! لە جەستەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو چاك بێت، هەموو جەستەكە چاك دەبێت. خۆ ئەگەر تێكبچێت و خراپ ببێت، ئەوا هەموو جەستەكە خراپ دەبێت. بزانن ئەوە دڵە!"[1]

ئەگەر بە ئیخلاسەوە كار بكەن، ئەوا تەواوی ئەو تۆوانەی دەیچێنن، بێ شك چاو بە ڕووی ژیاندا گوشاد دەكەن. لەوانەیە لە سەرەتاوە وەك نەونەمام، سیس و لاواز دەربكەون، بەڵام بە تێپەڕبوونی كات، هەر یەكە وەك سەروویەكی سەركەش بە ئاسماندا دەچن. ئێوەش لە دواڕۆژدا لە ژێر سێبەرەكانیاندا دەحەوێنەوە. بەڵێ، ئەوان بە گوێرەی ساغ و دروستی نییەتەكانتان چەكەرە دەكەن و گەشە دەسێنن. تا دواجار لە شێوەی میوەی بەهەشتدا خۆیانتان بۆ دەنوێنن.

هەروەها بەهۆی نییەتەوە عادەت و خووەكانی مرۆڤ حوكمی عیبادەت وەردەگرن. ئەو كەسەی بە نییەتی عیبادەتی شەوەوە دەنوێت، تەنانەت هەناسەكانیشی بە زیكر بۆ حساب دەكرێن. جا ئەگەر وا نەبوایە، چۆن دەكرا بەم تەمەنە كورتە و، بەم تۆزە كردەوەیە بەهەشت بەدەست بێت؟ بەڵێ، ئەگەر بڕیار بێت ژیانێكی هەمیشەیی پێشكەشی ئیماندار بكرێت، ئەوا ئەمە لوتف و بەخششێكی ئیلاهییە بەو نییەتەی دەبەخشرێت كە بۆ بەندایەتی هەمیشەیی هێناوییەتی. ئیتر بەم شێوەیە نییەتەكەی بەهەشتێكی نەبڕاوەی دەست دەخات. لەلایەكی ترەوە، هەمان شت كافریش دەگرێتەوە. واتە ئەویش شایانی دۆزەخی نەبڕاوەیە.

بەڵێ، ئێمەی خواپەرست بە نییەتی بەندایەتییە ئەبەدییەكەمان شایستەی چوونە بەهەشت دەبین، بابای كافریش هەروا.. بە نییەتی كوفران و سپڵەییە ئەبەدییەكەی

---

١ بخاري، الإيمان ٣٩؛ مسلم، المساقاة ١٠٧.

شایانی چوونە دۆزەخ دەبێت. بەڵێ، ئەو ئیکسیرەی نرخ و بەها دەبەخشێتە کردەوەکانمان، هەر لە بچووکترینیانەوە هەتا گەورەترینیان و، وەك بڵێی گیان دەکات بەبەریاندا، تەنها و تەنها نییەتە. بگرە لە کارە چاکەکاندا زۆر شت هەیە کە تەنها بەهۆی نییەتەوە دەستگیرمان دەبێت. بۆ نموونە، گەر مرۆڤێك نییەت لە چاکەیەك بهێنێت، بەڵام دواتر نەتوانێت ئەنجامی بدات، ئەوا پاداشتەکەی هەر بۆ دەنووسرێت. ئەگەر ئەنجامیشی بدات، ئەوا بەگوێرەی حاڵەتەکەی، جار هەیە دە هێندە، جار هەیە سەد هێندە و جاری واش هەیە زۆر لەوە زیاتر پاداشتی دەدرێتەوە. ئەمە لە حاڵێکدا کە ئەگەر خراپە هەر لە نییەتدا بمێنێتەوە، بە گوناه نانووسرێت. کاتێکیش خراپەکە ئەنجام دەدرێت، تەنها بە یەك گوناه دەنووسرێت.[1] بەدڵنیاییشەوە گوناهی هەر خراپەیەك، داخوازی سزایەکە لە جۆری خۆی.

## هیجرەت

لەم نێوەندەدا نابێت ئەوەش لەیاد بکەین کە لە فەرمووودەکەدا گرنگییەکی تایبەت دراوە بە هیجرەت. ئەگەرچی بە واتا تایبەتییەکەی هیجرەت کۆتایی پێهاتووە، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: لَا هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ "لە دوای فەتحی مەککەوە هیجرەت نەماوە."[2] بەڵام بە واتا گشتییەکەی هیجرەت بەردەوامە و تا ڕۆژی قیامەتیش هەر بەردەوام دەبێت. چونکە هیجرەت دەستە خوشکی جیهادە، پێکەوە لە دایك بوون و پێکەوەش دەژین. هەر پێغەمبەر گیان خۆشیەتی پێمان ڕادەگەیەنێت کە جیهاد تا قیامەت دەمێنێت. ئەوەتا لەم بارەیەوە دەفەرموێ: الْجِهَادُ مَاضٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ "جیهاد هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت."[3]

بەڵێ، هەر مرۆڤێکی باوەڕدار و خاوەن بانگەواز کە لە پێناوی ڕوونکردنەوە و گەیاندنی حەق و حەقیقەت بە دەروونە موحتاجەکان، لە دایك و باوك و یار و

١ بڕوانە: بخاري، رقاق ٣١؛ مسلم، إيمان ٢٠٣-٢٠٨.
٢ بخاري، جهاد ١؛ مسلم، إمارة ٨٣-٨٦.
٣ طبراني، المجمع الأوسط ٩٦/٥. (بۆ چەند فەرموودەیەکی تر کە بە دەقی جیاواز ئاماژە بۆ هەمان واتا دەکەن بڕوانە: بخاري، جهاد ٤٤؛ أبو داود، جهاد ٤)

یارانی جیادەبێتەوە و، نیشتمانەکەی جێدەهێڵێت و شار بە شار و وڵات بە وڵات دەگەڕێ تا دڵەکان بە پەیامەکەی ڕووناك بکاتەوە، بێگومان دەچێتە ناو بازنەیەکی چاکەکێشی (الدائرة الصالحة) هیجرەتی نەبڕاوەوە. بەدڵنیاییشەوە پاداشتی شایانی خۆی وەردەگرێت. لە لایەکی ترەوە پاداشتی ئەو هیجرەتەی لەپێناوی خوا و پێغەمبەرەکەیدا ئەنجام دەدرێت، چوارچێوەیەکی دیاریکراوی بۆ دانەنراوە. لەوانەیە ئەمە ئاماژەیەك بێت بۆ ئەوەی کە پاداشتی ئەم جۆرە کردەوانە لەو دنیا لە شێوەی دیارییەکی چاوەڕوان نەکراودا پێشکەش دەکرێت. بە واتایەکی تر، فریشتەکان کارەکە وەك خۆی دەنووسنەوە، پاداشتەکەشی خوای میهرەبان خۆی تەقدیری دەفەرموێت.

واژەی (إِنَّمَا) کە لەسەرەتای فەرموودەکەدا هاتووە، واتای حەصر دەگەیەنێت. بەم پێیە، واتاکە بەم جۆرەی لێ دێت: "کارەکان تەنها بە نییەت دەبنە شایانی ئەوەی بە کار لە قەڵەم بدرێن." ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ عیبادەتێك بەبێ نییەت قبووڵ نابێت. جا ئەگەر مرۆڤ بە بێ نییەت، هەزار ڕەکات نوێژ بخوێنێ و چەندین ساڵ برسی دانیشێ و چی ماڵ و موڵکی هەیە سەرفی بکات و بچێ بۆ حەج و هەموو ڕوکنەکانیشی بە جێ بهێنێ، ئەوا ئەو کەسە، نە نوێژی کردووە، نە ڕۆژووی گرتووە، نە زەکاتی داوە و نە فەریزەی حەجیشی بەجێ گەیاندووە. کەواتە ئەو شتەی هەموو ئەم جووڵە و هەڵسوکەوتانە دەکات بە عیبادەت، نییەتە.

## هیجرەت لە گوناه

ئەگەر جارێکی تر چاوێك بە بابەتەکەدا بخشێنینەوە، دەبینین کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە سەرەتاوە بابەتێکی فراوان و هەمەلایەنەی وەك نییەتی بە سێ وشە ڕوون کردووەتەوە. دواتریش بە دوو سێ ڕستە، ئاماژەی بۆ بابەتێکی قووڵ و ناوەڕۆکداری وەك هیجرەت کردووە. جا جێ کردنەوەی سەرجەم هیجرەت و موهاجەرەتەکان (اَلْهِجْرَة وَ الْمُهَاجَرَة)، هەر لەو هیجرەتەوە کە بە واتای دوورکەوتنەوە لە گوناه دێت، تا ئەو هیجرەتانەی کە تا ڕۆژی قیامەت لە ڕێگەی خوادا دێنە ڕێ، لە دوو سێ ڕستەدا و، دەربڕینیان بە شێوازێك کە (سەهلی مومتەنیع) بێت، تەنها و

تەنها کاری ئەو زاتەیە کە فەرمایشتەکانی وەك لەعل و گەوهەر وان.

پێم وایە ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتەش لە جێی خۆیدا بێت: گەورەترین موهاجیر ئەو کەسەیە کە لە گوناهـ دووردەکەوێتەوە و لە غەیری خۆشەویستی خوا، هەموو خۆشەویستییەکی تر لە دڵیدا دەسڕێتەوە و فڕێی دەدات.[1] جارێکیان ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم کەوتبووە ڕازونیاز لەگەڵ پەروەردگاریدا: "پەروەردگارا! بە عیشقی تۆوە دڵبەست بووم، هەرچی شتە لە غەیری تۆ، پشتم تێکردووە و ڕووم لە قاپیت ناوە. لە دوای تۆ، چاوم چۆن ببینێ غەیری تۆ."

لەو کاتەدا کە لەگەڵ ئەم دوعایانەدا بە قووڵترین زەریاکانی بوونی خۆیدا دەگەڕا و، لە ئاسمانی مەعنەوی ئەم دوعایەدا باڵی بە یەکدا دەدا، لە کەناری کەعبەدا کوڕەکەی دەبینێت، کوڕەکەشی ئەم دەبینێت. حەسرەتی ساڵانێك دووری بەرەو یەکتر دەیانخاتە ڕێ. ڕێك لەو کاتەدا کە باوەش بەیەکدا دەکەن و شنەی دیداریان حەسرەتی سینەی پڕغەمیان بە با دەکات، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم گوێی لە هاتفێك[2] دەبێت: "ئیبراهیم! لە دڵێکدا جێی دوو خۆشەویستی نابێتەوە."

ئیتر لەو کاتەدا ئیبراهیم ناڵەی دووەمی لێ بەرز دەبێتەوە و، دەڵێت: "پەروەردگارم، ئەو شتەم لێ بسێنە کە دەبێتە ڕێگر لە خۆشەویستی تۆ!" ئەمە دەڵێت و هەر لەوێدا کوڕەکەی لە نێو کۆشیدا سارد دەبێتەوە و گیانی دەردەچێت...[3]

## هیجرەت بەرەو ڕەحمەتی ئیلاهی

هەڵهاتن لە گوناهەکان و چوونە دەرگای ڕەحمەتی ئیلاهی، ئینجا جێنەهێشتنی ئەو دەرگایە هەتا ئەو کاتەی فەرمانی لێخۆشبوون دەردەچێ.. ئەمەش بۆ خۆی هیجرەتێکە. ئەم ئاهـ و ناڵەیە چەندە جوان گوزارشت لەمە دەکات:

إِلَهِي عَبْدُكَ الْعَاصِي أَتَاكَ     مُقِرًّا بِالذُّنُوبِ وَ قَدْ دَعَاكَ

١ ئەو فەرموودەیەی لەم بابەتە دەدوێت اَلْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللهُ عَنهُ لە دواییدا ڕاڤە دەکرێت.
٢ "هاتف" دەنگێکی بەرزە کە دەبیسترێت، بەڵام سەرچاوەکەی نابینرێت.
٣ فریدالدین عطار، تذكرة الأولياء، بەشی ژیانی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم.

وَ إِنْ تَغْفِرْ فَأَنْتَ أَهْلٌ لِذَاكَ     وَ إِنْ تَطْرُدْ فَمَنْ يَرْحَمْ سِوَاكَ

"ئیلاهی بەندەی گوناهبارت بۆ لای تۆ هاتووە

دان بە گوناهیدا دەنێ و لە تۆ دەپاڕێتەوە

ئەگەر لێی خۆش بی ئەوە لوتف و گەورەیی خۆتە

ئەگەر دەریشی کەیت، جگە لە تۆ کێ هەیە بەزەیی پێدا بێتەوە!"[1]

ئەو مرۆڤەی کە گەڕانەوەی بۆ ناو گوناهەکانی پێشووی - پاش ئەوەی وازی لێهێنابوون - بە ئەندازەی چوونە ناو دۆزەخ بەلاوە سەخت و ئازاربەخشە، مرۆڤێکە بە تەواوی مانا و بە بەردەوامی لە ڕێی هیجرەتدایە.

ئەو مرۆڤەی دوا بەردەکانی سنووری بازنەی کارە حەڵاڵەکان وەك کێڵگەیەکی پڕ لە مین دەبینێ و، هەرگیز نزیکی ناکەوێتەوە و بەردەوام وریای دەست و قاچ و چاو و گوێ و زمان و دڵییەتی، مرۆڤێکە تا کۆتایی ژیانی هەر بە ڕێبواری ڕێی هیجرەت هەژمار دەکرێت. جا ئەم مرۆڤە چ بێتە ناو خەڵك و لەگەڵیاندا بژی، یاخود بخزێتە کونجێك و خۆی لە هەموو شتێك داببڕێت، ئەوا کۆچی پیرۆز هەمیشە لە قووڵایی ناخیدا هاوسەفەری ڕاستگۆ و دڵسۆزیەتی. ئەوەندە هەیە کە لە دابڕان (عوزلەت)دا ڕەهەندێکی جیاوازی هیجرەت نومایان دەبێت. مرۆڤ لەوێدا دەگاتە مەقامی "أُنس بِالله" و بە نەفەحاتی ئیلاهی سەرفراز دەبێت.

لەلایەکی ترەوە فەرموودە پیرۆزەکە "دلالة"، هەر هیچ نەبێ "إیماء" و "إشارة"ی تێدایە بۆ ئەم لایەنانە:

١. نییەت ڕۆحی کردەوەیە، کاری بێ نییەت بەمردوو دادەنرێت.

٢. نییەت ئیکسیرێکی نوورین و پڕنهێنیی ئەوتۆیە کە کاری چاکە دەگۆڕێت بە خراپە و، خراپەش بە چاکە.

---

١ بەشێکە لە موناجاتی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (بڕوانە: القلوب الضارعة ٣٢٤)

٣. کردەوەکان تەنها بە نییەت دەبن بە کردەوە. هیجرەتی بێ نییەت بریتییە لە گەشت و گوزار، جیهادیش زۆرداری و خۆسەپاندن، حەجیش سەفەرێکی خۆهەڵخەڵەتێن، نوێژیش وەرزشێکی جەستەیی، ڕۆژووش جیاوازییەکی نابێت لەگەڵ پارێز و ڕێجیم. تاکە شتێکیش کە هەریەك لەم عیبادەتانە بکات بە پەڕ و باڵ و خاوەنەکەی بەرەو بەهەشتی بێ پایان بخاتە پەرواز، نییەتە.

٤. بەهەشتی هەمیشەیی پاداشتی نییەتی بەندایەتی هەمیشەییە. دۆزەخی هەمیشەییش بەرهەمی ویست و نیازی ئینکاری ئەبەدی و کوفری هەتاهەتاییە.

٥. مرۆڤ لە سایەی نییەتەکەیەوە دەتوانێت بە کۆششێکی زۆر بچووك و خەرجییەکی زۆر کەم، شتانێکی زۆر گەورە و بەنرخ بەدەست بێنێت.

٦. ئەو کەسانەی سەرمایەی نییەتیان بەباشی بەکار دەهێنن، دەتوانن هەرچی موڵکی دنیا هەیە بەدەستی بێنن.

٧. دنیا و ئافرەت لەگەڵ ئەوەی بە جۆرێك دروستکراون کە ئامادەیی بوونە نیعمەتیان تێدایە، کەچی خراپ بەکارهێنانی ئەم نیعمەتانە، یاخود ڕێکنەخستنی پەیوەندی و مامەڵەکان بەگوێرەی پێوەرە شەرعییەکان، وا دەکات کە ئەم نیعمەتانە جێی ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەرەکەی بگرنەوە. هەر بۆیە لەوانەیە لەو دەمەدا کە چاوی بڕیوەتە قازانج و چاوەڕوانی دەستکەوتە، ئەم دووانە - دنیا و ئافرەت - هەموو شتێکی لەکیس بدەن...

جا ئەمانە و چەندین بابەتی وردی هاوشێوەی ئەمانە، وێڕای ئەوەی کە هەریەکەیان بۆ خۆی سەرباسێکی سەربەخۆیە، کەچی لە گوفتاری ئەو سوڵتانی گوفتارەدا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)، ئەو سوڵتانەی کە لە گەردیلەیەکدا خۆر دەردەخات و دەریایەکیش دەخزێنێتە دڵۆپێکەوە، تەنها سێ چوار وشە بەسە بۆ دەربڕینی ئەو ناوەرۆکە مەزن و بێ شومارە.

## ٨. بەڵای زمان و دەست

دووباره له یەکێك لەو فەرموودانەی ئیمامی بوخاری و ئەبوداوود له گەنجینەی "جَوَامِعِ الكَلِم"ی پێغەمبەری خواوه بۆمان دەگێڕنەوه، پێغەمبەری پێشاوامان (صَلَّىاللّٰهُعَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێ:

اَلْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمَسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ وَ الْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللّٰهُ عَنْهُ

"موسوڵمانی ڕاستەقینه ئەو کەسەیه که موسوڵمانان له زمان و دەستی ئەمین و بێ زیان بن. موهاجیری ڕاستەقینەش ئەو کەسەیه که پشت هەڵدەکات لەو شتانەی خوای گەوره نەهی لێ کردووه."[1]

## ئیمانداری نموونەیی

ئێستا با به کورتی فەرموودەکه شی بکەینەوه:

له سەرەتای وشەی "الْمُسْلِم"دا لامی ناساندن (لام التعريف) بەکارهاتووه. هەمان شت له وشەی "الْمُسْلِمُون"یشدا دەبینین. ئەو واتایەش که ئەم دوو لامی تەعریفه دەیگەیەنن بریتییه له: ئیمانداری نموونەیی ئەو کەسەیه که به دڵ و به گیان چووەته نێو کەش و هەرێمی ئاشتی و ئارامی و ئاسایشەوه و خۆی تێدا تواندووەتەوه.. بۆیه نه به زمانی و نه به دەستی خراپەی بۆ هیچ کەسێك نییه. لێرەدا باس له موسوڵمانی سەر پێناس، یان ئەو کەسه نییه که وا دەردەکەوێت و لافی ئەوه لێدەدات که وابێ، بەڵکو لەو ئیمانداره ڕاستەقینه نموونەییه دەدوێت که وێنەی له هەموو زیهنێکدا نەخشاوه. بەڵێ، بەکارهێنانی لامی تەعریف به مەبەستی "عَهْد" ئەم واتایانه دەچۆڕێنێته بۆتەی هزرمانەوه. واته بەگوێرەی دەستووری "إِن إِطْلاق الذِّكر يصرفُ نَحْوَ كَمالِ الوَصف" کاتێك دەوترێ ئیماندار، بەراییترین وێنه که له زیهندا دروست دەبێت، وێنەی کامڵترین ئیمانداره. جا ئەو ئیماندارەی که له فەرموودەکەدا ئاماژەی بۆ کراوه، ئا ئەم جۆره ئیمانداره‌یه.

دەرککردنی کەسی ئاسایی بەم وردەکارییانەی زمان کارێکی هەروا ئاسان نییه.

---

١ بخاري، الإيمان ٤؛ أبو داود، الجهاد ٢.

چونکە ئەم کارە تەنها بۆ ئەوانە دەلوێ کە لە حوجرە و مەدرەسەکاندا، یان لە خزمەتی مامۆستایەکدا چۆکیان داداوە و هەگبەی زانستی خۆیان لە توێشووی زانستی زمانەوانی و وردەکارییەکانی ڕێزمان پڕکردووە. بەڵام خۆ پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هیچ کام لەمانەی بەخۆوە نەدیوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە قسەکانی ئەو لە خۆیەوە نین، بەڵکو ئەو قسانە دەکات کە مامۆستای ئەزەلی (جَلَّ جَلَالُهُ) فێری دەکات. هەر بۆیە لە گوفتار و دەربڕینەکانیدا پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەموو تایبەتکاری و وردەکارییەکانی زمانی ڕەچاو کراوە و بچووکترین ناتەواوی تێدا نابینرێت.

با بگەڕێینەوە سەر فەرمایشتەکەی خۆمان: موسوڵمانی ڕاستەقینە، مرۆڤی دڵنیایی و ئاسایشە. بە چەشنێك کە هەموو موسوڵمانان دەتوانن بێ دوودڵی ڕەە وەربگێڕن و لێی دڵنیابن. چونکە دەزانن کە هیچ زیانێکیان لەوەوە پێ ناگات. بۆ نموونە، ئەگەر پێویستی کرد خێزان و خانەوادەکەیان ئەمانەتی یەکێك بکەن، ئەوا بێ هیچ چاو لەدووەمانێك دەتوانن ئەمانەتی ئەوی بکەن. چونکە هەموان لە دەست و زمانی پارێزراون. ئەو کەسەی لە مەجلیسێکدا لەگەڵی دانیشتووە، لە پاش جێهێشتنی مەجلیسەکە، لە پشتی خۆی ئەمینە. چونکە دڵنیایە کە نە غەیبەتی خۆی دەکەن، نە گوێش بۆ غەیبەتی کەسانی دی ڕادەگرن. ئەم موسوڵمانە، چەندە لە خەمی شەرەف و کەسایەتی خۆیدایە، ئەوەندەش بەتەنگ شەرەف و کەسایەتیی کەسانی ترەوەیە. تا گەدەیەکی برسی مابێ، خواردن چییە ئەم نایزانێ. تا تینوویەك وەستابێ، قومێك ئاو بەخۆی ڕەوا نابینێ. دەژی، بەڵام تەنها لەپێناو ژیاندنی کەسانی تردا. هەر ئەمەندە نا، بەڵکو لەپێناو بەرامبەرەکەیدا زۆر بە ئاسانی دەستبەرداری هەست و چێژە مەعنەوییەکانیشی دەبێ!

ئێمە هەموو ئەم واتایانە لە لامی تەعریفەکەی سەرەوە هەڵدەگۆزین کاتێك وەك ئامرازێك بۆ حەصر بەکاردێت.

## سیلم و موسوڵمان

تایبەتمەندییەکی تری فەرموودەکە، بەکارهێنانی ڕەگەزدۆزی (جناس)ە. ئەوەتا وشەی "مُسْلِم" و کرداری "سَلِمَ"، هەردووکیان داتاشراوی هەمان چاوگن کە "سِلم"ە. جا لەبەر

لێکچوونی هەندێك لە پیتەکانیان، ڕەگەزدۆزییەکی ناتەواو، واتە (الجناس الناقص) لەنێوانیاندایە. بەڵام "باب"ی هەردوو وشەکە جیاوازن. هەروەها ئەم لێکچوون و جیاوازییە ئەوەشمان وەبیر دێنێتەوە کە: موسوڵمان ئەو کەسەیە کە هەموو کاروبارێکی ژیانی لەسەر خولگەی ئاشتی و ئارامی و بێوەییدا دەگوزەرێنێ. خۆی داوەتە دەست جازیبەیەکی ئیلاهی ئەوتۆ، کە هەموو جموجووڵێکی بەگوێرەی ئەو چەقەهێزە بەڕێوە دەچێت.

سەلام لە هەموو کەسێك دەکات، بیناسێت یان نەیناسێت. بەمەش ئاڵای خۆشەویستی لە هەموو دڵەکاندا بۆ هەڵدەدرێت.

کاتێکیش لە نوێژ دەبێتەوە، سەلام دەداتەوە. هەرچی ئینس و جین و مەلائیکەت و بوونەوەرانی خاوەن شعووریش هەن، هەر هەموویان وەڵامی سەلامەکەی دەدەنەوە. تەنانەت ئاڵوگۆڕی سەلام لەگەڵ ئەو بوونەوەرانەشدا دەکات کە ئەم نایانبینێت. جگە لە موسوڵمانیش هیچ کەسی تر نەبووە ئەوەندە گرنگی بە سەلام کردن بدات و بەو جۆرە بڵاوی بکاتەوە و برەوی پێ بدات.

هاتنە ناو ئیسلام بە هێنانەجێی روکنگەلێکی وەك کەلیمەی شەهادەت و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج دەبێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا واتای شوێنکەوتنی فەرمانی ﴿ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ ﴾ (البقرة : ٢٠٨) "هەموو بە جارێك بچنە ناو سیلمەوە."یە و، چارۆکە هەڵدانە لە دەریای سیلم و سەلامەتیدا. جا ئەو کەسەی خۆی داوەتە دەست شەپۆلەکانی ئەو دەریایە، هەموو حاڵێکی بۆنی سیلم و ئیسلامی لێدێت. جگە لە چاکەش کەس چاوەڕێی شتێکی تر ناکات لەو مرۆڤەی گەیشتووەتە ئەم پلەیە.

## بۆچی دەست و زمان؟

وەك تەواوی فەرموودەکانی تری پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەم فەرموودەیەشدا هەموو وشەکان بەوپەڕی دیقەت و وریاییەوە هەڵبژێرراون. ئەوەتا لێرەشدا باس لە دەست و زمان دەکرێت. بێگومان باس کردنی ئەم دوو ئەندامە بە تەنها لەنێو هەموو ئەندامەکانی تردا، چەندین حیکمەت و خاڵی سەرنج ڕاکێشی تێدایە. مرۆڤ گەر بیەوێت زیان بە

کەسێکی تر بگەیەنێت بە دوو جۆر دەتوانێ ئەم کارە بکات. ئەمەش یان ڕووبەڕوو یان لەپاشەملە. لێرەدا دەست هێمایە بۆ زیانگەیاندنی ڕووبەڕوو. هەرچی زمانیشە ئاماژەیە بۆ ئەو زیانەی کە لە پاشەملەدا دەدرێت. مرۆڤ یان ڕاستەوخۆ بە دەست زیان بە کەسی بەرامبەر دەگەیەنێت و مافی دەخوات، یان لە پاشەملە بە زمانی غەیبەتی دەکات و لە ڕێز و شکۆی کەمدەکاتەوە و بەم جۆرەش مافی پێشێل دەکات. ئەم دوو حاڵەتە ناشیرین و قێزەونەش هەرگیز لە موسوڵمانی ڕاستەقینە ناوەشێتەوە. چونکە ئەو هەمیشە حەقویست و جوامێرانە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسانی تردا دەکات، ڕووبەڕوو بن یا لە پاشەملە.

لایەنێکی دیکەی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) زمانی پێش دەست خستووە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کەسی بەرامبەر جاری وا هەیە دەتوانێت بەرپەرچی ئەو زیانە بداتەوە کە لە ڕێی دەستەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بەڵام ئەو غەیبەتەی یاخود ئەو بوختانەی لە پاشەملە دەکرێت، زۆر جار بێ بەرامبەر دەمێنێتەوە و، ئەو کەسەی بووەتە قوربانی، ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات. بۆیە ڕەفتارێکی لەم جۆرە زۆر بە ئاسانی دەتوانێت تاك و کۆمەڵ و تەنانەت نەتەوەکانیش بدات بە گژ یەکدا و گیانیان لە یەکتر حەڵاڵ بکات. هەروەها بەدواداچوونی ئەو خراپەیەی لە زمانەوە دەردەچێت قورسترە لە بەدواداچوونی ئەو خراپەیەی لە ڕێی دەستەوە ئەنجام دەدرێت. هەر بۆیە سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) زمانی پێش دەست خستووە. لە لایەکی تریشەوە فەرموودەکە جەخت لەسەر ڕێز و شکۆی مرۆڤی موسوڵمان دەکاتەوە لە لای خوای گەورە. مرۆڤی موسوڵمان لای خوای گەورە هێندە بەها و حورمەتی هەیە، کە پێویست دەکات هەموو موسوڵمانێك لەبەرامبەر برا موسوڵمانەکەیدا ئاگای لە دەست و زمانی بێت و ڕەچاوی مافی بەرامبەرەکەی بکات.

ئەگەر یەکێك لە ڕەهەندە ئەخلاقییە گرنگەکانی ئەم ئیسلامەتییەی کە بە هزری ئاسایش و ئاشتی جیهانییەوە هاتووە، بریتی بێت لە دوورکەوتنەوەی تاکی موسوڵمان لەو شتانەی زیانی ماددی و مەعنەوی پێدەگەیەنن، ئەوا ڕوکن و ڕەهەندێکی گرنگی تری بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە زیانگەیاندن بە کەسانی تر، با کەمیش بێت. ئەمە بەلایەك، پێویستە لە هەموو ئاست و توێژێکی کۆمەڵگەدا ببێتە نموونەی ئاسایش و دڵنیایی.

بەڵێ، موسوڵمان بە ئەندازەی ئەو هەستی ئاسایشەی لە ناخیدا هەڵیگرتووە و، بە ڕێژەی ترپەکانی ئەو دڵەی کە بە دڵنیایی و متمانەبەخشییەوە لێدەدات، موسوڵمانێکی ڕاستەقینەیە.. ئیدی موسوڵمانی ڕاستەقینەش لە هەرجێیەك کە بۆی دەڕوا، لە هەر شوێنێك کە تیایدا هەڵدەسێ و دادەنیشێ، یەك پارچە بەرجەستەکاری ئەم هەستەیە کە لە (السلام)ەوە هەڵقوڵاوە: کاتێك دەگات بە موسوڵمانان سەلامیان لێ دەکات و ئاسایش پەخش دەکات.. کە لێشیان جیادەبێتەوە، هیوای سەلامەتییان بۆ دەخوازێت، ئەوجا دەڕوات.. تەحییاتی نوێژەکانی بە سەلام دەڕازێنێتەوە.. ئەو دەمەش کە لە حوزووری پەروەردگاری جیا دەبێتەوە، هەر بە سەلامکردن لە باوەڕداران جیا دەبێتەوە. جا ئیتر وەها مرۆڤێك کە تەواوی ژیانی بەم شێوەیە لەسەر خولگەی ئاشتی و ئارامی بەڕێ دەکات، مەحاڵە بنەما فیکرییەکانی خۆی پشتگوێ بخات و ڕێیەکی دژ بە ئاسایش و متمانە و تەندروستی و سەلامەتی ماددی و مەعنەوی، دنیایی و ئوخرەوی بگرێتە بەر. یاخود بیر لەوە بکاتەوە کە زیان بە خۆی یان چواردەورەکەی بگەیەنێت...

پاش ئەم ڕوانینە گشتییە، پێمان باشە چاوێك بخشێنین بە چەند لایەنێکی تری فەرموودەکەدا کە هەر لە ڕۆحی ئەو کانیاوە سازگارەوە سەرچاوەیان گرتووە:

أ. موسوڵمانی ڕاستەقینە متمانەپێکراوترین نوێنەری ئاشتەوایی جیهانییە.

ب. موسوڵمان لە هەر جێیەك بێ بۆن و بەرامەی ئەم هەستە بەرزەی ناو کرۆکی ناخی پەخش دەکات.

ج. ئەو نەك هەر دوورە لەوەی ببێ بە ئەزیەت و ئازار، یاخود زیان بۆ کەسانی دی، بەڵکو لە هەر شوێنێکدا ناوی ببرێت، وەك هێمایەك بۆ ئاسایش و ئارامی یاد دەکرێتەوە.

د. لە دیدی ئەودا جیاوازییەك نییە لە نێوان ئەو دەستدرێژییەی بە دەست دەکرێ، لەگەڵ ئەو فیتنە و دەستدرێژییانەی کە لە ڕێی زمانەوە ئەنجام دەدرێن، جا غەیبەت بێ یان بوختان، بەکەم زانین بێت یا قسەهەڵبەستن. بگرە هەندێ جار تاوانی دووەمیان لەوەی یەکەمیان گەورەترە.

هـ. ئەگەر موسوڵمانێك هەندێك لەم گوناهانەش ئەنجام بدات، هێشتا هەر موسوڵمانە

و بە لەدین دەرچوو دانانرێت. واتە بەگوێرەی بیروباوەڕی ئێمە شتێك نییە ناوی "مەنزلێك لە نێوان کوفر و ئیماندا" بێت.

و. بە وێنەی سەرجەم کایەکانی تر، پێویستە لە بابەتی ئیمان و ئیسلامیشدا هیممەتمان بەرز ڕابگرین و داخوازی کەمالاتی ئینسانی بین، واتە بە موسوڵمانێتییەکی هەروا سادە ڕازی نەبین، بەڵکو ئیماندارێتی کامڵ بکەینە ئامانج... جا هەروەك بینیتان، ئەمانە و چەندین لایەنی وەك ئەمانەش لەسەر ئەو زارەی کە گوفتارەکانی موعجیزەیە، لە تەنها دێڕێکدا جێیان کراوەتەوە.

سەبارەت بەو بەشەی فەرموودەکەش کە دەربارەی موهاجیرە، تەنها بەو بەرکوڵەی سەرەوە واز دێنین و دەچینە خزمەت فەرمایشتێکی نوورینی تری ئەو گیانی گیانانە (صَلَّىَاللهُ تَعَالىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

## ٩. وازهێنان لەوەی پەیوەندی پێتەوە نییە، لە جوانی ئیسلامەتییەوەیە

سەروەری هەردوو جیهان (صَلَّىَاللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێ: مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ "لە جوانی ئیسلامەتی موسوڵمان وازهێنانیەتی لە هەر شتێك کە پەیوەندی پێوە نییە..."[١]

بێگومان پەی بردن بە کرۆکی فەرمایشتەکە و، دەوروەدانی ئاسۆی ئەم دەربڕینە کورتە، لە ڕێی وەرگێڕانێکی لەم جۆرە، کارێکی ئەستەمە.

فەرموودەکە باس لەو نهێنییە دەکات کە بە هۆیەوە ئیسلامەتی ئیماندار شکۆفە دەکات و دەگاتە پلەی ئیحسان و ئیتقان. واتە، ئەو ئیماندارەی لە ڕووە دەرەکی و کردارییەکەیدا گەیشتووەتە ئاستێکی تێروتەسەل و دوور لە کەموکورتی، هەروەها لە ڕووە ناوەکیەکەشیدا نهێنی ئیحسانی لە خۆیدا بەرجەستە کردووە، پێویستە بەشێوەیەکی ڕەها دەستبەرداری مالایەعنییات بێت. گومانیش لەوەدا نییە کە دەستبەرداری دەبێت...

١ ترمذي، الزهد ١١؛ إبن ماجة، الفتن ١٢.

## جددییەتی ناخ لە ڕواڵەتدا ڕەنگ دەداتەوە

ئەو مرۆڤانەی ژیانیان خاڵییە لە جددییەت و بەردەوام خەمسارد و بێباکن، لە پەرستشەکانیشیاندا هەروان. ئاوەها مرۆڤێك لەوانەیە کاتێك بۆ نوێژ دەوەستێت، جددی دەربکەوێت. بەڵام ئەگەر لە جیهانی ناوەوەیدا، لە دڵ و ویژدانیدا، جددییەتی پەیدا نەکردبێت، ئاوا تەنها گوڵەستێرەیەکە و ماخۆلانیەتی وەك ئەستێرە دەربکەوێت. ڕوونیشە کە دەرکەوتنی بەم شێوەیە زۆر ناخایەنێت. کەسایەتییەکان ناشاررێنەوە. چار نییە زوو بێت یان درەنگ، هەر مرۆڤێك کەسایەتییەکەی چۆن بخوازێت، ئاوا خۆی دەنوێنێت. مەگەر ئەوەی جددییەت بوویێتە ئاکارێکی دانەبڕاوی کەسایەتییەکەی. مرۆڤیش دەتوانێت لەڕێی مەشق و ڕاهێنان و کۆنترۆڵکردنێکی چڕوپڕی نەفسەوە ئەم پلەیە بەدەست بێنێت. جا لە ئەگەری بوونی وەها ڕاهێنان و کۆنترۆڵێکدا، "بەو شێوەیە بوون" پێش "بەو شێوەیە دەرکەوتن" دەکەوێت.. مەعلومی جەنابیشتانە کە چۆلەکە ناتوانێت بۆ ماوەیەکی زۆر وەك تاووس عەرزی ئەندام بکات و خۆی بنوێنێ. واتە مرۆڤ ڕۆڵەی نەست و لاشعووریەتی. ناتوانێت لێی هەڵبێت و لە دەستی قوتاری ببێت.

دەتوانین بابەتەکە بەم شێوەیە کۆبکەینەوە: دەبێ لە ناوەوەدا ئیحسان هەبێ، تاوەکو لە دەرەوەدا ئیتقان ببێ. دەرەوەی مرۆڤ دەبێ هەمیشە لە ناخیەوە هێز و کۆمەك وەربگرێت. پێویستە جیهانی ناوەوەی مرۆڤ ڕەنگی جددییەتی گرتبێ، تاوەکو ڕووپەڕی دەرەوەی جددییەت نومایان بێت.

حەزرەتی عومەر لەسەر پێشنیارکردنی یەکێك لە هاوەڵە گەورەکان بۆ مەقامی خەلافەت، دەفەرموێ: "ئەو زاتە لە هەموو ڕوویەکەوە شایانە بە خەلافەت. بەڵام گاڵتە و سوعبەتی کەمێك زیادە. لە کاتێکدا دەزانن کە خەلافەت بابەتێکە پێویستی بە جددییەت هەیە."[١]

خەلافەتێك کە بەڕێوەبردنی خەڵکە پێویستی بە جددییەتە، ئەی ئەو خەلافەتەی کە نوێنەرایەتی کردنی پەروەردگارە لەسەر زەوی، پێویستی بە جددییەت نییە؟

١ طبري، تأريخ الأمم و الملوك ٥٨١/٢، إبن عساكر، تأريخ دمشق ٤٣٨/٤٤، ٤٥٣/٤٥؛ إبن الأثير، النهاية في غريب الحديث ١١٨/٢.

ئاخر مرۆڤێك لە حوزووری پەروەردگاردا ئەو جددییەتەی لا دروست نەبووبێت کە بەندەی ملکەچی ئەو زاتە مەزنەیە، چاوەڕێی چ جددییەتێکی لێ دەکەی لە ئیش و کارەکانی تریدا؟

## هەستی ئیحسان و جددییەت

"مِنْ"ی سەرەتای فەرموودەکە، حەرفی جەڕرە و واتای حەصر دەگەیەنێت. بەمەش ئاماژە بۆ ئەو ڕێیە دەکرێ کە پێویستە موسوڵمان بیگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە ڕازی ئیحسان. ئەو ڕێیەش بریتییە لە وازهێنان لە خەمساردی و بێباکی. بەڵێ، تاوەکو مرۆڤ جددییەت بەدەست نەهێنێت و دەستبەرداری گوێ پێنەدان و بێباکی نەبێت، مەحاڵە بەرز بێتەوە بۆ پلەی ئیحسان.

لە فەرموودەکەی جوبرەئیلدا پلەی ئیحسان وەك دواقۆناغ باسی لێوە دەکرێت. کاتێ جوبرەئیل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ): سەرەتا پرسیاری ئیمان پاشان پرسیاری ئیسلامی لێکرد. ئینجا لەدوای تەصدیق کردنی ئەو وەڵامانەی کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دانیەوە، پرسیاری ئەوەی لێ کردووە کە ئایا ئیحسان چییە؟ پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

اَلْإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ "ئیحسان ئەومیە خوای گەورە بپەرستیت هەروەکو ئەوەی کە بیبینی، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی، ئەوا ئەو تۆ دەبینێت."[1]

گەیشتن بەم پلەیەش تەنها بە تەقوا و زوهد و ویلایەتی هەرەمەزن مەیسەر دەبێت. سەرەتا پێویستە مرۆڤ گەیشتن بەو خاڵە بکات بە ئامانج و خولیای سەری، دواتر یەك بە یەکی ئەو ڕێگایانە تاقی بکاتەوە کە دەیگەیەننە ئەوێ.

خوای گەورە بۆ مرۆڤ لە شادەماری دڵی نزیکترە.[2] مرۆڤیش بە هەموو شتێکیەوە

---

١ بخاري، إيمان ٣٧؛ مسلم، إيمان ١٠٧. (لەدواتردا بە کورتی باس لەم فەرموودەیە دەکەین.)
٢ بڕوانە: سورەتی ق، ئایەتی ١٦.

لە دەستی قودرەتی ئەو زاتەدایە و چۆنی بوێت وا هەڵاوگێڕی دەکات. هەموو شتێکیش بریتییە لە تەجەللیاتی ئەو. بێهوودەیی و ماندووبوونە گەر لە دەرەوە بەدوایدا بگەڕێیت. چونکە ئەو لە مرۆڤ نزیکترە بۆ خۆی. شکۆفەی ئەم نهێنییەش ئیحسانە.

## ئیتقان لە هەموو کارێکدا

ئەو دەمەی شعوورێکی لەم جۆرە ویژدانی مرۆڤ دادەپۆشێ، ئیتر ئیتقانیش بەسەر ڕەفتارەکانیدا زاڵ دەبێ. خوای گەورەش (جَلَّ جَلَالُهُ) داوای کاری پوخت و دروست دەکات و حەزی لە کاری پوخت و دروستیشە. ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (التوبة : ١٠٥)

"پێیان بڵێ کە کار و کردەوە ئەنجام بدەن. خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران کارەکانتان دەبینن. سەرەنجامیش دەگەڕێنەوە حوزووری ئەو خوایەی کە زانایە بە غەیب و شەهادەت (نهێنی و ئاشکرایش) ئەوسا ئەویش ئاگادارتان دەکاتەوە لە دانە بە دانەی کردەوەکانتان و پاداشتەکەیتان دەداتەوە."

واتە هەموو ئەو کردەوانەی ئەنجام دەدەرێن، بە پشکنین و چاودێری خوای گەورە و، پێغەمبەرەکەی و، ئەو ئیماندارانەدا تێدەپەڕن کە ویژدانیان هۆشیارە. بۆیە پێویستە کردەوەکان بەگوێرەی ئەم پشکنینە و، بە ڕەچاوکردنی ئەم پێشچاو خستنە ئەنجام بدرێت، تاوەکو خاوەنەکەی شەرمەزار نەکەن. بێگومان ئەمەش داخوازی ئەوەیە کە کار و کردەوەکان زۆر بە تۆکمەیی و پوختی ئەنجام بدرێن. ئەنجامدانی کارێکی لەو جۆرەش تەنها بەوە دەبێت کە مرۆڤ لە ناخیدا گەیشتبێت بە "ئیحسان". جا هەر ئەوەندەی مرۆڤ توانی لە جیهانی ناوەوەیدا بەم چەشنە قووڵ بێتەوە، ئیدی ڕەفتارەکانیشی تێر و تەواو دەبن و، ئاوەها مرۆڤێك هەرگیز ناکەوێتە داوی کاری پڕوپووچەوە. بەم شێوەیەش جوانییەکانی ئیسلامی دەست دەکەوێت، بە دەربڕینێکی تر، ئەو ئیسلامە لە خۆیدا

بەرجەستە دەكات كە هەر خۆی جوانە و، تەختی لە عەرشی كەماڵاتێكدا دادەنێ كە هاوشانی جوانییەكانی ئەو ئیسلامەتییە بێ كە هەر لە خودی خۆیدا جوانە.

"مَا لَا يَعْنِي" بە واتای خۆسەرقاڵ كردنی مرۆڤ دێت بەو شتە ناپێویستانەی كە هیچ پەیوەندییەكیان پێوەی نییە و، نە بۆ ئێستا و نە بۆ داهاتووشی چ كەڵك و سوودێكی پێنا گەیەنن. بەجۆرێ، ئەو شتانەی خۆی پێوە سەرقاڵ كردووە، هیچ سوودێكی نە بۆ خۆی و نە بۆ خێزانەكەی و نە بۆ میللەتەكەشی نییە.

جا ئەو كەسەی خۆی بە جوانییەكانی ئیسلام ڕازاندووەتەوە، لە هەمان كاتدا دووریش كەوتووەتەوە لە بێباكی. كەواتە فەرموودەكە مرۆڤ فێری ئەوەش دەكات كە پێویستە چی بكات. دەبێ مرۆڤ بەردەوام سەرگەرمی مەسەلە گەورەو گرانەكان بێت و، هەموو سەرقاڵییەكانی ژیانی، چ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، سوود و قازانج بە خۆی و خێزانەكەی و كۆمەڵگەكەی بگەیەنن. پێناسەی مرۆڤی جددییش لە ڕوویەكەوە ئەمەیە.

بەر لەوەی بچینە سەر بڕگەیەكی نوێ، وردەكارییەك هەیە، جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەی بۆ بكەین:

## "ما لا يعني" چییە؟

ئەو كەسەی سەرقاڵی "مَا لَا يَعْنِي"یە، هەرگیز دەرفەتی ئەوەی بۆ ناڕەخسێت بە "مَا يَعْنِي"یەوە (واتە ئەو شتانەی پەیوەندییان پێوەیەتی) خەریك بێت. بەڵێ، ئەو كەسەی بە بەردەوامی لە كۆمەڵە كار و بیروبۆچوونێكدا ڕۆچووە كە پەیوەندییان پێوەی نییە، كاتی ئەوەی بۆ نامێنێتەوە سەرقاڵ بێت بەو شتانەی كە پەیوەندییان پێوەیەتی و پێویستن...

ئەو مرۆڤەی هێشتا ڕێچكەی خۆی نەدۆزیوەتەوەو و لەرەلەری شەپۆلەكەیی ڕێك نەخستووە، ئەستەمە لەسەر ئەو شەپۆلە كارێكی بنیاتنەر و دروست ئەنجام بدات. كەسێ نوقمی "مَا لَا يَعْنِي" بووبێ، چاوەڕێی ئەوەی لێ ناكرێ بە ڕووی "مَا يَعْنِي"دا واڵا بێت. بەڵێ، كەسێ دڵ و مێشكی لە شتی ناڕێك و نابەجێ پڕ بووبێ، چۆن دەتوانێ سەرقاڵی مەسەلە گەورە و بنەڕەتییەكان بێت؟

بەم جۆرە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەموو ئەو واتایانە لە ڕستەیەکی سێ چوار وشەییدا دەردەبڕێ. ئەم ڕاڤەیەش هێشتا هەر شتێکی وا نییە، تەنها چەند پەیڤە پاچێکە و لەم فەرمایشتە گرانێتییەم داوە. ئەوەشی گەیشت بە ئێوە، یەك دوو پارچە بوو کە لێی بووبوونەوە. لەوانەیە ئەو هێندەشم بە جۆرێك دەرنەبڕیبێت کە لە ویژدانتاندا جێی خۆیان بکەنەوە. بەڵام وەرە ببینە کە وا تەنانەت دەستەوسانی و کۆڵەواری من و هاوشێوەکانی منیش دەبنە بەڵگەی سەلمێنەر لەسەر هێزی دەربڕین و گوفتاری ئەو نازدارە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ). ئەوەتا ئێمە لە تێگەیشتنی یەك فەرمودەشدا دەستەوسانین، لە کاتێکدا ئەو بێ هیچ بیرکردنەوەیەك ئەم فەرمایشتانەی دەفەرموو. ئەم فەرمایشتە پڕ واتا و ناوەڕۆکانەی کە دنیای بیرکردنەوەی ئێمەیان خستووەتە ژێر فشارەوە، قسەی ئاسایی ئەو بوون. جا ئایا ئەم بەهرەمەندییە جگە لە فەتانەت بە چ شتێکی تر لێك دەدرێتەوە؟ وشەی بلیمەت لە ئاست ڕوونکردنەوەی ئەم خەسڵەتەدا چەندە خامۆش و بێ گیانە!

## ١٠. ئارامگری

ئیمامی موسلیم و بوخاری بە یەکدەنگی ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە:

إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى "بەڕاستی ئارامگرتن ئەوەیە کە لە یەکەم ساتی هەژاندا بێت."[١]

## سەردانی گۆڕ

کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بینی کەوا هەندێ لە نەریتەکانی سەردەمی جاهیلی لە گۆڕستانەکاندا بەردەوامییان پێ دەدرێ، ڕێگری لە موسوڵمانان کرد کە سەردانی گۆڕستان بکەن. بەڵام دواتر ئەم یاساغەی هەڵگرت و هانی موسوڵمانانی دا کە سەردانی گۆڕستان بکەن و، فەرمووی: "من سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون،

١ بخاري، جنائز ٣٢، مسلم ،جنائز ١٤،١٥.

بەڵام لەمەودوا سەردانی گۆڕستانەکان بکەن."[1] چونکە کاریگەرترین ئامۆژگاری کە مرۆڤ لە هیوادرێژی ڕزگار دەکات، لە گۆڕستاندا شاراوەیە. ئەو مەردی جوامێرییە خۆشی زوو زوو سەردانی گۆڕستانی دەکرد و هەر هیچ نەبێ هەفتەی جارێك سەری دەدا لە شەهیدانی ئوحود.

لە یەکێك لە سەردانەکانیدا ئافرەتێکی بینی کە بەسەر گۆڕی ڕۆڵەکەیەوە هاوار و شیوەنی دەکرد و سەر و قژی خۆی دەڕنی و وتەی نەشیاوی بە زاردا دەهات. کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەم دیمەنەی بینی، لە ئافرەتەکە نزیك بووەوە و ویستی ئامۆژگاری بکات. بەڵام دیار بوو ئافرەتەکە سەروەرمانی نەدەناسی، بۆیە وتی: "لێم گەڕێ، تۆ نازانی چیم بەسەر هاتووە." پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بێ ئەوەی هیچ بڵێت، ئافرەتەکەی بەجێهێشت. پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ڕۆیشت، بە ئافرەتەکەیان وت کە ئەو کەسە پێغەمبەری خوا بوو. ئەم قسەیە بەجۆرێك ئافرەتەکەی هەژاند، مەرگی ڕۆڵەکەشی وا نەیهەژاندبوو. چونکە بێ ئەوەی بزانێ بێڕێزی بەرامبەر پێغەمبەری خوا نواندبوو. بەڕاکردن بەرەو خانەی بەختەوەری کەوتە ڕێ. بێ ئەوەی لە دەرگا بدا، چووە ژوورەوە و داوای لێبوردنی لە سەروەرمان کرد. پێغەمبەری سەروەریشمان وەڵامێکی حەکیمانەی دایەوە و، فەرمووی: "ئارامگرتن لەو کاتەدایە کە یەکەم گورزی موسیبەت دەخۆیت."[2]

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم دەربڕینە چوار وشەییەی و، لە نێوەندی ڕەوانبێژییەکی موعجیزەئاسادا بابەتێکی وەها باس دەکات، مەگەر بە چەندین بەرگ کتێب ئینجا مافی خۆی بدرێتێ.

## جۆرەکانی ئارامگری

ئارامگری بەرامبەر بە بەڵا و موسیبەت، ئارامگرتن لەسەر خۆڕاگری بەرامبەر بە گوناه، ئارامگرتن لەسەر سووربوون لە عیبادەتدا...

---

١ مسلم، جنائز ١٠٦؛ ترمذي، جنائز ٦٠.
٢ بخاري، جنائز ٣٢؛ مسلم ،جنائز ١٥.

ڕۆژی پێنج جار نوێژ، بەلایەنی کەمەوە ساڵی یەك مانگ ڕۆژوو، بە ئەندازەیەکی دیاریکراو زەکات و، سەرجەم ئەرکەکانی تری بەندایەتی، تەنها لە ڕێگەی ئارامگرتنەوە بجێ دەگەیەنرێن. پەرستشەکانیش تەمەنی مرۆڤ ڕێك دەخەن و بەگوێرەی جیهانەکانی ئەودیو ڕەنگی دەکەن. ژیانێکی لەم جۆرەش سەرتاپا لەسەر هێڵی نوورانێتی دەگوزەرێت. تا ئەوەی بەرەکەت دەکەوێتە تەمەن و، بەری بەهەشت دەگرێت. جا بۆیە مرۆڤ دان بەخۆیدا دەگرێ و، لەسەر عیبادەتەکان ئارامیی دەبێ و، بەم جۆرەش ژیانی نوورانی دەکات.

وشەی "صَبر" و گیای "صَبر" هەردووکیان لە هەمان چاوگەوە وەرگیراون. وا باس دەکرێت کە گیای صەبیر هەروەك ژەهر تاڵە و لە پیشەسازی داوودەرمانی پزیشکیدا بەکار دێت. جا ئیتر ئارامگرتن هێندەی قوتدانی "گیای صەبیر" تاڵە، بەڵام ئەم تاڵییە تەنها لە سەرەتادایە، بەرهەمەکەی هەمیشە شیرین بووە.

## حاڵەت گۆڕین

ئارامگرتن، دان بەخۆداگرتن، بەرگەگرتن، تۆکمەیی و پتەوی، لەرزە پێ نەکەوتن، نەسڵەمینەوە و ئیفلیج نەبوونی ئیرادە، لەسینەگرتنی ڕۆژانەی تاڵاوی ڕووداوەکان، هەڵبەت هیچ کام لەمانە کارێکی هەروا ئاسان نییە. بەڵام پێویستە هەموو ئەمانە لەو ساتەوەختەدا بێ کە یەکەم گورزی موسیبەت گیانی مرۆڤ دەهەژێنێت. چونکە جێگۆڕین و گواستنەوە بۆ حاڵەت و دۆخێکی تر، هەموو کات لە ڕوانگەی باری دەروونییەوە گۆڕانکاری لە حاڵەتی ڕۆحیی مرۆڤدا دروست دەکەن و ئەو ڕووداوانەی بیر دەبەنەوە کە شڵەژان و پشێوییان بۆ وەپێش هێناوە.

با بڵێین بەڵایەکمان بەسەردا هات، لە یەکەم ڕوانینیشدا وا دیارە کە توانای بەرگە گرتنیمان نییە. یەکەم کارێك کە بیکەین، گەڕانە بەدوای ڕێگەچارەی تێپەڕاندنی ئەو شۆکەدا. ئەمەش یان بە گۆڕانکاری دەبێت لەو بارەی کە تیایداین، واتە ئەگەر بە پێوە بووین دابنیشین و ئەگەر داشنیشتبووین پاڵ بکەوین. یاخود بە گۆڕینی چۆنێتی ئەو کارە دەبێت کە دەیکەین. بۆ نموونە: دەستنوێژ بگرین یان نوێژ بکەین. یان بە لایەنی

کەمەوە دووریکەوینەوە لەو بابەتەی کە قسەمان لەسەر دەکرد... یان ئەو شوێنە جێبهێڵین کە لێی بووین و پەنا بۆ کەشێکی تر ببەین. هەندێ جاریش تۆزێك خەو لەوانەیە ببێتە هۆی تێپەڕاندنی ئەو شۆکە. بە هەر جۆرێك بێت لە جۆرەکان، ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە بارودۆخ و شوێندا دەکرێن، کاریگەریی شۆکەکە دەشکێنن و، گەر کەمێکیش بێت، باری ئەو موسیبەتەی کە بەرگەگرتنی وەك ئەستەم دەهاتە پێشچاو، لەسەر شانی مرۆڤ سووك دەکەن.

ئارامگری لە ڕوانگەی بەردەوامی عیبادەتەکانیشەوە زۆر پێویستە. بۆ نموونە: لەوانەیە نوێژ بۆ کەسێك کە تازە دەستی پێ کردبێت، لە سەرەتادا زۆر قورس بێت. بەڵام هەر ئەوەندەی تۆزێك ئارامی گرت و ڕۆحی لەگەڵ نوێژدا ئاوێتە بوو، بە لەدەست دانی نوێژێك دنیای لێ دێتەوە یەك و کۆڵێك خەفەت دایدەگرێ. دەتوانین بۆ ڕۆژوو و زەکات و حەج و پەرستشەکانی تریش هەمان شت بڵێین.

بیر لەو کەسانە بکەنەوە کە عیبادەتێکی زەحمەتی وەك حەجیان جارێك بە نسیب بووە. ئەوەتا ئەم جۆرە کەسانە هەڵپەی ئەوەیانە کە هەموو ساڵێك بچنەوە. تەنانەت جاری وا هەیە لەتاو ئەو سنووردارکردنانەی کە دادەنرێن، هەر خەریکە شێت بن. ئەم چەشنە لە تاسە و پەرۆشی بۆ عیبادەت، لە ڕوویەکەوە بە واتای تێپەڕاندنی یەکەم گورزی نارەحەتی و سەختی ئەو عیبادەتانە دێ. خەریکە بڵێین ئەم حاڵەتە لە هەموو عیبادەتەکاندا بەم شێوەیەیە.

پێویستە مرۆڤ بە هەمان ئارامگرییەوە ڕووبەڕووی حەرامیش بێتەوە. چونکە ئەو بەرگری و خۆڕاگرییەی کە لە بەرامبەر یەکەم هێرشی گوناهدا دەنوێنرێت، دەبێتە بەربەستێك و ئەو پریشکە زیانبەخشانە دەگێڕێتەوە کە لێوەی دەردەچن. بەم جۆرەش مرۆڤ ئەو شۆکە تێدەپەڕێنێ. لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە حەزرەتی عەلی دەفەرموێ: يَا عَلِيّ! لَا تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ لَكَ الْأُولَى وَ لَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ "ئەی عەلی! نەزەر بەدوای نەزەردا مەکە. چونکە یەکەمیانت لەسەر نییە و بە گوناه بۆت نانوسرێت، بەڵام دووەمیانت لەسەرە و بە گوناه بۆت دەنووسرێت."[١]

١ ترمذي، أدب ٢٨؛ أبو داود، نكاح ٤٢.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەکرێ چاوی مرۆڤ بەرەو گوناهـ بخزێت. بەڵام ئەگەر یەکسەر چاوی داخست و ڕووی وەرگێڕا، ئەوا بە گوناهـ بۆی نانووسرێت. بگرە لەوانەیە پاداشتیشی بۆ بنووسرێ، چونکە سەیری حەرامی نەکردووە. بەڵام ڕوانینی دووەم و ئەوانەی دواتر، هەروەك تیری ژەهراوی دەچەقنە دڵ و ڕۆحی مرۆڤ و، خەیاڵی لێڵ و تەماوی دەکەن. بەم جۆرە، ئیرادەی ئەو مرۆڤە، هەستیاری و بێدارییە مەعنەوییەکەی لەدەست دەدات. چونکە هەر ڕوانینێکی حەرام لە ڕوویەکەوە لە حوکمی داوەتنامەیەکدایە کە ڕێگاکانی چوونە نێو گوناهـ ئاسان دەکات. جا ئیتر هەر نەزەرێك بانگهێشتی نەزەرێکی تر دەکات.. تا ئەوەی ئەو کەسە چارۆکە بە ڕووی حەرامدا هەڵدەدات و بەرەو گەشتێك دەکەوێتە ڕێ کە گەڕانەوەی گەلێك زەحمەتە.

جا بۆیە بەرلەوەی بکەوینە ناو ئەم حاڵەتەوە، پێویستە هەر لە یەکەم ساتی ڕووبەڕووبوونەوەی حەرامدا ئارام بگرین و، ڕووی خۆمانی لێ وەربگێڕین و، لە ئاستیدا چاو دابخەین. هەموو ئەمانەش لەو ئامۆژگارییە زێڕینانەن کە پێغەمبەری پێشەوامان (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئێمەی لێ ئاگادار کردووەتەوە.

وتەیەکی ئەپیکتێتۆس[1] هەیە کە دەڵێ: "کاتێك خولیا و خەیاڵە خراپەکان لە ئەندێشەتدا دەستبەسەرت دەکەن، ئەوا هەوڵبدە لە یەکەم دەرفەتدا خۆتیان لێ دەرباز بکەیت و لێیان دوور بکەویتەوە. گەرنا، بۆ شوێنێکت دەبەن ئەستەمە بتوانیت بگەڕێیتەوە." ئەمە وتەیەکی بە ئیلهام بارگاوی بووە. ئەگەر بێژەری ئەم وتەیە لەدوای پێغەمبەری خوا ژیابوایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەمانتوانی بڵێین کە ئیلهامی لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّىٰ اللَّهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەرگرتووە...

مرۆڤ بەم هەڵسوکەوتە بەردەوامەی لە بەرامبەر حەرامدا، ئەم حاڵەتەی تێدا دەبێ بە خوو و ئاکارێکی سروشتی. وەك بڵێی ئەو نووری ئیمانەی کە لە ئاکامی مەشق و ڕاهێنانەوە لە دڵیدا پەیدابووە، دەبێتە پەردەیەك بە ڕووی ئەو گوناهانەی کە لە حوکمی پزیسکی دۆزەخدان. بە چەشنێك، کە ئیدی نەڕوانین بۆ حەرام دەبێت بە یەکێك لە ڕەفتارە ڕەسەن و سروشتییەکانی. خۆ ئەگەر حاڵەتێکی پێچەوانەی ئەمەش هات بە

[1] فەیلەسووفێکی یۆنانییە کە لە سەدەی یەکەم و دووەمی زایینیدا ژیاوە.

مێشکیدا، ئەوا دەستبەجێ پەنجەی نوقمی هەنگوینی ئیمانی نێو شانەی دڵی دەکات. لە سایەی ئەم شعووره تۆکمەیەشدا، بەو تامە بەتامەی کە چەشتوویەتی لە هەموو ئەو شتانە هەڵدێت کە لەم کەشە مەعنەوییە دووری دەخەنەوە. کەسێك گەیشتبێتە ئەم ئاستە، مەحاڵە بە ویستی خۆی بچێتە ناو گوناهەوە.

هەموو بەڵا و موسیبەتێك بەگوێرەی خۆی هەژان و ڕاچڵەکاندنی خۆی هەیە. هەرکە ئەو هەژانەش تێپەڕێنرا، موسیبەت دەبێت بە ڕەحمەت و، ئازار بە چێژ و، دەرد و ناخۆشییەکانیش هەڵدەگەڕێنەوە و دەبن بە کەیف و خۆشی... لە وەها سینەیەکدا خەم و خەفەت دواییان هاتووە و شوێنیان بۆ شادییەکی بێ کۆتا چۆڵکردووە. بەڵام دەبێ بزانین کە هەموو ئەمانە بەندن بە چۆنێتی تێپەڕاندنی ئەو یەکەم ساتەی کە مرۆڤ تێیدا دەهەژێت. بەڵێ، وەك بینیتان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەنها بە چوار وشە ئەو بابەتە قووڵ و پڕ وردەکارییەی دەربڕیوە: "بەڕاستی ئارامگرتن ئەوەیە کە لەگەڵ یەکەم گورزی موسیبەتدا دان بەخۆتدا بگریت."

## ١١. دەستی باڵا (بەخشەر)

لە فەرمایشتێکی تردا کە هەردوو ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتی دەکەن، سەروەرمان دەفەرموێ: اَلْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى "دەستی باڵا لە دەستی نەوی باشترە."[١]

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) هەر خۆی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە "يَدِ الْعُلْيَا" دەستی بەخشەرە و، ئەو دەستەیە کە ئینفاق دەکات. "يَدِ السُّفْلَى"ش ئەو دەستەیە کە وەردەگرێت.[٢] شایانی باسە فەرموودەکە لەپاڵ وێنا کردنی ئەو ڕاستییەی کە دەستی بەخشەر لەسەرەوەیە و دەستی وەرگریش لە ژێرەوە، لە هەمان کاتدا ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە لە ڕوانگەی فەزڵ و پاداشتی بەخشینەوە، ئەو کەسەی دەبەخشێ لە سەروو ئەو کەسەوەیە کە وەردەگرێ. جا ئەگەر لە گۆشەنیگای ڕێز و شکۆی مرۆڤەوە

١ بخاري، زكاة ١٨؛ مسلم، زكاة ٩٤-٩٧؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/٢.
٢ بخاري، زكاة ١٨؛ مسلم، زكاة ٩٤.

یەکێکیان "باڵایی و بڵندی" بێت، ئەوا ئەوەی تریان - لە هەندێك حاڵەتدا - "نزمی و داکەوتن"ە. ئەمەش لەو ڕووەوە کە شەوق و تاسەمەندیی خاوەن سروشتە ساغەکان ببزوێنێت بۆ بەخشین و، وایان لێبکات کە سڵ بکەنەوە لە وەرگرتن، شێوازێکی هێندە نایابە و، ئەو کەرەسانەش کە ئەو شێوازە نایابەیان پێك هێناوە بە جۆرێکی وا شوێنی خۆیان گرتووە، هەرگیز جێگۆڕکێ قبووڵ ناکەن.

لەلایەکی ترەوە، ئێمە دەزانین کە بەخشین پرۆسەیەکی تاك جەمسەر و یەکلایەنە نییە. بەڵکو داخوازی بوونی وەرگرێکیشە تاوەکو بەخشینەکە لە هەوادا نەمێنێتەوە و جێی خۆی بگرێ. بۆیە دەبینین تەنها بەوەوە نەوەستاوە کە باس لە چاکەی دەستی بەخشەر بکات، یان بلێت "دەستی وەرگر بەدخوازە..."، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە ڕێگەی ئەو ئاماژە ناڕاستەوخۆیەوە کە واتای "دەستی وەرگر کەمتر چاکە" دەگەیەنێت، ئاگادارمان دەکاتەوە کە لە هەندێ هەلومەرجی تایبەتیدا ڕێگرییەك نییە لە پرۆسەی وەرگرتن.

لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر تەواوی ئەو واتا و مەبەستانەی سەرەوە، دەڵێین: وەرگێڕانی فەرموودەکە لەسەر شێوەی "دەستی بەخشەر لە دەستی وەرگر باڵاترە." وەرگێڕانێکی ناتەواوە. ڕاستە وشەکانی ناو فەرموودەکە بەرامبەر بەو وشانەن کە ئێمە وەرمانگێڕاون، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە سەرومەرمان لەم دەربڕینانەیدا شێوازێکی مەجازیی بەکار هێناوە. هەر بۆیە هەردوو دەستەواژەی "دەستی بەخشەر" و "دەستی وەرگر"، لەوە تێناپەڕن کە ڕوویەك بن لە ڕووەکان، یان واتایەك بن لە کۆی واتاکانی فەرموودەکە. دەنا هەرگیز هەمووی نییە.

پێش هەموو شتێك لێرەدا "جُزء" باس کراوە و مەبەست پێی "کُلّ"ە. بە واتایەکی تر، مەبەست لە دەست خودی مرۆڤەکەیە. جا بەگوێرەی ئەمە، مەبەستی فەرموودەکە ئەم واتایە دەگەیەنێت: "مرۆڤی بەخشەر لە مرۆڤی وەرگر باشترە."

## هەندێ جار وەرگر باشترە

لە زمانی عەرەبیدا بەخشەر بە وشەی "المُعْطِي" و، وەرگریش بە وشەی "الآخِذ" گوزارشتی لێ دەکرێت. ئەگەر پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەم وشانە "المُعْطِي، الآخِذ"ی وەك ئاوەڵناو (صفة)ی وشەی "اليَد" بەکاربهێنایە، ئەوا ئەوکات وا گونجاو دەبوو کە بڵێین: "دەستی بەخشەر خێردارترە لە دەستی وەرگر." بەڵام هەروەك دەبینین، پێغەمبەری نازدار (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) سەبارەت بە دەستی بەخشەر و وەرگر نادوێت، بەڵکو دەربارەی دەستی "باڵا" و "نەوی" قسە دەکات. لەم دەربڕینەشەوە خاڵێکی لەم شێوەیە بە مێشکدا دێ: هەموو جارێك دەستی "بەخشەر" باشتر نییە لە دەستی "وەرگر". لە هەندێ کاتدا دەستی وەرگر، با زۆر چاکتریش نەبێت، بەڵام گەر لەبەر ناچاری، یان بەو مەبەستەی خێر و پاداشت دەست بەخشەری بخات، وەریگرێت و لە جێی خۆیدا خەرجی بکات، یاخود لە حاڵێکدا کە بەخشەر مننەت بەسەر وەرگردا بکات، ئەوا لەم حاڵەتانەدا دەستی چاك و باڵا، دەستی وەرگر دەبێت. بەخشەر با لە ڕواڵەتیشدا لە سەرەوە بێت، کەچی لە ڕاستیدا - لە ڕوویەکەوە - لە ژێرەوەیە.

مرۆڤانی وا هەن کە لە هەژارانی ئارامگ)ن. سەر و قژیان پەرش و پژاوە و لە کۆڕ و مەجلیسدا بەردەوام توانجیان لێ دەدرێ، گەر لە دەرگا بدەن، کەس دەرگایان بەڕوودا ناکاتەوە. بە دەربڕینی سەروەری هەردوو جیهان: لَوْ أَقْسَمُوا عَلَى اللهِ لَأَبَرَّهُمْ "ئا ئەوانە لە هەر بابەتێکدا سوێند بەخوا بخۆن، خوای گەورە سوێندەکەیان ناخات و بەدرۆیان ناخاتەوە." "بەڕڕائی کوڕی مالیك"یش یەکێکە لەمانە.[1] هەرکات موسوڵمانان لە جەنگدا تووشی نەهامەتی بهاتنایە، دەهاتنە لای بەڕڕاء و داوایان لێ دەکرد سوێند بخوا کە دەبێ سەرکەون. ئەویش سوێندی دەخوارد و بەمەش سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا.[2] دەی ئەوەتا دەستی وەرگر دەشێ کەسێکی لەم شێوەیە بێت...

"ئەوبان"یش یەکێك بوو لەو هاوەڵانەی کە زۆر نەدار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئامۆژگاری کرد کە داوای هیچ شتێ، لە هیچ کەسێ نەکات.

---

١ ترمذي، مناقب ٥٤؛ بيهقي، شعب الإيمان ٣٣١/٧.
٢ إبن حجر، الإصابة ٢٨١/١.

لەو ڕۆژە بەدواوە داوای هیچ شتێکی لە کەس نەکرد. تەنانەت جاری وا دەبوو بەسەر وشترەکەیەوە ڕێی دەکرد و قامچییەکەی لێدەکەوتە خوارەوە. بەس بۆ ئەوەی داوا لە کەس نەکات، یەکسەر دادەبەزی و خۆی بە دەستی خۆی قامچییەکەی هەڵدەگرتەوە و دووبارە سواری وشترەکەی دەبووەوە.[1] دەی دەکرێ هەندێ جار شتێکیش بە کەسێکی وا درابێت. ئەمەش هەروەك بەخشینی شتێك وایە بە حەزرەتی جوبرەئیل، لەو کاتانەیدا کە لە شێوەی ئادەمیزاددا دەردەکەوت.. هەرگیز نەبووە ئەم و کەسانی وەك ئەمیش کە لە دۆخی وەرگردان، لە خوار ئەو کەسانەوە بن کە دەبەخشن. ئەوەتا لەو فەرموودەیەدا کە دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە و حەزرەتی ئەبوهورەیرە ریوایەتی دەکەن، باس لەوە دەکرێت کە: ''کاتێك شتێك دەبەخشرێتە ئەو جۆرە مرۆڤانە، لەپێشدا ئەو شتە - بێ چۆنێتی و چەندێتی - دەچێتە دەستی پەروەردگارەوە. جا ئیتر ئەو شتە لە لایەن پەروەردگار خۆیەوە دەبەخشرێتە ئەو کەسە.''[2]

## ئامۆژگارییەکان

لە لایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم ئامۆژگارییانەشمان دەکات: ''هەمیشە عیززەتی خۆتان بەرز ڕابگرن. بە سواڵکردن خۆتان سووك و بێ نرخ مەکەن. چ وەك تاك، چ وەك دەوڵەت، هەرگیز دامەبەزنە ئاستی "دەستی وەرگر". بەڵکو هەوڵبدەن هەمیشە "دەستی بەخشەر" بن. ئیتر بەم شێوەیە بەردەوام لەسەرەوە دەبن و عیززەتتان دەپارێزن. بیرتان نەچێت! ئەوەی لەسەرەوە بێ، هەمیشە لەنێو دڵنیایی و ئاسایشدا دەبەخشێت و دەبەخشێتەوە. ئەوەش کە لە ژێرەوەیە، هەردەم بەترسەوە کۆدەکاتەوە و بە ترسیشەوە دەژی. ئێوە ببنە دەستی فەرمانڕەوا، نەك دەستی فەرمانبەر. باش بزانن، ئەو کاتە دەبن بە فەرمانڕەوا، کە لەسەرەوە بن.''

---

١ إبو داود، زكاة ٢٧؛ إبن ماجة، زكاة ٢٥.

٢ بخاري، زكاة ٨؛ مسلم، زكاة ٦٣-٦٤؛ إبن حجر، فتح الباري ٢٧٩/٣.

## پێوەری نێودەوڵەتی

لە هەمان کاتدا فەرموودەکە پێوەرێکی چاوساغ و تەرازوویەکی سەرنەکەریشە بۆمان لە بواری پێوەرە نێودەوڵەتییەکاندا. ئەگەر ئێمە دەستەکەی سەرەوە بین، ئەوا لە هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکاندا پێگەیەکمان دەبێت. ئیدی ئەوکات ئوممەتەکەمان، کە بووەتە سفرەی پاوانکراوی تێرکردنی بەرژەوەندی زلهێزەکان، هەلی ڕاستکردنەوەی پشتی کۆماوی بەدەست دێنێ و خۆی ڕزگار دەکات. ئەگەرنا، هەرگیز ناتوانێت بەرۆکی خۆی لەم ژێردەستەیی و بەسووک تەماشاکراوییەی ئێستای ڕزگار بکات. حاڵی حازریش پڕیەتی لە ئاشکراترین بەڵگەی ئەم حاڵەتەی باسمان کرد.. ئەوەتا زلهێزەکان ئەو دوو سێ فلسەی کە وەك خۆنواندنێك دەیدەن، وا ئێستا خەریکە بە مژینی خوێنی ئەو گەلانە و کرۆژتنی ئێسکەکانیان بەرامبەرەکەی وەردەگرنەوە. ئێمەش لە بەرامبەر هەموو ئەمانەدا تاڵاوی ئەو سەرشۆڕییە دەچێژین کە دەرهاویشتەی ئەوەیە بووینەتە "دەستی وەرگر". جا بۆیە ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکمان هەم وەك تاك، هەم وەك ئوممەت، هەوڵدان و بەگەڕخستنی هەموو هەوڵ و توانایەکمانە لەپێناو بەدیهێنانی ئەوەی کە هەموو جیهانی ئیسلامی، بگرە لە ڕوویەکەوە سەرجەم مرۆڤایەتی لێمان چاوەڕێ دەکات.

داخۆ کێ دەزانێ پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لە ڕێگەی ئەم دەربڕینە کورت و پوختەیەوە ئاماژەی بە چەند لایەن و ڕاستی تری وەك ئەمەی کردبێ کە ئێمە باسمان کرد؟...

## ١٢. ئەو سێ تاقمەی لە قیامەتدا گرنگیان پێنادرێت

لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی موسلیم ریوایەتی دەکات، پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِأَلۡفُ صَلَاةٍوَسَلَام) دەفەرموێ:

ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمَهَمَ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَ لَا يَنظُرُ إِلَيهِمْ وَ لَا يُزَكِّيهِمْ وَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: اَلْمُسبِلُ إِزَارَهُ وَ الْمَنَّانُ الَّذِي لَا يُعْطِي شَيئًا إِلَّا مَنَّهُ، وَ الْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ

"سێ تاقم هەن لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە نە قسەیان لەگەڵدا دەکات، نە تەماشایان دەکات، نە تەزکیەشیان دەکات.. هەروەها سزایەکی بەسوێشیان بۆ هەیە: ئەو کەسەی لە کاتی ڕۆیشتنندا پۆشاکەکەی بە زەویدا دەخشێنێ، هەروەها ئەو منەتکارەی هەر شتێ ببەخشێ منەتی پێوەدەکات، ئەو فرۆشیارەش کە دەیەوێت بە سوێندی درۆ برەو بە شمەك و کاڵاکانی بدات..."[١]

## پوختەواتا ڕۆڵی ڕوانینگا دەبینێ

ئەو چەند دێڕەی سەرەوە، ڕاڤەیەکی کورتی فەرموودەکە بوو. ڕاڤە و پوختەواتاکان ڕۆڵی ڕوانینگا (مَرْصَد) و تەرازوو دەبینن. لە ڕێی ئەوانەوە بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕێین. بەڵام بیرمان نەچێت، ئەوان تەنها هۆکارێکن و هەرگیز نابنە خودی حەقیقەت. جا وەرە ئێستا بڕوانە فریوخواردوویی و هەڵەی ئەوانەی لە دووتوێی ڕاڤە و وەرگێڕانەکاندا بەدوای قورئاندا دەگەڕێن! چونکە ئەو قورئانەی لە لایەن خواوەندی بەتوانای شکۆمەندەوە نازڵ بووە، سەرتاپا موعجیزەیە. بەڵام وەختێك هەڵدەستیت بە ڕاڤەکردنی، وەك ئەو شتەی لێ دەکەی کە بەرگ و پێستی بەری داماڵراوە. لەبەر ئەمە خاڵی سەرەکی بریتییە لە پاراستنی خودی واژە (لَفظ) ڕەسەنەکانی قورئان و فەرموودە. جا بۆیە لەم ڕوانگەیەوە کەمێك لەسەر لەفزی فەرموودەکە دەوەستین، سا بەڵکو هزرەکان لە مەبەستی ناو فەرموودەکە نزیك بکەینەوە. لە ڕاستیدا هەرچی کرد و کۆششمانە لەپێناو بوونە پەروانەی دەوری ئەو تاڤگەی نوورەیە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا سەیرێکی عەقڵی و زیهنییە. هەموو نزا و پاڕانەوەشمان لە پەروەردگار، بە هاناوە ناردنی لوتف و کەرەمی نەبڕاوەی خۆیەتی تا سەرکەوتوومان بکات لە سەیری ڕۆحانیدا.

هەروەك دەبینن وشەی سێ (ثَلَاثَة)، بە ڕەهایی جێهێڵراوە. واتە دەکرێ پیاو بن یا ئافرەت. وەك چۆن دەکرێ تاقم و کۆمەڵێکیش بگرێتەوە. دیسانەوە دەکرێ مەبەست لەو سێ کەسە یان سێ گرۆیە، زانایان یان نەفامان بێ. هەرچۆنێك بێ، لەبەر ئەوەی مەبەستی سەرەکی، زیاد لە ناسنامەی کەسەکان، وەسف و سیفەتەکانیانە، بۆیە

١ مسلم، الإيمان ١٧١-١٧٤؛ ترمذي، البيوع ٥؛ أبو داود، اللباس ٢٥.

فەرموودەکەش بە ڕاشکاوی باسی نەکردوون و دەرگای ڕەهایی لیَ خستوونەتە سەرپشت.

"ثَلَاثَةٌ" وشەیەکی نەناسراو (نَكِرَة)یە، تەنوینەکەی کۆتاییشی ئەمە دەگەیەنێت. کەواتە ئەم کەسانە، کەسانێکی نەناسراو و بیَ ناسنامەن. بەجۆرێك، هیچ پێناسێك نییە بیانناسێنێت. ئەوانە کەسانێکی نزم و بیَ ئەرزشن. هێندە نزم و بیَ ئەرزشن، تەنانەت شایستەی ئەوە نین هیچ نرخ و بەهایەکیشیان بۆ دابنرێت. وەك چۆن خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) تەماشایان ناکات و قسەیان لەگەڵدا ناکات، بە هەمان شێوە ئێوەش قسەیان لەگەڵدا ناکەن و بەلاتانەوە گرنگ نییە بیانناسن. ئەوانە مرۆڤانێکن بە دڵ نەك بە جەستە، شکستیان هێناوە و ویژدانیان لەژێر باری گرانی جەستەیاندا پلیشاوەتەوە و هێندەی گەردیلەیەك ئامادەیی و تاسەی گەیشتن بە پلە بەرز و بڵندەکان لە دەروونیاندا نییە. نەك هەر نییە، بەڵکو بەردەوام لە زەلکاوی نزمی و ڕیسواکردەییدا ڕۆدەچن...

ڕاستەوخۆ بەدوای ئەم وشەیەشدا سیَ کردار باس دەکرێت، کە هەرسێکیان ئاماژە بۆ دەمی ڕانەبردوو دەکەن. ئەم سیَ کردارەش تابلۆیەکی سەرتاپارەش بۆ ئەم سیَ تاقمە دەکێشن. ئیدی هەر ئەوەندەی دەڵێی "سیَ"، یەکسەر خۆت لەسەر پشتی ئەم "سیَ"یە دەبینیتەوە و، وەك بڵێی دەکەویتە تەماشاکردنی عاقیبەتی تاریکی ئەو سیَ کۆمەڵە.

## سیَ بێبەشی

## بێبەش بوون لە ئاخاوتن

یەکەم کردار ئەو کردارە ڕانەبردوو (الفِعل المُضارع)ەی سەرەتای ڕستەی "لَا يُكَلِّمَهَمَ اللهُ"یە. هەروەك دەزانین کرداری ڕانەبردوو ئاماژە بۆ دەمی ئێستاش و داهاتووش دەکات. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) قسە لەگەڵ مرۆڤدا ناکات کام مرۆڤ؟ ئەو مرۆڤەی دەمی بە گوڵی گوفتار پشکووتووە و، ئامادەیی و لێهاتنی بوون بە دوێنراو (مُخاطَب)ی پەروەردگاری پیَ بەخشراوە. هەرچی کارەساتیشە لەم یەکەم ڕستەیەوە دەست پێدەکات. ئەگەرچی خوای گەورە لە سورەتی (الرَّحمن)دا وەك نیعمەت و منەتێك باس لە بەدیهێنانی "بەیان" دەکات لە مرۆڤدا، کەچی وا ئێستا قسە

لەگەڵ ئەو مرۆڤەدا ناكات، بگرە هەر ناشیدوێنێ. ئەمە لە كاتێكدا كە گوفتاری مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خوای گەورە "الْمُتَكَلِّم"ە. جا ئیتر ئەم مرۆڤە كە توانای گوفتاری پێ بەخشراوە و، لەم ڕووەوە بووەتە بەڵگە لەسەر سیفەتی "كَلام"ی پەروەردگار، بۆ ئاستێكی وەها نزم شۆڕ دەبێتەوە كە بە دوێنراو قبووڵ ناكرێت و قسەشی لەگەڵدا ناكرێت. جا ئایا سزای لەوە سەختتر هەیە كە مرۆڤ لە ڕۆژێكدا كە لەوپەڕی ئاتاجیدایە بە قسەكردن و دەربڕینی دەردەكانی، گوێی بۆ نەگیرێ و نەدوێنرێت؟ لەو ڕۆژەدا پەلەقاژە دەكات و بە تەواوی بوونیەوە داوای یارمەتی دەكات، كەچی ئەو زاتەی كە تەنها یاریدەدەر و داڵدەدەرە، هەر گوێشی بۆ ناگرێ. قورئانی پیرۆز بەم جۆرە وێنای ئەو دیمەنە دڵتەزێنەمان بۆ دەكات: ﴿ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾ (المؤمنون : ١٠٨) "دەمتان داخەن و قسەم لەگەڵ مەكەن." چونكە شوێنی قسەكردنتان دنیا بوو.. دەتانتوانی لەوێ قسە بكەن و تامی "أُنس بِالله" بچێژن. كەچی تا لە دنیادا بوون نەبوونە هاوڕاز (أنیس)ی پەروەردگار، دەی ئەمڕۆش پەروەردگار نابێتە "أنیس"ی ئێوە.

## بێبەش بوون لە نەزەری ئیلاهی

دووەم تابلۆ بریتییە لە: وَ لَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ "خوای گەورە تەماشایان ناكات." لەو ڕۆژەدا كە لە هەموو كات زیاتر پێویستیان بە لاكردنەوەی پڕ ڕەحمەت و بەزەیی‌یە، خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) بە هیچ شێوەیەك بە ڕوانینیی ڕەحمەتەوە بۆیان ناڕوانێت. لەو ڕۆژەدا هەندێ ڕوخسار لە خۆشیدا گەش و درەوشاوەن، هەندێكی تریش گرژ و مۆنن.[1] بێگومان كۆمەڵەی دووەم ئەو جۆرە كەسانەن كە خوای گەورە بە نەزەری ڕەحمەت بۆیان ناڕوانێت. لەو ڕۆژەدا كە هەركەس بەناوی خۆیەوە بانگ دەكرێ و هەریەكەو بە هۆكارێك ڕزگاری دەبێ، حاڵی ئەم بەدبەختانەی كە تەماشایان ناكرێ، چەندە جەرگبڕ و دڵتەزێنە!

سزای دەنگدابڕینەكەی كەعبی كوڕی مالیكتان بێتەوە یاد! لەگەڵ ئەوەشدا كە

١ بڕوانە: سورەتی آل عمران، ئایەتی ١٠٦-١٠٧؛ سورەتی القیامة، ئایەتی ٢٢-٢٥؛ سورەتی عبس، ئایەتی ٣٨-٤١.

دەنگدابڕینەکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللّٰهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) ماوەیەکی زۆر کەمی خایاند، کەچی دنیای لێ هاتەوە یەك و، خۆشی و ئەوانەشی ڕووداوەکەیان دەبیست، پەژارە دایدەگرتن.[1] بەڵام ئەو کەسانەی ئێمە قسەیان لێدەکەین بۆ هەتاهەتایە شایستەی ئەم چارەنووسە دەبن. ئامان خوایە! دۆزەخیش ئەوەندە سامناك نییە. پەروەردگاری خاوەن میهر و سۆزی ڕەها، بۆ تەنها ساتێکیش تەماشایان ناکات. ئای کە سزایەکی گەورە و چارەنووسێکی داچڵەکێنەرە!

ئێمە بڵێین چی؟ ئاخر چیت چاندبێ، هەر ئەوە دەدووریتەوە. ئەوانەی چاکەیان چاندووە چاکە و، ئەوانەشی خراپەیان چاندووە خراپە.

## بێبەش بوون لە تەزکیە

حاڵەتی سێهەمیش بریتییە لە: وَلَا يُزَكِّيهِمْ "خوای گەورە پاکیان ناکاتەوە، یاخود بڕیار لەسەر پاکێتییان نادات" پێویستە ئادەمیزاد لێرە پاك بێتەوە، تا ئەوەی بەوپەڕی پاکوخاوێنییەوە بڕواتەوە ئەودنیا. واتە پرۆسەی پاك بوونەوە - لە خەوشی گوناھ و تاوان - لە دنیادا بەجێ دێ. گەرنا، لە ئاخیرەتدا تەنها دۆزەخ مرۆڤ پاك دەکاتەوە. جا بۆیە خوای گەورە - سەرباری سزاکانی دی - تەزکییەشیان ناکات.

مرۆڤ تەنها یەکجار دێتە گۆڕەپانی تاقی کردنەوەوە و تەنها یەك دەرفەتی سەرکەوتنیشی پێ دەدرێ. جا هەرکەس بەباشی سوود لەو دەرفەتە وەربگرێ، گرەو دەباتەوە. هەرکەسیش فەرامۆشی بکات، دۆڕاو و مایەپووچ دەبێ. لەم نێوەندەشدا هەڵبژاردنی سێەم نییە.

ئەم مرۆڤە داماوەی کە "ڕۆح" و "ویژدان" و "لەطیفەی ڕەببانی" و "سر" و "خەفی" و "أخفا" و هەموو هەست و نەستەکانی تری بە وێنەی نەخۆشییە ماددییەکانی حەزرەتی ئەییوب (عَلَيْهِالسَّلام)، داوەشیوە و هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە، لەو ڕۆژەدا چاو بە حاڵی پەرێشانی خۆیدا دەگێڕێ و بە دوای هیوایەك، بەشوێن دەرفەتێکدا دەگەڕێ: "داخۆ

---

[1] بڕوانە: بخاري، مغازي ٧٩؛ مسلم، توبة ٥٣-٥٥.

بتوانم لەژێر باری تاقەت پرووکێنی تاوانەکانم قوتارم بێ؟! تۆ بڵێی لە عارەقی تاگەروو هاتووی شەرمەزاری سەرپێچییەکانم بەپاکژی بێمە دەر؟!"

## عاقیبەت: سزایەکی بەسوێ

عاقیبەتیشیان: وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ "سزایەکی بەئێش و ئازاریان بۆ هەیە." لەگەڵ هەر هەنگاوێکیان خۆیان لە بەرامبەر سزا و ئەشکەنجەیەکی بەسوێدا دەبیننەوە. سزایەك، کزە لە جەرگی مرۆڤ دێنێ و سوێ دەخاتە دڵییەوە. ئیدی بەم جۆرە، خۆیان لە گێژاو و چاڵی سزایەکی وەهادا دەبیننەوە...

داخۆ دەبێ ئەو سێ تاقمە کێ بن کەوا دووچاری ئاوەها سزایەك دەبنەوە؟ کێن ئەوانەی کەوا خوای گەورە نایاندوێنێت و بۆیان ناڕوانێت و پاکیان ناکاتەوە؟ ئەوانە کێن کە سزایەکی بەسوێیان بۆ ئامادە کراوە؟ جا ئەو کەسەی تا ئێرەی فەرموودەکە دەخوێنێتەوە، خولیا و تاسەیەکی بێ وێنەی تێدا دەبزوێت.. ئیدی ئێستا سەرتاپا بووەتە پارچەیەك لە سەرنج و، هەموو هێزی مەراق و پشکنینی خۆیی خستووەتە حاڵەتی ئامادەباشییەوە. ئینجا بەدوایدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێ: اَلْمُسْبِلُ إِزَارَهُ "ئەو کەسەی لە ڕۆیشتندا پۆشاکەکەی لە زەوی دەخشێنێت." ئەمەش خوازە (كُنيَة)یە بۆ لوتبەرزی و خۆ بەزلزانی.

بێگومان لە مێژووی ڕۆما و یۆنانییەکاندا دیمەنی ئەو کەسانەتان دیوە کە دامێنی پۆشاکەکانیان بەدوای خۆیاندا دەخشێنن. تەنانەت ئەم حاڵەتە لە فلیمەکانیشیاندا دەردەکەوێت. بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە خشانی چمکی پۆشاك نییە، بەڵکو بە هێماکردنی ئەم دیاردەیە وەك گوزارشتێك لە فیز و خۆبەزل زانی مرۆڤەکان. جا خۆ مەبەستی فەرموودەکەش هەر ئەمەیە.

## خۆ بەزلزانی و لووتبەرزی

چەندین ئایەت و فەرموودەی پیرۆز باس لە خۆ بەزلزانی و لوتبەرزی دەکەن و ڕوونیان کردووەتەوە کە چ دەردێکی سامناکن و چ ئەنجامگەلێکی سامناکیشیان لێ

دەکەوێتەوە. ئەوەتا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبر "هەرکەسێ هێندەی دەنکە خەرتەلەیەك خۆبەزلزانین (کیبر) لە دڵیدا هەبێ، ناچێتە بەهەشتەوە."[١]

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُه) ڕێگاکانی هیدایەتی بە ڕووی ئەو کەسانەدا داخستووە کە بە ئەندازەی گەردیلەیەك خۆیان پێ گەورەیە و فیز لێ دەدەن. ئەوەتا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴾ (الأعراف : ١٤٦)

"ئەو کەسانەی بە ناحەق فیز لێ دەدەن لە زەویدا و خۆیان بە گەورە دەزانن، لەمەودوا ڕووی دڵیان وەردەچەرخێنم لە تێگەیشتنی ئایەت و فەرمانەکانم، خۆ ئەگەر هەموو موعجیزە و بەڵگەکانیش ببینن، هێشتا هەر ئیمان ناهێنن. خۆ ئەگەر ڕێی ڕاستیش ببینن، هەر پەیڕەوی نابن. بەڵام ئەگەر ڕێی گومڕاییان بەرچاو کەوت، دەستبەجێ دەیگرنە بەر. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان بڕوایان بە ئایەتەکانمان نەکرد و لێیان بێئاگا بوون."

کیبر و خۆ بەزلزانین پەردەیەکە بەسیرەت و بینایی دڵ کوێر دەکات. ئەو ویژدانەی وا بووەتە مۆڵگەی کیبر، ئەو موعجیزە و کارە دەراسایانە نابینێت کە وا لە پەڕە بە پەڕەی پەڕاوی مەزنی بوونەوەراندا، بە مەرەکەبی توانست و دانستێکی ڕەها نەخشێنراون، چ جای ئەوەی پەیامیان پێ بەرێت و لێیان تێبگات! ئاخر کە بەصیرەت کوێر بوو، بەصەر چی بکات لە ئیدراك؟!

گەورەیی تەنها بۆ خوای گەورەیە. کەوابێ کەی گونجاوە بە چاوی لێبووردەییەوە بڕوانرێتە ئەو کەسەی حەقیقەتێکی وەها مەزن، کە ڕۆژی پێنج جار لە منارەکانەوە بە

١ مسلم، إيمان ١٤٧-١٤٩؛ ترمذي، بر ٦١؛ أبو داود، لباس ٢٦.

وێنەی ناوی ژیان دەچۆڕێتە ویژدانەکانەوە، بداتە پاڵ کەسان و شتانی تر؟!

لە فەرمایشتێکی قودسیدا خوای گەورە دەفەرمویٚ:

اَلْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي وَ الْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي واحِدًا مِنْهُمَا قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ

"کیبریاء ریدامە و عەزەمەتیش ئیزارم. هەرکەسیٚ لەم بابەتەدا بکەوێتە ململانێوە لەگەڵمدا، (سەرشۆڕی دەکەم و) فڕێی دەدەمە دۆزەخەوە."[١]

"کیبریاء" بە واتای گەورەیی و شکۆمەندی دیٚ، کە ئەوەش یەکێکە لە سیفاتە بەرز و بڵندەکانی خوای گەورە. پۆشاکی دەرەکی و ناوەکی بۆ ئادەمیزاد چی بگەیەنێت، کیبریا و عەزەمەتیش - بەجۆرێك کە چۆنێتییەکەی لای ئێمە نەزانراوە - هەمان شت دەگەیەنن بۆ پەروەردگار. هەر کەسیش بیەویٚ ئەم سیفەتانە لەگەڵ خوای گەورەدا بەش بکات، خوای گەورە بە سزای شایستەی خۆی دەگەیەنێت و دەیخاتە ناو دۆزەخەوە.

بە خەیاڵتدا نەیەت کە ئیمان لە دڵێکدا سرەوت بگریٚ کە خەوشی کیبری لیٚ نیشتبیٚ. بە واتایەکی تر، هەرگیز ئیمان بە خوا نابێتە هاونشینی دڵێك کە جگە لە خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) شتێکی تری تێدا سرەوتبیٚ. جا ئیتر ئەمەش حاڵی ئەو کەسەیە کە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیدا خۆ بەزلزانی و لوتبەرزی ڕەنگی داوەتەوە. هەر بۆیە لە فەرمووودەکەشدا کەسایەتی و ئەدگاری ئەو جۆرە مرۆڤە لەسەر شێوەی: "ئەو کەسەی لە ڕۆیشتندا پۆشاکەکەی لە زەوی دەخشێنێت." وێنا کراوە.

## منەتکار

کەسی دووەم یان کۆمەڵەی دووەم بریتییە لە "مَنَّان". ئەم مرۆڤە، خوای گەورە ماڵ و سامانێکی پیٚ بەخشیوە تاوەکو چۆن خۆی لێی سوودمەند دەبیٚ، ئاواش سوود بە دەوروبەرەکەی بگەیەنێت و بیبەخشێت بەوانیش، تا لە بەرامبەریشدا خوای گەورە یەك بە هەزار پاداشتی بداتەوە. بەڵام ئەم مرۆڤە هەر خۆشی تێنەگەیاندووە و هیچی نەبەخشیوە. گەر جاربەجارێکیش شتێکی بەخشیبیٚ، ئەوەشی بە منەتکردن پووچ کردووەتەوە. لەبیری

١ مسلم، البر ١٣٦؛ أبو داود، لباس ٢٦. (دەقی فەرموودەکە لە أبو داودەوە وەرگیراوە.)

چوویبووەوە کە چ خۆی و چ سەروەتەکەشی بەندە و موڵکی پەروەردگارن. لە کاتێکدا کە هەموو ئەرکێکی ئەو خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە موڵکی خوای گەورە دابەش بکات، کەچی ئەو، هەروەك ئەوەی خاوەن موڵکی ڕاستەقینە بێت، کەوتە شەیدایی منەت کردن بەسەر خەڵکییەوە. ئای ئەوە چ غەفڵەتێکی گەورە و چ کەوتنێکی ترسناکە!

ڕاستە خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) سەروەت و سامانی پێبەخشیوە، بەڵام ئەو سەروەت و سامانە مافی کەسانی تریشی پێوەیە. کەچی ئەم مرۆڤە دێت ڕەزیلی دەکات و دەستی دەنوقێنێ. حۆ ئەگەر شتێکیشی لە دەست ببێتەوە، ئەوا منەتی پێوە دەکات و دەیداتەوە بە چاوی بەرامبەرەکەیدا. مەگەر نەیدەزانی کە ئەگەر هەر هیچیش نەبەخشێت بەڵام بە ڕوویەکی خۆشەوە ئەو کەسە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە کە داوا دەکات، لەو سەدەقە و بەخشینە باشترە کە ئازاری بەدوادا دێت؟! ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرمویێ: ﴿ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ﴾ (البقرة : ٢٦٣) "قسە و گوفتارێکی جوان و شیرین و چاوپۆشییەك (لە هەڵە)، چاکترە لەو سەدەقە بەخشینەی کە ئازاری بەدوادا دێت و منەتی لەگەڵ بێ."

"مَنَّان" لە هەمان کاتدا مرۆڤی ڕژد و دەست نووقاویش دەگرێتەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە ڕژدی و ڕەزیلی، مرۆڤ لە خوا و لە بەهەشت و لە خەڵکیش دوور دەخاتەوە.. دووری دەخاتەوە و لە دۆزەخی نزیك دەکاتەوە. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکدا لەبارەی ڕەزیلییەوە دەفەرمویێ:

اَلْبَخِيلُ بَعِيدٌ مِنَ اللهِ بَعِيدٌ مِنَ الْجَنَّةِ بَعِيدٌ مِنَ النَّاسِ قَرِيبٌ مِنَ النَّارِ

"مرۆڤی چرووك و ڕەزیل لە خواوە دوورە، لە بەهەشتەوە دوورە، لە خەڵکیش بەدوورە و لە دۆزەخ نزیك."[١]

---

١ ترمذي، البر ٤٠؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٧/٣.

## سزایەک لە ڕەگەزی کردار

لە فەرموودەکەدا یاسایەکی ڕەوانبێژیمان بەرچاو دەکەوێت کە پێی دەڵێن "اللَّف و النَّشر المُرَتَّب" واتە، دەستەواژەی" وَلَا يَنظُرُ إِلَيهِمْ" ڕووی لە "مَنَّان"ە. ئەوەتا هەردووکیشیان لە ناوەڕاستدا هاتوون. یەکەمین و دوایەمین دەستەواژەش دووبارە دەڕوانن یەکتری. لەمەوە دەتوانین ئەم ئاماژە ڕەوانە هەڵبێنجێنین: وەك چۆن کەسی منەتکار لە دنیادا بە چاوی بەزەییەوە نەیدەڕوانییە خەڵکی و گرنگی پێ نەدەدان، ئەگەر جاروباریش بیبەخشیایە، دەیدایەوە بە چاویاندا و پووچەڵی دەکردەوە، لە ئاخیرەتیشدا ڕووبەڕووی سزایەك دەبێتەوە کە لە هەمان ڕەگەزی کردارەکەیەتی و خوای گەورەش (جَلَّ جَلَالُهُ) بە هەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

ئەوانەشی کەوا بە لووتبەرزی و خۆبەزلزانییەوە بە ڕێگادا دەڕۆن و دامێنی پۆشاکەکانیان بە زەویدا دەخشێنن و بێزیان نایەت قسە لەگەڵ کەسدا بکەن، با باش بزانن کە خوای گەورە لە قیامەتدا قسەیان لەگەڵدا ناکات. با ئەمە بزانن و بەو ڕێگەیەدا نەڕۆن کە دەیانگەیەنێتە ئەو سزایە.

کەسی سێیەمیش ئەو مرۆڤەیە کە بە درۆ و بە پاڵنەری هەستێکی نامەردانەی وەك دابین کردنی بەرژەوەندی دنیایی، سوێند دەخوات - ئەمە لە حاڵەتێکدا کە سوێند خواردن تەنانەت لە کاتی ئاساییشدا دروست نییە - و دەیەوێت لەم ڕێگەیەوە برەو بە ماڵەکەی بدات و بیفرۆشێت. ئەمەش ئەو سێیەمین تابلۆیەیە کە مرۆڤ ڕاپێچی چارەنووسێکی ڕەش دەکات و دەیخاتە بەر هەڕەشەی وَلَا يُزَكِّيهِم.

" وَ الْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ"یش گوزارشت لە کۆمەڵەی سێیەم دەکات.

هەروەك لە سەریشەوە ئاماژەمان پێدا، ئەمانە کەسانێکن وا دەزانن لە کاروباری بازرگانیدا بە درۆ قازانج دەکەن و باوەڕیشیان وایە کە بە سوێندی درۆ خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنن. بەڵێ، ئەو سێیەمین کۆمەڵەش کە شایستەی سزان، ئا ئەمانەن.

جا ئێستا تەماشایەکی ئەم "جَوَامِعِ الكَلِم"ی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بکەن

و لە ناخی دڵتانەوە بڵێن: فَصَدَقَ رَسُولُ اللهِ. دووپات کردنەوەی ئەمەش لەپاش هەر فەرموودەیەك. فەرزی ئەستۆمانە. هەموو دەربڕینێکی ئەو زاتە وامان لێ دەکات بڵێین: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ.

## ١٣. بەڵای زمان و عیففەت

لە فەرموودەیەکی تردا کە ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەفەرموێ:

مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَ مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ

"هەرکێ سەبارەت بەوەی لەنێو هەردوو شەویلگە و، لەنێو قاچەکانیایەتی پەیمانم بداتێ و بۆم زامن بکات، منیش بەهەشتی بۆ زامن دەکەم."[١]

ئەو کەسەی ئەم قسەیە دەکات، پێغەمبەری خوایە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). ئەو لە هەموو کەس باشتر دەزانێ کە مرۆڤ توانای کەفالەتی چی هەیە و چیشی لە توانادا نییە. جا ئەگەر فەرمووبێتی گەرەنتی بەهەشت دەکەم، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەیکات. ئەوەتا دەبینین کاتێ کەسێ لەبارەی هاوەڵێکی بەڕێزی وەك عوسمانی کوڕی مظعون (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، کە بە برا ناوی بردووە و لە باوەشی گرتووە، دەڵێت: "بووی بە باڵندەی بەهەشت و جێت هێشتین." پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بەرپەرچی دەداتەوە و، دەفەرموێ: "من سەرباری ئەوەی پێغەمبەری خوام، کەچی هێشتا نازانم چۆن مامەڵەم لەگەڵ دەکرێت. تۆ لە کوێوە زانیت ئەو بەهەشتییە؟!"[٢]

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە، کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەڵێنی بەهەشت بەو کەسە دەدات کە بەڵێنی پاراستنی نێوان دەم و داوێنی داوە و بەڵێنەکەشی دەباتە سەر، ئەوا ئەمە هەروا و لەخۆوە نییە. بەڵکو بەڵێنێکی وا، بە دڵنیاییەوە پاڵی داوە بە هەواڵێکەوە کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووە.

١ بخاري، رقاق ٢٣.
٢ بخاري، جنائز ٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٣٧/١، ٤٣٦/٦؛ طبراني، المجمع الكبير ١٣٩/٥، ٣٧/٩.

جا خۆ ئەو هیچ کاتێك بەگوێرەی ویست و ئارەزووی خۆی بەدەم خواوە قسەی نەکردووە. کەوابێ، فەرمایشتەکانی خودی حەق و حەقیقەتن. ئەو بەڵێنانەشی کە داونی، هەر ئەوەندەی ڕۆژیان هات، هەموویان وەك خۆیان دێنە دی.

ئەگەر تۆ توانیت پارێزگاری ئەو زمانەی نێوان شەویلگەکانت بکەیت و، نێو دامێنت بپارێزیت و بە عیففەتەوە بژیت، ئەوا بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێم.. ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا زەبانییەکان قۆڵبەستیان کردیت و بەرەو دۆزەخ ڕاپێچیان کردیت، ئەوا دەتوانی تا دەنگت بڕ دەکات هاوار بکەیت و بڵێیت: "من رسول الله کەفالەتی کردووم." دڵنیابە ئەم هاوارەت بێهوودە نابێ و، دەبینی کە چۆن شەفاعەت و کەفالەتی حەزرەتی محمد المصطفی (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) دەگاتە فریات.

## قسەکردن نیعمەتە

لە ڕاستیدا دەمی مرۆڤ کە بەهرەمەندی نیعمەتی دەربڕینە، ئەندامێکە نرخ و بەهای لە پێوانە نایەت. بەڵام کاتێ ئەندامێکی وا موبارەك لە خراپەدا بەکارهات، دەبێ بە زیانبەخشترین ئامراز و، مرۆڤ بەرەو کارەسات و لەناوچوون دەبات. هەر دەمە کە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێ تەسبیح و تەقدیسی خوای گەورە بکات. فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپەش هەر لە ڕێی دەمەوە دەکرێت. مرۆڤ لە ڕێی دەمەوە پەڕاوی گەردوون و ڕاڤەکارە ئەزەلییەکەی کە قورئانی پیرۆزە دەخوێنێتەوە و بۆ کەسانی تریشی باس دەکات. جاری واش هەیە بە دەربڕین و گوفتارەکەی مرۆڤی بێباوەڕ دەهێنێتەوە نێو بازنەی باوەڕەوە.. بەمەش کارێك ئەنجام دەدات کە چاکتر بێ لە هەموو ئەو شتانەی خۆری بەسەردا هەڵدێ و ئاوا دەبێ.. هەروەها مرۆڤ لەڕێی دەمیەوە بەرز دەبێتەوە بۆ "أَعْلَى العِلِّيين" و لە لوتکەی "صیددیقییەت"دا تەخت دادەمەزرێنێ.

بەڵام بیرمان نەچێت کە هەر ئەم دەمەشە مرۆڤ بەرەو تیاچوون دەبات. ئەوەتا هەرچی کوفر و کوفرانە، هۆکارەکەی دەمە. ئەوانەی پڕ بەدەم جنێو بە خوا و پێغەمبەرە پایەبەرزەکەی دەدەن، هەر لە ڕێی دەمەوە ئەم تاوانە قێزەونە ئەنجام دەدەن. هەرچی درۆ

و غەیبەت و بوختانیش هەیە هەر بە دەم دەکرێت. ئیتر تا ئەوەی مرۆڤ لە ڕێی دەمەوە دەکەوێتە نێو چاڵی درۆی موسەیلەمەوە.

ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەنها یەك وشە دەفەرموێ و سەرنج بۆ لای یەك ئەندام ڕادەکێشێ.. ئیدی ئەو تاکە وشەیە، بە سەدان حەقیقەت کە تا ئێستا باس نەکراون و، ئەو چەند لایەنەش کە لەسەرەوە باسیان ڕابورد، هەر هەمووی لە خۆیدا کۆدەکاتەوە. پێمان دەفەرموێ: "دەم لە بازنەی ڕێگەپێدراوی خۆیدا بەکاربێنن، تا منیش بەڵێنی بەهەشتتان بدەمێ." ئەمە بەو مانایە نایەت کە "دەمتان دابخەن و بۆ خۆتان لە گۆشەیەکدا دابنیشن"، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە: "لە بازنەی ڕێگەپێدراودا بەکاری بێنن."

## ئەدەب لە قسەکردندا

دەبینین پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ناوی ئەندامی مەحرەم ناهێنێ.. بەڵکو لە شوێنیدا دەستەواژەی "لە نێوان دوو قاچ" بەکار دەهێنێ. ئەمەش خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە دەرکەوتەکانی ئەدەبە بەرزەکەی. جا خۆ تەنانەت کاتێ لەو شتانەش دەدوا کە باس کردنیان بە لای ئێمەوە ئەوپەڕی ئاسایی و سروشتی بوون، ئەو لەنێو ئەدەبێکی قووڵی وا تایبەت بە خۆیدا قسەی لێدەکردن، تەنانەت ئەو شتانەش کە بە ڕواڵەت بەلای هەندێکمانەوە ناحەز و بێزراو بوون، لەپڕ لەبەر چاواندا دەبوون بە تابلۆی جوان و نەخشین. مرۆڤێك بوو هەر بە ئەخلاق و ئاکار و خووڕەوشت و سروشتی، لەسەر جوانی و جوانخوازی بەرنامەڕێژ کرابوو.

بڕوانە، کاتێك باس لە ئەندامێك دەکرێت کە ناوهێنانی لەنێو مرۆڤەکاندا مایەی شەرمە، ئەو لەنێو جوانییە تایبەتەکەی خۆیدا ئاماژەی بۆ دەکات و، دەستەواژەی "نێوان دامێن" بەکاردەهێنێ. دەی من چی بڵێم: "هەڵبەتە جوانە ئەوەی پەیڕەوی جوانان دەکات..."

## نێوان دامێن

نێوان دامێن زۆر گرنگە. ئەو میوە قەدەغەکراوەی کە بوو بە هۆکاری هاتنە دەرەوەی حەزرەتی ئادەم لە بەهەشت، لەم ڕەهەندەدا ڕوویداوە. جا لەبەر ئەوەی شیکردنەوەی دوور و درێژی ئەو ئایەتەی کە باس لە هاتنە دەرەوەی حەزرەتی ئادەم دەکات لە بەهەشت، لە دەرەوەی بابەتەکەمانە، بۆیە ئێستا ناچینە ناو ئەو باسەوە. بەڵام لەبەر هەستیاریی و گرنگی بابەتەکە چەند لایەنێك دەخەینە ڕوو:

وەك چۆن بەردەوامی نەوە و وەچەکان لەم ڕێگایەوەیە، لەناوچوون و داڕمانیشیان بەهۆی زینا و بەدڕەوشتییەوە هەر لەم ڕێیەوەیە. چونکە لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانییەوە ڕەچەڵەك و نەژادەکان تێکەڵی یەك دەبن و دەشێوێن. بەم هۆیەشەوە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەی کە پێویستە لە هەموو سیستەمە یاساییەکاندا بپارێزرێن، دەبنە قوربانی دەستی ئەم لایەنە و، تیاچوون و ڕووخان بەرۆکیان دەگرێت.

کێ باوکی کێیە؟ کێ میرات بۆ کێ جێ دەهێڵێ؟ کێ داوای ماف لە کێ دەکات؟ خێزان چۆن دەپارێزرێ؟ میللەت چۆن بە زیندوویی دەمێنێتەوە؟ هەموو ئەم پرسیارانە و هاوشێوەکانیان وابەستەی عیففەت و داوێن پاکین. لە کاتێکدا مرۆڤە داوێن پاکەکان و ئەو کۆمەڵگایانەش کە لەو مرۆڤانەوە هاتوونەتە مەیدان، تاوەکو قیامەت بەردەوامی بە بونیادی ناوخۆیان دەدەن. کەچی ئەو تاك و میللەتانەی نوقمی نێو لیتاوی زینا و بەدڕەوشتی بوون، ناتوانن بوونی خۆیان لە وەچەیەك زیاتر درێژە پێبدەن.

لە ڕاستیدا بە وێنەی سەرجەم بابەتەکانی تر، لەم بابەتەشدا بازنەی حەڵاڵ بەرفراوانە و سەروزیادی تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤە. بۆیە هیچ پێویست بە چوونە نێو بازنەی حەرام ناکات. چونکە ئەو حەز و ئارەزووەی لە مرۆڤدا هەن، لە بازنەی حەڵاڵیشدا دەکرێ بە جوانترین شێوە دەستەبەر بکرێن و تێر بکرێن. لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ:

تَنَاكَحُوا تَكْثُرُوا فَإِنِّي أُبَاهِي بِكُمُ الْأُمَمَ "هاوسەرگیری بکەن و زۆر ببن، چونکە لە

بەرامبەر ئوممەتەکانی تردا شانازی بەزۆریتانەوە دەکەم."[1] بەڵێ، پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە بەرامبەر ئوممەتەکانی تردا شانازی بە زۆری ئوممەتەکەیەوە دەکات. تەنانەت ئوممەتەکەی ئەوەندە زۆر دەبێت، ئوممەتەکانی تر لەچاویدا دیار نامێنن. جا زۆربوونی ئوممەتەکەی دیسانەوە بەندە بە داوێن پاکییەوە. بەڵێ، تەنها لەم ڕێگایەوە ئەو ئەنجامە بەدەست دێت. بێ ڕەچەڵەك و نەسەبەکان و ئەوانەش کە خاوەنی ڕەسەنترین نەسەبن، هەر لەم ڕێیەوە چاو بەدنیا هەڵدێنن، ئیدی ئەوێ، زەوییەکی بەپیتی وایە کە بەڕووی هەردوو دژەکەدا کراوەیە.

لە لایەکی ترەوە، سۆراغی مرۆڤ لەم ڕووەوە بەدوای ڕێگەیەکی حەڵاڵدا، پاداشتی ئەنجامدانی فەرزێکی دەست دەخات. کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەمەی بۆ هاوەڵە بەڕێزەکان ڕوون دەکردەوە، ئەصحاب بە سەرسووڕمانەوە پرسییان کە چۆن شتی وا دەبێت؟ پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بە دەم زەردەخەنەوە ئەم وەڵامەی دانەوە: "ئەی ئەگەر بە ڕێگای حەڵاڵ ئەنجامی نەدایە، حەرام نەدەبوو؟"[2] هەمووشمان دەزانین کە وازهێنان لە حەرام فەرزە. کەواتە گرتنە بەری ڕێی حەڵاڵ پاداشتی فەرزێك دەستی مرۆڤ دەخات.

دە ئێستا بڕوانن، بابەتێکی وا، کە لە ڕوانگەی ڕواڵەتەکەیەوە خەڵکی بە ناوهێنانی شەرم دەیانگرێت، ڕێگەیەکە کە تەنانەت پێغەمبەرانیش پێیدا تێپەڕبوون. دەی ئەگەر هەستێکی وا بە حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلام) نەبەخشرایە، شانازی مرۆڤایەتی، حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) چۆن دەهاتە بوونەوە. کەواتە ئامانجی سەرەکی ئەو میوە قەدەغەکراوە و مەبەستە ڕاستەقینەکەی، بریتی بووە لەوەی کە بەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) بگرێت...

"ئەگەر حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلام) پەیوەندی نێوان دەستبردن بۆ ئەو میوە قەدەغەکراوە و هاتنە دنیای حەزرەتی موحەممەدی بزانیایە، نەك هەر دەستی بۆ دەبرد، بەڵکو دارەکەی

---

١ عبدالرزاق، المصنف ١٧٣/٦. (بۆ بینینی ئەو فەرموودانەی واتای هاوشێوە دەدەن بە دەستەوە بڕوانە: أبو داود، نكاح ٣؛ نسائي، نكاح ١١؛ إبن ماجة، نكاح ١.)
٢ مسلم، زكاة ٥٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٦٧/٥-١٦٨.

بە ڕەگەوە دەخوارد...“ ئەم وتەیەم لە وتاربێژێکی دڵگەرمی بەجۆشمانەوە گوێ لێبوو...

## ویلایەتی ستوونی

بەتایبەت لێرەدا دەمەوێ سەرنجتان بۆ لای بابەتێکی زۆر گرنگ ڕابکێشم: پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) بەڵێنی بەهەشت دەدا بەو کەسەی بەڵێنی پاراستنی نێوان دوو شەویلگە و نێوان قاچەکانی دەدات. ئەو بەژن و باڵا نایابانەی مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە دیارن.. کەواتە بەدەر لەوانیش کەسانێکی تر هەن کە لەبەر حورمەتی ئەو پایەیەی پێی گەیشتوون و، ئەو نزیکییەی دەستیان خستووە، بەهرەمەندییەکی لەم جۆرەیان بەدەست هێناوە. بەدەست هێنانی ئەم بەهرەمەندییەش دەگەڕێتەوە بۆ زەحمەتیی پاراستنی دەم و داوێن.. ڕێشی تێدەچێ وابێ، چونکە لەو ساتانەدا کە شەهوەت زۆر بۆ مرۆڤ دێنێ و، سەرتاپای جەستەی دەتەنێ و ڕۆحی دەهەژێنێ، تەنانەت لەو کاتەدا کە ئیرادە سست و خاو دەبێتەوە و بەڕووی هەموو جۆرەکانی خراپەدا دەکرێتەوە، خۆگرتنەوەی مرۆڤ و، زاڵبوونی بەسەر نەفسیدا لەبەر خاتری خوای گەورە، کارێکی هێندە گرنگە، لەوانەیە هەر بە ستوونی بیگەیەنێتە لوتکەی کەماڵات. بەدڵنیاییشەوە ئەو کەسەی لەم کارەدا سەرکەوتوو دەبێ، دەچێتە ژێر کەفالەتی پێغەمبەری خواوە و بەرەو بەهەشت دەفڕێت.

بەڵێ، جەخت دەکەمەوە و دەڵێم: ئەوەی بتوانێ کەف و کوڵ و هەڵچوونەکانی نەفسی لغاو بکات، لە دەمی ئامادەیی نەفس بۆ هەموو جۆرە خراپەکارییەك، بتوانێ بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و، بیگرێتەوە لە چوونە نێو تاوان و، بەردەوام بە ئارامییەوە لە ڕوویاندا بوەستێتەوە و، بەبێ وچان کار لەسەر ئەم خاڵە لاوازانە و هاوشێوەکانی بکات، ئەم کەسە دەتوانێ لە ساتێکدا ئەو فەیزانە بەدەست بێنێت کە کەسانی دی بە چەندین ساڵ سەیر و سلووك و موجاهەدەی نەفس ئینجا دەتوانن بەدەستی بێنن. هەروەها پاداشتێکی دەست دەخات کە زۆر لە پاداشتی ئەو کەسە زیاتر بێت کە هەموو شەوێك هەزار ڕکات نوێژ دەکات. هەموو ئەمانەش لەماوەی تەنها ساتێکدا... بەڵێ، لە ماوەی تەنها ساتێکدا دەستی دەخات و بە شێوەیەکی ستوونی دەیگەیەنێتە مەقامی ویلایەت.

تکا دەکەم کەس وا گومان نەبات کە بەمانە لە قەدر و بەهای نوێژ و ڕۆژووی نافیلە کەم دەکەمەوە.. بەڵکو هەریەك لەوانە بۆ خۆی هۆکارێکی گرنگی نزیك بوونەوەی بەندەیە لە کردگاری بەدیهێنەری. تا دنیاش دنیا بێ هەروا دەمێنێتەوە. بەڵێ، تەنها ویستمان یەکێکی تر لەو هۆکارانە بێنینەوە یاد کە مرۆڤ بەرەو کەماڵاتی مرۆڤایەتی بەرز دەکەنەوە.

دەی با لە خوای گەورە بپاڕێینەوە کە: لە ڕووی بەشەریەتەوە هێزی پێنج شەش مرۆڤمان پێببەخشێت و پڕچەك و سازمان بکات بەو بنەمایانەی کە مرۆڤ بەرەو ئەوجی کەماڵاتی مرۆڤایەتی بەرز دەکەنەوە و، بشمانپارێزێت لە هەموو جۆرە خراپ بەکارهێنانێکیان!

لە ڕاستیدا زۆر گرنگە کە مرۆڤ بە سروشتێکی لەبار بۆ خراپە و، لە زەمینەیەکی پڕ مەترسیدا خۆی بپارێزێت و بەردەوام بێت لە ڕێکردن. بەڵێ، هەروەك ناوەڕۆکی "بِحَسَبِ الْمَغْرَمِ الْمَغْنَمُ" ئاماژەی بۆ دەکات، پاداشت و دەستکەوت هێندەی ماندوو بوونە. بەرزی و بڵندیش بە ئەندازەی بەزاندنی مەترسییەکانە. ئەو زەمینەیەی کاری تێدا دەکەین چەندێك مەترسیدار بێت و، ئەو بەرپرسیارێتییەی دەیگرینە ئەستۆ، چەندە لە ڕۆخی کەندەڵاندا بێت، ئەوەندە پاداشت و خەڵاتەکە گەورەتر دەبێت.

با ڕۆشنایی زیاتر بخەینە سەر بابەتەکە:

ئەوەتا خوای گەورە هەندێ ماددەی زیانبەخشی خستووەتە نێو ماهیەتتان، لەوانە: تووڕەیی، قین، نەفرەت، شەهوەت... بەڵام هیچ کام لەمانە هیچ کاتێ نەیانتوانیوە کاری خۆیان لە ئێوەدا ڕایی بکەن و، بتانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەو ئیرادە سەرسووڕهێنەرەی خۆتان، جڵەوی ئەمانەتان گرتووە و خستووناتە ژێر کۆنترۆڵی خۆتانەوە.. وەك مرۆڤی بە ئیرادە و ڕۆحانی ژیاون، فەرز و سووننەتەکانیشتان بەجێهێناوە، پلەی ژیانی ڕۆح و دڵتان گرتووەتە بەر و گێرۆدەی زرق و برقی جوانییە سەرنجڕاکێشەکانی ڕێگای دۆزەخ نەبوون، بگرە شانتان داوەتە بەر زەحمەتییەکانی سەر ڕێی بەهەشت و بەم جۆرەش هەوڵی پاراستنی خواویستی و ڕەببانییەتی خۆتان داوە...

ئیتر هەر ئەوەندەی دەزانیت بویتەتە هاونشینی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان.

پێم وایە هەر ئەم ڕازەشە لە پشت ئەو ئاوڕدانەوە پڕ سۆز و میهرەی حەزرەتی محمد المصطفی (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بە ڕووی ئەم کۆمەڵەدا کە نوێنەری ژیانەوەی دووەمن و، لە ئاخر زەماندا و لە نێوەندی هەزار و یەك فیتنەدا هەوڵی بەرز کردنەوەی بەیداخی دینی موبینی ئیسلام دەدەن... لە کاتێکدا شەقام و بازاڕەکان هەروەکو دۆڵەکانی دۆزەخ مرۆڤەکان پەلکێشی نێو خۆیان دەکەن و دەیان توێننەوە، ئەم مرۆڤانەی کە بوونی خۆیان دەپارێزن و، دان بەخۆدا دەگرن و، پێداگری دەکەن، ئەوانەن کە لە مەعییەتی هاوەڵە بەڕێزەکاندا هەژمار دەکرێن. ئەوان هاوەڵی پێغەمبەری خوان و ئەمانیش براکانی. ئەوەتا هەر لە سەردەمی خۆیدا تاسەمەندیی خۆی بۆ ئەم مرۆڤانە دەرخستووە کە چەندین سەدە دوای خۆی دێن و، وەك بڵێی فەرموویەتی: "سەلام لە براکانم."[1]

بەڵێ، هەر دەڵێی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەگەڵ هەموو سەدەکان، بە تایبەتیش ئەم سەدەیەی خۆمان دەدوێت و، دەفەرموێ: "کێ بەڵێنی پاراستنی دەم و داوێنیم بداتێ، من دەبم بە کەفیلی بەهەشتی." ئەو وتەیە ڕووی لە کەسانێکە کە تا بڵێی ئارەزوومەند و موشتاقی بەهەشتن. تا بشڵێی عاشقی دیداری خوای گەورە و پێغەمبەرەکەین. ئیدی ئەمانە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم فەرمایشتە مژدەئامێزەی پێغەمبەری خوادا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) هەنگاو دەنێن و بە پشتیوانی خوای گەورەش سەرکەوتوو دەبن.

جا وەك لەبەر چاودایە، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە پوختترین دەربڕین ئەو ڕێگایانەی بەرەو بەهەشت دەڕۆن، بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە و، بەم دەربڕینە کورت و پوختەش وێنای تاك و کۆمەڵێکی نموونەیی دەکێشێ. ئێستا دەپرسین: داخۆ جێ کردنەوەی حەقیقەتێکی هێندە دوور و درێژ لە دەستەواژەیەکی هێندە کورتدا جگە لەوەی کە بدرێتە پاڵ فەتانەتی ئەعظەم، بە چ شتێکی تر لێك دەدرێتەوە؟ بەڵێ، سوڵتانی گوفتار هەر خۆیەتی و، "جَوامِعِ الكَلِم"یش هەر بە گوفتارەکانی ئەو دەوترێ.

---

١ مسلم، طهارة ٣٩؛ نسائي، طهارة ١١٠؛ إبن ماجة، الزهد ٣٦.

## ١٤. ئەو کردەوانەی هەڵەکان دەسڕنەوە و پلەکان بەرز دەکەنەوە

لە فەرموودەیەکی تردا کە ئیمامی موسلیم گێڕاوێتیەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێ:

أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا وَ يَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ. قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ وَ كَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ وَ انْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ

"ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەوەی کە بە هۆیەوە خوای گەورە هەڵەکانتان دەسڕێتەوە و پلە بە پلە بەرزتان دەکاتەوە؟ هاوەڵانیش فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. ئەویش فەرمووی: دەستنوێژ گرتنی تەواو و تێروتەسەل لەو کاتانەدا کە (هەلومەرجەکان تا بڵێی زەحمەتن و) دەستنوێژ گرتن ناڕەحەتە. زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت (هاتووچۆی زۆری نێوان ماڵ و مزگەوت)، چاوەڕێ کردنی نوێژ لەدوای نوێژ (دوای هەر نوێژێك بکەویتە چاوەڕوانی نوێژەکەی تر). ئیدی ئا ئەمەیە "الرِّبَاطُ"، ئەو خۆبەخوا پەیوەست کردنەی کە لە پلەی ئێشکگرتنندایە لەسەر سنوورەکان."[١]

ئێستاش با ئەوەندەی لە تواناماندایە هەڵوێستە لەسەر ئەم زنجیرە وتە زمڕوتییە بکەین:

هەر لە سەرەتاوە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَفْضَلُصَلَاةٍوَسَلَام) بە وشەی "أَلَا" سەرنجی دوێنراوەکانی ڕادەکێشێ و ئاگاداریان دەکاتەوە. ئاخر ئەو بابەتانەی لە فەرموودەکەدا باس دەکرێن، کۆمەڵە بابەتێکن کە داخوازی سەرنجدان و کۆکردنەوەی بیر و هۆشن. جا خۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە، تەنها بە دیقەت و بێدارییەوە دەکرێ. ئەوەتا کۆمەڵە هەڵسوکەوتێك هەیە کە مرۆڤ تەنانەت لە کاتی خەویشدا دەتوانێت پێیان هەڵسێت. بۆ نموونە، ئەگەر کەسێك لەبەر ئەوەی خەوتووە زینا نەکات، یان لەبەر ئەوەی لە

١ مسلم، طهارة ٤١؛ ترمذي، طهارة ٣٩.

خەودایە غەیبەت نەکات، ئەوا بەلایەنی کەمەوە تووشی ئەم گوناهانە نەبووە. بەڵام ئەو هەڵسوکەوتانەی ئێمە دەمانەوێ هەڵوێستەیان لەسەر بکەین، کۆمەڵە هەڵسوکەوتێکن کە هەر لە بنەڕەتدا پێویستییان بە بێداری هەیە و، تەنها ئەوانەی بە ئاگا و بێدارن، دەتوانن ئەنجامیان بدەن. هەربۆیە لە سەرەتای فەرموودەکەدا ئامرازی ئاگادار کردنەوەی "أَلا" بەکار هاتووە.

وشەی "هەڵە"ش یەکێکە لەو وشانەی کە جێی سەرنجە. هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات. تەنانەت ئەو کەسەی دەڵێ هەڵەم نییە، وا دادەنرێت کە گەورەترین هەڵەی کردووە. هەڵەنەکردن تایبەتە بە پێغەمبەران كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ "هەموو کەسێ هەڵە دەکات. چاکترینی ئەو کەسانەش کە هەڵە دەکەن، ئەوانەن کە تەوبە دەکەن."[١] جا لێرەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەیەوێ هەواڵی ڕێگەچارەی ڕزگاربوونمان لەو هەڵانە بداتێ کە مرۆڤ بەرەو دۆڵەکانی دۆزەخ پەلکێش دەکەن.

بە تەنها ڕزگار بوون لە هەڵە بەس نییە، بەڵکو قۆناغبڕی و پلە بە پلە بەرز بوونەوەش گەلێك گرنگە. لە ڕاستیدا سڕینەوەی هەڵەش بۆ خۆی پلەیەك بەرز بوونەوەیە. ئینجا کردەوەکانی تریشی دێن و بە چەندین قووڵایی تری دەگەیەنن.

ئیدی بەم شێوەیە، مرۆڤ لە سایەی ئەم کردەوە ئەرێنی و نەرێنییانەیدا، دەچێتە نێو حەلەزۆنێکی نوورانی و، بەردەوام بەرەو ناکۆتایی بوون لە پەروازدا دەبێ. پێم وایە چارۆکە هەڵدان لە دەریای مەعریفەتی ئیلاهیدا هەر ئەمە بێ...

یەکەمینی ئەم کردەوانە، دەستنوێژ گرتنە لە سەختترین هەلومەرجدا. مەرجە ئەو دەستنوێژەش بێ کەموکورتی و دوور لە ناتەواوی بێ. لە بەفر و سەرماوسۆڵە و زستان و دەستنەکەوتنی ئاو بۆ دەستنوێژ و حاڵەتی تری وەك ئەمانەدا...

دووەمیشیان بریتییە لە بەسەر بردنی تەمەنێك لە ڕێگای مزگەوتدا. تەمەنێکی لەو جۆرە، ڕۆژێك دێ هەروەك تۆوی ڕزیو، دەبێ بە دارێك لە ئاخیرەتدا کە بەری بەهەشتی گرتبێ. بەڵێ، ڕووکردنە مزگەوتە دوورەکان و دانەبڕان لە مزگەوت.. ئەمەش کردەوەی دووەمە.

---

١ ترمذي، قيامة ٤٩؛ إبن ماجة، زهد ٣٠؛ الدارمي، رقاق ١٨.

## ئامانج نوێژه

سێیەمینیشیان چاوەڕێکردنی تاسەمەندانەی نوێژە لەدوای نوێژ. ئەمە، وەك لە فەرموودەیەکی تریشدا باس کراوە،[1] بە مانای دڵ هەڵواسران بە مزگەوتەوە دێت.

نوێژ پشووی ڕۆح و سەیرانی ویژدانە. هەموو کەسێ بەرامبەر بە شتێك خاڵێکی لاواز و شەهوەتێکی هەیە. شەهوەتی پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) کە بە مانای تاسەمەندی و ئارەزوویەکی توند دێت، بەرامبەر بە نوێژە.[2] هەر بۆیە هەموو جارێ بە بیلالی دەفەرموو: أَرِحْنَا يَا بِلَال "ئادەی بیلال کەمێك بمان حەسێنەوە (دڵمان فێنك بکەوە)."[3] هەروەها ئاماژەی بەم لایەنە دەکرد و، دەیفەرموو: وَ جُعِلَ قُرَّةَ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ "ڕۆشنایی چاوم خراوەتە نوێژەوە."[4] پێم وایە ئەو حەز و تاسەمەندییەی کە ئێمە لە کاتی چوونە بەهەشتدا هەستی پێدەکەین، پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لەگەڵ دەستکردن بە هەر نوێژێکدا هەستی پێ دەکرد. هەربۆیە لە دوای هەر نوێژێك، بە تاسەمەندییەوە چاوەڕێی نوێژی دواتری دەکرد.

لە فەرموودەکەدا باس لە سێ شتی جیاواز دەکرێت. بەڵام ئەگەر سەرنج بدەیت، ڕاستەوخۆ بۆت دەردەکەوێت کە هەر سێکیان بە دەوری تەوەری نوێژدا دەسووڕێنەوە. نوێژ هۆکارێکی هێندە گرنگە لە ژیانی ئادەمیزاددا کە سەرێکی لە میعراجدایە و، بە جوانترین شێوە مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە لە حەقیقەتە مرۆڤانەکان و، بە میعراجی ئیماندار هەژمار کراوە.

نوێژ کۆڵەکەی دینە.[5] هەر نوێژیشە کە کەشتی دین وەگەڕدەخات. بەبێ ئەویش ئەستەمە دین بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن بمێنێتەوە. وەك چۆن خودی نوێژ بۆ خۆی کرداری ئاگادار کردنەوەیە، هەروا بەجێهێنانەکەشی دەبێ بە هەمان شێوە وەك ئاگادار

---

١ بخاري، أذان ٣٦؛ مسلم، زكاة ٩١.
٢ الطبراني، المجمع الكبير ٨٤/١٢.
٣ أبو داود، الأدب ٧٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٦٤/٥، ٣٧١.
٤ نسائي، عشرة النساء ١؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٩٩/٣.
٥ بيهقي، شعب الإيمان ٣٩/٣.

کەرەوەیەك بەجێبهێنرێت. بەجێهێنانی ئەم ئەرکە مەزنە داخوازی ئەوەیە کە مرۆڤ دڵ و هەستەکانی لە هەموو سەرقاڵییەکی تر خاڵی بکاتەوە. هەر لەبەر ئەمەیشە کە دروست نییە مرۆڤ لە کاتی تەنگاوییدا بۆ نوێژ بوەستێت.[1] بەڵێ، کاتێ مرۆڤ مێشکی بە شتی ئاواوە سەرقاڵ بێ، نابێ بۆ نوێژ بوەستێ. چونکە لەو کاتەدا مێشکی مرۆڤ بە دوو شتەوە خەریکە. لەم جۆرە حاڵەتانەشدا زۆربەی جار مەسەلە گرنگەکان فەرامۆش دەکرێن. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم ڕەفتارە بێڕێزی نواندنیشی تێدایە بەرامبەر بە نوێژ. چونکە نوێژ کارێکی هێندە سانا و ساکار نییە کە هەروا سەرپێیی بەڕێ بکرێ. بۆ ئەوەش دانەنراوە کە لەکۆڵ بکرێتەوە، بەڵکو بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەو نێوانە دانراوە.

## ئامادەکاری بۆ نوێژ

لە لایەکی ترەوە سەرجەم ئەو ئامادەکارییە پێشوەختانەی کە نوێژخوێن دەیکات بە مەبەستی بەدەستهێنانی حوزووری قەلب لە نوێژدا، بە وێنەی خودی نوێژەکە پاداشتی دەست دەخەن. بۆیە سەرەتا ئەو شتانەی پێویستە بیانخاتە لاوە، دەیان خاتە لاوە و تەنها بە هەستی بەندەگییەوە دەچێتە نێو خولگەی بەندایەتییەوە و، خۆی ڕزگار دەکات لە هەموو ئەو کاریگەرییانەی لە نوێژدا سەرقاڵی دەکەن. ئیتر بەم شێوەیە دەچێتە نوێژەوە. بەم جۆرە هەموو ئەو قۆناغانەی تا کاتی وەستان بۆ نوێژ ئەنجامی داوە، بە چاکە بۆی دەنووسرێت. چونکە نییەتی ئەو، نوێژکردنە بە ئامادەگیی دڵ. نییەتی ئیمانداریش لە کردەوەکەی خێرترە.[2] تۆ بیر بکەرەوە، ئەگەر کەسێك ئەم پێداویستییەی جێبەجێ بکات، تەنها پێداویستییەکەی جێبەجێ کردووە و بەس. کەچی ئیماندار تەنانەت لەسەر دەست بەئاو گەیاندنیش پاداشت دەدرێتەوە.. بەڵێ، ئیماندار لەسەر دەست بە ئاو گەیاندن و تارەت گرتنیش پاداشت وەردەگرێت.

لە ڕاستیدا دەست بەئاو گەیاندن و دەستنوێژ، لەو ڕووەوە کە مرۆڤ بە ڕۆح بۆ نوێژ ئامادە دەکەن، تا بڵێی گرنگن. جا ئایا ئەمە لەبەر ئەوە بێت کە لە کاتی

---

١ ترمذي، طهارة ١٠٨؛ إبن ماجة، طهارة ١١٤.

٢ الطبراني، المجمع الكبير ١٨٥/٦-١٨٦؛ البيهقي، السنن الصغرى لا ٢٠.

شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژدا بارگە کارەباییەکانی جەستەی مرۆڤ تووشی ڕێڕەو گۆڕین دەبن یان بەهۆی هەر لێکدانەوەیەکی ترەوە بێت کە بۆی دەکرێت، ئەنجام هەر یەك ئەنجامە. لە ڕاستیدا کاتێ ئیماندار دەستنوێژ دەگرێت، ئەم حیکمەتانە هەر بە مێشکیشیدا ناهێنێت. دەستنوێژگرتنی بۆ چی بێ، بیریشی هەر لای ئەو شتەیە. بێگومان نوێژیش لە پلەی یەکەمی ڕیزبەندیی بیرکردنەوەکانیدایە. ئەو ئامادەکارییەی بۆ دەستنوێژ دەکرێت یەکەمین ئاگادارکەرەوەیە، دووەمینیشیان دەستنوێژ خۆیەتی.

ئەوجا بانگ دەفەرموێ. ئەمەش بۆ سێیەمین جار مرۆڤ بۆ نوێژ ئاگادار دەکاتەوە. لە ڕاستیدا بەجێهێنانی سوننەتە مەسنوونەکانی هاوشێوەی خواردنەوەی ئەو ئاوەی کە زیادەیە و، دوعاکردن، چ لە دەمی دەستنوێژدا بێ یان لە کۆتاییەکەیدا، خۆی لە خۆیدا جۆرێك تاودانە بە ئامادەگی ڕۆحی و مەعنەوی مرۆڤ. خۆ هەر ئەوەندەی نوێژی سوننەتەکەشی بۆ زیاد کرد، ئیدی مرۆڤ بە تەواوی ئامادە دەبێ بۆ نوێژی فەرز.

بەڵێ، لەنێو خولگەی نوێژدا هەموو شتێك نوێژمان بیر دەخاتەوە. هەر لە سەرەتاوە ئەو زایەڵە لاهوتییەی لە منارەکانەوە بەرز دەبێتەوە، تا دێت هەڵکشانی مەعنەوییمان پتر دەکات، تا وای لێدێت لە ویژدانماندا هەست بە مەزنی خوای گەورە دەکەین. بۆ گەیشتن بەو مزگەوتەی بۆی دەڕۆین، هەنگاوەکانمان گورجوگۆڵتر دەکەین.. ئیدی هاودەم لەگەڵ بانگدا، هەروەك بڵێی بەدەم ئەو بانگهێشتەوە دەچین کە لە جیهانەکانی ئەودیوەوە هاتووە، بۆیە خێراتر هەنگاو دەنێین. کاتێك ئەو دەنگەی بانگ دەبڕێ، بەرەو کۆتایی دەچێت و ڕوو لە توانەوە دەنێ، ئێمەش بە تەواوی ڕۆح و ویژدانمانەوە لەگەڵیدا دەتوێینەوە. پاشان دێینە مزگەوت و نوێژی سوننەت دەکەین. ئەمەش لە ڕوویەکەوە بە تاسەوە لە دەرگا دانی قاپیی نوێژی فەرزە. دەڵێی بەم نوێژی سوننەتە دەمانەوێ بە پەروەردگارمان بڵێین:

پەروەردگارا! دەمەوێ هەردەم ڕووم لە تۆ بێت.. ڕووم لە تۆ بێت و ئەوەی لەدووی دەگەڕێم لە قاپی تۆدا بەدەستی بێنم.. دەمەوێ تەنها تۆ ببینم، تەنها تۆ ببیستم و ساتێکیش بێ تۆ هەناسە نەدەم. ئاخر چونکە جگە لە تۆ، ڕوانینە هەر لایەکی تر،

بینینی هەر شتێکی تر، سەرقاڵ بوون بە هەر شتێکی ترەوە نابەجێیە. منیش لە دەست شتی نابەجێ هەڵدێم و ڕوو لە شتێکی زۆر گرنگ دەکەم.

زۆرکردنێکی لەم جۆرەی دەرگای نوێژی فەرز و، تەقەدان لە دەرگای ڕەحمەتی ئیلاهی و، هەوڵی بەدەستهێنانی هۆشیاری و بێداری بۆچوونە ناو نوێژەوە لە نوێژی سوننەتدا، هۆکارگەلێکی گرنگن کە دیقەت و تەرکیز لە فەرزدا دەستەبەر دەکەن.

دەستنوێژ ئەو کاریگەرییەی پێویست بوو کردی.. بانگیش بە هەمان شێوە.. بەدەم سوننەتیشەوە هەنگاوی سێیەممان نا.. ڕێك لەم کاتەدا بانگبێژێك هەڵدەستێ و، بە کەماڵی ئیخلاسەوە ڕوو لە خوا دەکات و، بە نەوایەك کە لە قووڵایی دڵەی قرچاوییەوە دێتە دەر، قامەت دەخوێنێ. ئیدی ئەمە بۆ ئێمە ئەو دوا دڵۆپەیە کە کاسەی جۆش و خرۆشمان سەرریژ دەکات...

جا ئەگەر لەم کۆتا خاڵەشدا هەر هێشتا ویژدان نەکەوتبووە جۆش و، مرۆڤ بە تەواوی بوونییەوە ڕووی نەکردبووە پەروەردگاری و، ناڵە و نرکەی پەرۆشیی نەیگرتبوو و، نەیوتبوو: "لە کوێیت میحرابەکەم، لە کوێیت؟" ئەوا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ناتەواوییەك لە ئارادایە.

ئیدی بانگبێژ بە قامەت کردن، دوایەمین گورزی خۆی لە هەموو ئەو شتانە دەوەشێنێ کە مرۆڤ بە غەیری خوای گەورەوە سەرقاڵ دەکەن. ئیدی بەندەش "اللهُ أَكبَر" دەکات و بەم هەستەوە دەچێتە ناو نوێژەوە. ئینجا لە کاتی چوونە ڕکوع و سوجدە بردنیشدا هەر ئەم وتەیە دووبارە دەکاتەوە. بەم شێوەیە، لە هەموو یەکێك لە ڕوکنەکاندا گەورەیی پەروەردگار و بچووکی خۆی ڕادەگەیەنێت و، دەڵێ: "پەروەردگارم، تۆ گەورەیت و منیش بچووك." گەورە بە گەورەیی و مەزنی خۆی و، بچووکیش بە تەواوی هەستی پەرستش و بەندایەتی خۆیەوە دەستەونەزەر لە حوزووریدا دەوەستێ. جا ئیتر نوێژخوێن، ئاوێتە بەم هەست و شعوورەوە دەچێتە بارەگای پەروەردگاری. ئێوە دەتوانن ئەمە بە سەرەنجامی گشتی دیقەت لە نوێژیشدا ناو بەرن.

مرۆڤ لە نوێژدا بە خوای گەورە دەگات.. هەم بە جۆرێك پێی دەگات، ئەو سەلامەی

کە حەزرەتی محمد المصطفی (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە کاتی گەیشتنی بە پەروەردگاری لە میعراجدا کردی، نوێژخوێنیش لە تەحییاتدا ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی حەق تەعالای دەکات و هەمان ئەو سەلامە دووبارە دەکاتەوە.

## سڕینەوەی هەڵەکان

لە فەرموودە پیرۆزەکەدا لە ڕێگەی "یَمْحُو اللّٰه"وە باس لە سڕینەوەی هەڵەکان دەکرێت. لێرەدا وشەی "مَحْو" بە واتای سڕینەوەی شتێکی نووسراو دێت. کەوابێ هەڵە لە شێوەی تۆودا لە سروشتی ئادەمیزاددا هەیە، مرۆڤیش یان گەشە بەم تۆوە دەدات، یان بواری گەشەکردن و سەردەرهێنانی نادات. جا ئیدی بە جێبەجێ کردنی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، خوای باڵادەست ئەم هەڵانەمان دەسڕێتەوە و، ڕای دەماڵێ و، توانا و لێهاتوویی خراپە لە دەروونماندا دەگۆڕێت بە توانا و لێهاتوویی چاکە.

لە ئایەتی ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (الرعد : ٣٩) ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە کراوە. واتای ئایەتەکە ئەمەیە: "خوای گەورە چی بیەوێت دەیسڕێتەوە و لای دەبات، چیشی بوێ جێگیری دەکات و بە نەگۆڕی دەیهێڵێتەوە. سەرچاوەی هەموو کتێبەکانیش لای ئەوە."

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەڵە، وەك توانا و لێهاتوویی، خەسڵەتێکی دانەبڕاوی سروشتی ئادەمیزادە و، تایبەتمەندییەکی گرنگی هەموو مرۆڤێکە... کەواتە بەدڵنیاییەوە سڕینەوە و پاك کردنەوەشی پەیوەندی بە هەموو کەسێکەوە هەیە.

دەشێ هەموو مرۆڤێك هەڵە بکات. تەنانەت لەوانەیە سەرلەبەری ژیانیشی لەنێو لاداندا بەسەر بەرێت. لەگەڵ ئەوەشدا سڕینەوەی ئەم هەڵانە و، تۆمارکردنی پلەی بەرز و باڵا لە جێگەیان، لە هەموو کاتێکدا و بۆ هەموو کەسێك شایانی ڕوودانە. جا یەکێك لە ڕێگاکانی بەهرەمەند بوون بەم بەختەوەرییە، دەستنوێژ گرتنە سەرباری هەموو شتێك، بێ ئاوڕدانەوە لە هیچ ناڕەحەتییەك.. دووەمیان، بە شەوق و تاسەمەندییەکی جددییەوە ڕووکردنە مزگەوتە. پاشان وەك بڵێی مانەوەی دڵە بەهەڵواسراوی بە مزگەوتەوە. بە

دواشیدا، بە مەبەستی نووربەخشانیی بەشەکانی تری ژیانی، دەرچوونە لە مزگەوت بەو نییەتەی کە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە.. سێهەمیشیان چاوەڕێکردنی نوێژە لەدوای نوێژ. جا ئەمانە، هەم هەڵەکان دەسڕنەوە، هەم پلە بە پلەش عرووج بە مرۆڤ دەکەن بەرەو عەرشی کەماڵات.

## ڕیباط

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەو کردەوانەی کە لە سەرەوە باس کران، بە "ڕِباط" ناو دەبات، سێ جاریش ئەم وشەیە دووبارە دەکاتەوە.

"ڕِباط" هەروەك چۆن بە تەوژم و لێشاوی بەرەکەتی ماددی و مەعنەوی دەوترێ، هەر بەو جۆرەش، بە واتای بێداری و هۆشیاری بەرامبەر ئەو خاڵانەی کە هەموو جۆرە بەڵا و موسیبەتێکیان لێوە دێ و، خۆپەیوەست کردن بە ئیشێك یان شتێك و، خۆیەکلا کردنەوەش دێ. ئەوەتا ئەو سەربازەی کە خۆی تەرخان کردووە بۆ ئێشکگرتن لەو خاڵانەدا کە مەترسییان لێوە دێت، بە "مُرابط" ناودەبرێت. کۆی "مُرابط"یش "مُرابطون"ە. تەنانەت سەردەمانێك لەژێر ئەم ناوەدا دەوڵەتێکیش دامەزرا.

قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکدا فەرمانی ئا ئەم "رابِطة"یەمان پێ دەکات و، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾

(آل عمران : ٢٠٠)

"ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئارام بگرن و خۆڕاگری بنوێنن. ساز و ئامادە و بەئاگا بن (بۆ جیهاد)، لە خوا بترسن تا سەرکەوتوو بن."

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە لە گۆشەیەکی ترەوە سەرنجمان بۆ لای "ڕِباط" ڕادەکێشێ و، دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ ﴾ (أنفال : ٦٠)"بەرامبەر (دوژمنان) ئەوەندەی لە تواناتاندایە هێز و ئەسپی دابەستراو بۆ جیهاد ئامادە بکەن." جا لەو ڕووەوە کە "ڕِباط" بە مانای خۆیەکلایی کردنەوە و خۆ

وەقفکردن دێت، ئەوا مرۆڤ بە ڕێکوپێکی دەستنوێژ دەگرێ.. بە وێنەی ڕایەڵە، وەك بلێی ڕێگای نێوان مزگەوت و ماڵ دەچنێ.. دڵی هەر لای مزگەوتە. جا ئەگەر بەم هەستەوە بۆ ماڵ یان بۆ سەر کارەکەی بگەڕێتەوە، ئەوا مانای وایە کە خۆی بۆ خوا یەکلایی کردووەتەوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) بەم دەربڕینەی، دەرگایەکی ڕەگەزدۆزیش دەکاتەوە و، دەفەرموێ: لە بنەڕەتدا "رِباط" بە خۆ تەرخانکردنی ئەو سەربازانە دەوترێت کە سنوورەکانی وڵات لە دژی دوژمن دەپارێزن. ئینجا وەك چۆن ئامادەباشی لە بەرامبەر دوژمندا و، سەنگەرگرتن لەو خاڵانەدا کە مەترسی هاتنی دوژمنی لێوە دەکرێ، بە "رِباط" دادەنرێ، هەر بەو جۆرەش، مرۆڤ لە جەنگێکدایە بەرامبەر بە دوژمنانێك کە ناویان شەیتان و نەفسە.. ئەم جەنگە لە ڕوویەکەوە لەو جیهادە گەورەترە. مرۆڤیش بەجێهێنانی هەردوو جیهادەکەی لە ئەستۆدایە. یەکێك لەمانە، جیهادی بچووك (الجِهادِ الأصغَر)ە، ئەوی تریشیان جیهادی گەورە (الجِهادِ الأكبَر)ە. زۆر جار مرۆڤ لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە و دەستەویەخەبوون لەگەڵ دوژمندا، دەرفەتی ئەوەی نییە کە بیر لە خواستە فریودەرەکانی نەفس بکاتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ئاوەها مرۆڤێك کەمتر ئەگەری ئەوەی هەیە بکەوێتە ژێر باری تەن و جەستەیەوە. چونکە هزری جیهاد سەرتاپای کیانی تەنیوە و بەتەواوەتی سەرقاڵی کردووە. بەڵام هەر ئەوەندەی خۆی خزاندە باوەشی ڕەحەتی و تەمبەڵییەوە، ئیدی ئەگەری زۆرە کە تەمی خولیا خراپەکان گەمارۆی ڕۆحی بدەن. هەر بۆیە ناچارە لە بەرامبەر ئەوانەدا پارێزگاری لە دنیای ڕۆحی بکات. ئەمەش بۆ خۆی جیهادێکە و گرنگترین چەکیشی لەم جیهادەدا نوێژە. جیهاد لە جێی خۆیدا فەرزی کیفایەیە،[1] لە جێی خۆشیدا فەرزی عەین.[2] ئەوەتا لە فەرزییەتیشدا لێکچوونێك هەیە لەنێوان جیهادی ماددی و جیهادی دەروونیدا. لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا

١ فەرزی کیفایە: ئەوەیە ئەگەر کەسێك یان کۆمەڵێك لە موسوڵمانان پێی هەڵسان ئەوا ئەو فەرزە دێتە دی و لە سەر موسوڵمانانی تر لادەچێ وەك: بانگدان و نوێژی مردوو.

٢ فەرزی عەین: ئەو فەرزەیە کە پێویستە هەموو موسوڵمانێکی موکەللەف خۆی پێی هەڵسێت، تا خۆی جێبەجێی نەکات، لەسەری لاناچێ، وەك: نوێژە فەرزەکان و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

(صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) فەرموویەتی: رَجَعْنَا مِنَ الْجِهَادِ الْأَصْغَرِ إِلَى الْجِهَادِ الْأَكْبَرِ "لە جیهادی بچووکەوە بەرەو جیهادی گەورە گەڕاینەوە."[1]

بەڵێ، وابەستەبوونی دڵی مرۆڤ بە مزگەوتەوە، واتا، ئاوێتە بوون لەگەڵ نوێژ، یان - بە تێگەیشتنە نەبەوییەکە - هۆگر بوونی نوێژ بە هەستی شەهوەتەوە و، یەکپارچە بوون بە عاشقی نوێژ، تا ئەوەی وای لێدێت نوێژ ببێتە بینایی چاوی خاوەنەکەی، هاوشان و یەکسان کراوە بە کردەوەی ئەو کەسەی وا لە سەنگەردا خەریکی ئێشکگرتنە.

جا ئەگەر پێویست بکات پوختەیەکی کورتی تێبینییەکانمان سەبارەت بە فەرموودەکە بخەینە ڕوو، ئەوا دەڵێین:

فەرموودەکە باس لە سێ شت دەکات. سێ شتی وا، کە دوانیان زیاتر تایبەتن بە هەڵسوکەوتەوە و ئەوی تریشیان پەیوەندی بە نییەتەوە هەیە. ئیدی ئەم سێ حاڵەتە، لە ڕوانگەی هەست و هزرەوە چواردەورەی مرۆڤ پەرژینرێژ دەکەن و، بەگوێرەی خواستی پەیامی مژدەبەخشی ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ (هود : ١١٤) "بێگومان چاکەکان خراپەکان ڕادەماڵن و دەیانسڕنەوە." لە گوناهەکانی ڕابردووی پاکی دەکەنەوە و، لە بەرامبەر ئەگەری هەڵەکانی داهاتووشیدا، بە عەشقی عیبادەت و پەیوەست بوون بە پەروەردگار و هێزی نییەت، پڕچەکی دەکەن. ئینجا دەینێرنە مەیدانی جەنگ.

**یەکەمیان:** وەختێ هەلومەرجی ئاو، یان کەش و هەوا لەبار نەبێت بۆ دەستنوێژ گرتنێکی ئیسراحەت. واتە لەو حاڵەتانەدا کە ئاویش و هەواش سارد بوون، یان بەهۆی نەبوونییەوە، ئاو ئەوەندە بەنرخ بووە کە نەتوانرێ بۆ دەستنوێژ بەکار بهێنرێت - بێ گومان بەدەر لە حاڵەتی پێویست - گرتنی دەستنوێژێکی تەواو و تێروتەسەل: خلوسێکی زۆر قووڵ و، حیرصێکی جددی بەدەستهێنانی پاداشت و، ئیشتیاقێکی لە ڕادەبەدەری بەندایەتی دەوێت تاوەکو بەجێ بهێنرێت.

جا ئەگەر کەسێك - وەك گوزارشت لە تەواوی ئەم واتا قووڵانە - بتوانێت لە نالەبارترین و سەختترین هەلومەرجدا دەستنوێژ بگرێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دڵی

١ البيهقي، الزهد ١/١٦٥، خطيب البغدادي، تأريخ بغداد ٥٢٣/١٣.

ئەو کەسە ئاوەدانە و، وابەستەی پەروەردگاریەتی. جا خۆ خاڵی هاوبەشیش لێرەدا بریتییە لە "ارتباط". لە دنیایەکی ئاوەها ڕۆشندا، پەڵە ڕەشەکان گەر وەك تەڵەزمیش بچەقن بە ڕۆحدا، بزانن مانەوەیان کاتییە و لادەچن. وێڕای جەخت کردنەوەمان لەسەر کۆمەڵە لایەنێکی تری پەیوەندیدار بە دەستنوێژەوە، هاوشێوەی ئەوەی کە دەستنوێژ دەبێتە مایەی هاوسەنگ کردنی بارگە کارەباییەکانی جەستە و، تا ڕادەیەکی زۆر یاریدەی زاڵبوون دەدات بەسەر بارگرژییە دەروونییەکاندا و، ڕۆژی پێنج جار ڕۆحی مرۆڤ بە هێزی مەعنەوی نوێدەکاتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم باسانە لە چوارچێوەی بابەتەکە دەردەچن، بۆیە ئاماژەیان پێ نادەین.

**دووەمیان:** بە واتایەکی تر میعراج.. لە پێناو گەیشتن بە خوای گەورەدا بەردەوام لە هاتووچۆدا بێت و، ڕێگاکانی مزگەوت لەژێر هەنگاوەکانیدا بسوێنێت. زیندە ڕاگرتنی جەستە و، پاراستنی توانای فیزیکی بەلایەك، شاباڵ گرتنی ڕۆح بەدەم کۆمەڵە کەیف و شادییەکەوە کە لە سنووری ئیدراك دەترازێن، لە نوێژ هەڵکێشانی دڵ بەر لە چوونە ناو نوێژەوە، بارگاوی بوون بە هۆش و دیقەتی پێویست بۆ پەرستشێکی هێندە گرنگ کە بە تەواوی مانا وەستانە لە حوزووری خالقی ئەکواندا. لە هەر ڕەهەندێك لە ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەم ڕێگە درێژەدا کە بە كَثْرَةُ الْخُطَا "زۆری هەنگاوەکان" گوزارشتی لێکراوە، نقوم بوونە لە بیرکردنەوەی جۆراوجۆردا. بەڵێ، نقوم بوون و لەخۆ گۆڕانە.. تا ئەوەی لە نێوەندی ئەم لەخۆ گۆڕانانەدا لێزمەی پەشیمانییەکان خەوشی ڕابردووە ڕەشەکان دەسڕنەوە، ئەوجا یەکپارچە سپی بوون بە سپیاوی کڕووز و ناڵین. لە سایەی ئەمەشدا، ڕابردووی ئەو کەسەی کە چاکی عەزیمەتی گەشتی ئەم هەرێمەی کردووە بەلادا، ڕاسپاردەی وەفای هەڵقوڵاوی نێو گوفتاری ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ﴾ (الفتح : ٢) "سەرەنجام خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووت خۆش دەبێت." دەکرێت و، ئایندەشی ئەمانەتی قەڵای مەحکەمی ﴿وَمَا تَأَخَّرَ﴾ (الفتح : ٢) "گوناهەکانی داهاتووشت.." دەبێت. هەربۆیە لە هەر هەوارێك لە هەوارەکانی ئەم گەشتەدا، چاوەکانی بەدەم يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا وە دەتروکێن و، دڵەکانیش بە مزگێنی يَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ دەکەونە جۆش.

**سێیەمیان:** هەروەك چۆن عاشقێك چاوەڕوانی ساتەوەختی ویصال دەکات، ئاوەها چاوەڕێ کردنی کاتەکانی نوێژ، بەکارهێنانی ئەو دەمە پڕ پیت و بەرەکەتانە بەوێنەی "خشتەی کات"، ڕێکخستنی کار و چالاکییەکانی ژیان بەگوێرەی ئەم خشتەیە، تێگەیشتنێکی خەیاڵ تێپەڕێنی ئەوتۆیە بۆ چەمکی کات، کە مرۆڤ لەم سایەیەدا ئەو بۆشاییانەی کە لە ئاکامی پەرتەوازە کردنی کارەکانی بەسەر چەند کاتێکی دیاریکراودا هاتووەتە کایەوە، تەنها لەم ڕێگەیەوە دەتوانێت پڕیان بکاتەوە. هەروەها لەم ڕێیەوە دەتوانێت ئاسوودەیی و دڵنیایی ناو نوێژ و، نزیکی لە پەروەردگار بگوازێتەوە بۆ دەرەوەی نوێژیش و سەرجەمی سەرقاڵییە دنیاییەکانی ببەستێتەوە بە خوای گەورەوە. تا بەم جۆرە هەموو کردەوەکانی ببن بە عیبادەت. بەم پێیە، وەك زۆرێك لە عیبادەتەکانی تر کە بەهۆی نییەتەوە چوارچێوەی سنووردارێتی خۆیانیان تەی کردووە و بێ سنوورییان بەدەست هێناوە، ئەو نوێژەش کە بە ڕۆحیەتی چاوەڕوانییەوە ئەنجام دەدرێت، هاوشێوەی جیهادی ماددی و مەعنەوی، بە دەستەواژەی "رِباط"، بووەتە ناونیشانی پەیوەندی مرۆڤ بە پەروەردگاریەوە.

شایانی باسە ئەم فەرموودەیەمان بە مەبەستی پیشاندانی بڕگەیەك لە دنیا ڕۆشنەکەی ئیماندار خستە پێش چاو. ئەو دنیایەی کە لە ئاسۆی دەستنوێژدا بەدەر دەکەوێت و، لەگەڵ نوێژدا ئاسماناوی دەبێت. ئیتر ئەم فەرموودەیەش بە وێنەی گشت فەرموودەکانی تری، بە دەربڕینێکی ئەوپەڕی کورت بەڵام قووڵ، بە وشەی تا بڵێی کەم بەڵام گشتگیر، بوو بە کارێزی سازگاری ئەو هەموو واتایە.

بێ ئەوەی درێژەی زیاتری پێ بدەین، دەچینە سەر فەرموودەیەکی تری نوورانیی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ)، ئەمجارەیان فەرموودەیەکی قودسییە.[1]

---

١ فەرموودەی قودسی: ئەو فەرمایشتانەن کە واتاکانیان لای خواوەیە و شێوازی دەربڕینیان لە لایەن پێغەمبەرەوەیە. واتە پێغەمبەر (صَلَّىٱللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لە خواوە ڕیوایەتیان دەکات.

## ١٥. مژدەگەلێکی چاوەڕواننەکراو بۆ بەندە صالحەکان

لەو فەرموودەیەدا کە ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، خوای گەورە دەفەرمویٚ:

أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ وَ لَا أُذُنٌ سَمِعَتْ وَ لَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ

"لە پاشەڕۆژدا شتی وام بۆ بەندە صالحەکانم ئامادە کردووە، نە چاو بینیویەتی، نە گوێچکە بیستوویەتی و نە بە خەیاڵی کەسیشدا هاتووە."[١]

لە فەرموودەکەدا باس لە مژدەیەکی چاوەڕواننەکراو دەکرێت. مرۆڤ لەویٚ خۆی لە بەرامبەر شتانێك، کە هەرگیز چاوەڕێی نەکردوون و، لە ساتەوەختێکدا کە هەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتوون دەبینێتەوە. ڕاستە قورئان باسی هەندیٚ لە نیعمەتەکانی بەهەشتی کردووە، بەڵام ئەمە، تەنها ناو و ناوونیشان و نزیك کردنەوە و ڕوانینگایەکی تێفکرینە. گەر نا، ئەستەمە لە دنیادا پەی بە حەقیقەتەکانیان بەرین.

إبن عباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) لە تەفسیری ئایەتی ﴿وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَـٰبِهًا﴾ (البقرة:٢٥) "شتانێکی هاوشێوەیان پیٚ درا." دەفەرمویٚ ئەو نیعمەتانەی کە ئێوە پێیان ئاشنان، لە بەهەشتدا تەنها ناوەکانیان هەیە.[٢] کاتێك تامیان دەکەن، بەگوێرەی تامەکەی دەتوانن بڵێن کە: ئەم تامە لە فلانە شت دەچێت. بەڵام هەرگیز هەمان ئەو شتە نییە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نیعمەتەکانی بەهەشتیش هەروەك بەهەشت خۆی، بەجۆرێك بەدیهێنراون کە لەگەڵ ئەبەدییەت و نەبڕاوەیی بەهەشتدا بگونجێن. بۆیە ساوێلکەییە لەوێدا بەدوای شووتی و کاڵەك و سێو و هەرمێی دنیادا بگەڕێین...

بەهەشت خانەی سەرسووڕمان و شتە چاوەڕوان نەکراوەکانە. پێشانگایەکی سەر بە دواڕۆژی ئەوتۆیە بەهەشت، هەموو جۆرە نیعمەتێکی تێدا ڕیز کراوە، بە جۆرێك کە تووشی سەرسووڕمانت دەکات و، نیگابردوو و مەست و حەیرانت دەکات و، لەهۆش خۆتت دەبات و وات لیٚ دەکات نەزانی چی بکەیت. جگە لەمە، بینینی خوای

١ بخاري، توحيد ٣٥؛ مسلم، جنة ٢-٥.
٢ طبري، جامع البيان ١/١٧٤.

گەورەش (عَزَّوَجَلَّ) کە هەزاران ساڵ لە ژیانی بەهەشت ناگاتەوە بە تەنها ساتێکی روئیەتی ئەو جەماڵە، هەر لە چاوەڕوان نەکراوییەکانی بەهەشتە. ئەمە بەو واتایە دێت کەئیمانداران کاتێك دەچنە بەهەشتەوە، لەوێدا پەروەردگاریان دەبینن. دەنا خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) پاك و بەرییە لە زەمان و مەکان.. جا با ئەو مەکانە بەهەشت و، ئەو زەمانە زەمانی بەهەشتیش بێت. بەڵێ، بەندە صالحەکان، تەنانەت نیعمەتێکی چاوەڕوان نەکراوی وەك تەماشا کردنی (جَمالُ الله)شیان بۆ ئامادە کراوە.

"صالح" بە واتای ئەو کەسە دێت کە بێ کەموکوڕی و ناتەواوی کار دەکات. هەرچی "صالحات"یشە، ئەو کردەوانەن کە بێ کەموکوڕی و ناتەواوی ئەنجام دراون. زانینی ئەوەش کە ئایا کردەوەیەك چووەتە بازنەی "صالحات"ەوە یان نا، تەنها لە ڕێگەی پێوەرە ئیلاهییەکانەوە دەبێت. واتە ئایا لە نێوەندی پێوەرەکانی پەروەردگاردا نوێژ چۆن دەکرێت؟ ڕۆژوو چۆن دەگیرێت؟ زەکات چۆن دەدرێت؟ جیهاد چۆن بەجێ دەهێنرێت؟ جڵەوی جیهانی ناوەوە چۆن دەگیرێتە دەست؟ ویژدان چۆن پەروەردە دەکرێت؟ ڕۆح چۆن دەخرێتە پەرواز؟ ئیرادە چۆن بەهێز دەکرێت؟ گەشەی هەستەکان چۆن دەبێت؟ جا پێوەری ئیلاهی سەبارەت بەم "چۆن"انە چۆن بێت، بەو شێوەیە نرخ و بەهایان دەدرێتێ و، هەر بەو شێوەیەش هەڵدەسەنگێنرێن. بەم پێیە، هەرکات مرۆڤ هەوڵیدا خۆی بەگوێرەی فەرمایشتەکانی کردگاری ڕێکبخات و، ئاوازی دەنگی بەو جۆرە بوو کە بیگەیەنێتە ڕەزامەندی پەروەردگاری، ئەوا ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی یەکەم هەنگاوی بەرەو "صالحات" ناوە.

بەڵێ، هەروەك چۆن ژەنیارێك بەر لەوەی دەست بکات بە ژەنین، سەرەتا ئامێرەکەی عەیار دەدات، ئێوەش گەر دەتانەوێ ئاوازێك بچڕن کە ببێتە جێی ڕەزامەندی ئەو و خۆشنود بوونی، ئەوا هەر چۆنێك بووە دەبێ خۆتان بە پێی قورئان ساز و عەیار بدەن. تا ئەوەی دەنگتان لە جیهانی ئەودیو بینراوەوە خۆش پەسەند بکرێ. دەنا، هەر سەیریشتان ناکرێ. خوای باڵادەست "سمیع و بصیر"ە، هەموو شتێ دەبینێ و هەموو دەنگێکیش دەبیستێ. بەڵام ئەگەر دەنگتان بەگوێرەی ئەو مەقامە نەبێت، ئەوا گوێتان لێ ناگرێت. ئیدی ئەو کات ئێوەش نەتانتوانیوە دەنگی خۆتان بگەیەنن.

مانایەکی تری صالحات ئەوەیە کە کە مرۆڤ هێندە بە بایەخ و وردەکارییەوە کارەکانی ئەنجام بدات، دڵنیا بێت کە حەق تەعالا چاودێرە بەسەریەوە و ئاگای لێیەتی. کەوایە، پێویستە مرۆڤ هەموو ئەو کارانەی دێنە پێشی، بە وردی و هەستیارییەوە جێبەجێیان بکات. چونکە دیار نییە چ کارێك دەبێتە هۆی ڕزگاربوونی. هەر بۆیە پێغەمبەری نازدار (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەفەرموێ: اِتَّقِ اللهَ وَ لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً "لە خوا بترسە و هیچ چاکەیەك بە کەم مەزانە."[1]

لە لایەکی ترەوە، فەرموودە قودسییەکە باس لە لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ "بۆ بەندە صالحەکانم" دەکات، لەم دەستەواژەیەشەوە ئەوە تێدەگەین کە صالحات ئەوانی لە خوای گەورە نزیك کردووەتەوە و، بوونەتە ئەو خۆشەویستانەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێن. فەرموودەیەکی قودسیی تر، ڕەوشی خۆشەویستانی خوامان بەم جۆرە بۆ باس دەکات:

فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَ بَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَ يَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَ رِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا

"ئیتر هەر ئەوەندەی کە خۆشم ویست، دەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێ و، ئەو چاوەی کە پێی دەبینێ و، ئەو دەستەی کە پێی دەگرێ و، ئەو پێیەی کە پێی دەڕوات."[2]

واتە، بەندە بەهۆی "صالحات"ەوە هێندە نزیکی لە خوای گەورە بەدەست دەهێنێت، تا ئەوەی سەرتاپا بەو ڕەنگە ئیلاهییە ڕەنگین دەبێ. ئیدی دوای ئەمە، هەروەك مردووی ژێر دەستی مردووشۆری لێدێ و، ئەوەی بە ڕاست و چەپدا وەری دەگێڕێ هەر تەنها خوای گەورەیە (عَزَّوَجَلَّ). ئای ئەوە چ "جەبر"ێکی شیرینە کە خواوەند بە بەردەوامی بەندەکەی ئاڕاستەی ڕاستەڕێ بکات! لەوە بەدوا، ڕوو وەرچەرخاندنی وەها مرۆڤێك وەك شوێنەوارێکی لوتفی ئیلاهی، بە هەرحاڵ شتێك نییە شایانی باس بێت. چونکە ئەو گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە بە "بەندەکانم" ناو ببرێت و، چووەتە نێو گرۆی موقەڕڕەبینەوە.. ڕاستییەکەی، کەسێکی لەو جۆرە، هەردەم بە دەم دروشمی "بێرە هانام

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٦٣/٥؛ نسائي، السنن الكبرى ٤٨٦/٥؛ طبراني، المجمع الكبير ٦٣/٧.
٢ بڕوانە: بخاري، رقاق ٣٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٦/٦.

خودایه.. بێ، چون بێ تۆ هەڵناکەم!.."ەوە لە ناڵین و نرکەدایە.

خەریکە بڵێین هەرچی کاری جوان و چاکە هەیە، ئەم دەستی خۆیی پێ دەگەیەنێت و، لە هەرکام لەم کارانەشیدا عەوداڵی دۆزینەوەی هۆکارێکە کە ڕزگاربوونی خۆیی تێدا ببینێتەوە. جا لەبەر ئەوەی نازانێ کام کرداری دەبێتە هۆی ڕزگار بوونی، بۆیە هیچ چاکەیەك لەو چاکانەی دێنە بەردەستی، لە کیسی خۆی نادات. هەموو ئەو کردەوانەی لە دنیادا ئەنجامی داون لە شێوەی بوخچەیەکی سەرسامکەردا ڕەوانەی ئاخیرەت دەکرێ. جا ئەو ڕۆژەی کە دەچێتە بەهەشتەوە، ئەو بوخچانە یەك بە یەك لە بەردەمیدا دەکرێنەوە و ئەو پاداشتە چاوەڕوان نەکراوانەی نێویان بەرجەستە دەکەن کە نە چاو دیویەتی و نە گوێش بیستوویەتی.

بە لەبەرچاو گرتنی ئەو ڕاستییەی کە هەندێ جار ئاودانی سەگێك وای لە مرۆڤ کردووە - واشی لێ دەکات - کە شایانی چوونە بەهەشت بێ و، هەندێ جاری تریش، بێ ئاو هێشتنەوەی پشیلەیەك بووەتە هۆکاری چوونە دۆزەخ و دەشبێت،[1] دەڵێین، بەهەشتیش و ئەو شتانەشی کە لە بەهەشت دەبەخشرێن، سەرتاپا شتانێکی چاوەڕوان نەکراو و سەرسامکەرن.

لە لایەکی ترەوە، مرۆڤ تەنها توانای زانینی ئەو شتانەی هەیە کە بە چاوی دەیانبینێت و، بە گوێی دەیانبیستێت و، لە ئەندێشەیدا دەتوانێت وێنایان بکات. لە کاتێکدا ئێمە دەزانین کە هەروەك چۆن مرۆڤ سنووردارە، ئەم هەستەوەرانەشی ئاوەها سنووردارن. بۆیە دەبێ ئەو ڕاستییە باش بزانین کە ئەم هەستانە تەنها ئیدراکێکی سنوورداریان لێدەکەوێتەوە و، زۆر لەوە کۆتاترن کە کێشانە و پێوانەی نیعمەتەکانی جیهانێکی بێسنووریان لە تواناداا بێ.

دەرکی مەعالی بەم عەقڵە گچکە ناکرێ

ئەم تەرازووە بەرگەی ئەم هەموو بارە ناگرێ

ضیاء پاشا

---

١ بڕوانە: بخاري، مسقط ٩؛ مسلم، سلام ١٥١-١٥٥.

دەکرێ ڕوویەکی تری فەرموودەکە ئەمە بێ: خوای گەورە پاداشتی کردەوە چاکەکان بە چەندان دەداتەوە. ئەوەتا جاری وایە بە دە، جاری واشە بە سەد، یان بە حەوسەد، جاری واش دەبێت بە سەد هەزار یان ملیۆنێك، هەندێ جاری تریش مەگەر هەر خۆی بزانێ بە چەند پاداشتیان دەداتەوە.. هیچ بەندەیەکیش نازانێ کە چۆن پاداشت دەدرێتەوە. جا کاتێك لە ئاخیرەتدا پاداشتی کردەوەکانی لە شێوەی خەلاتێکی چاوەڕواننەکراوی سەروو خەیاڵکراودا دەخرێتە پێش، دۆش دادەمێنێت. ئیتر تەنانەت ئەو شتانەی کە بە خەیاڵیشیدا نەهاتوون، دەبنە ڕاستی.

هەروەك لە بڕگەکانی سەرەوەدا بینیمان، کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەو چەند وشەیە گوزارشتی لەو هەموو حەقیقەتە قووڵە کردووە کە تەنگیان بە دیواری تێگەیشتن و ئیدراکی ئێمە هەڵچنیوە. هەروا بە ڕەوانی بێ خۆئامادەکردنی پێشوەختە فەرموونی. هەر بۆیە بە تەنها ئەو فەرموودەیە بەسە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئەو زاتە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دارای چ فەتانەتێکی بەرزتر لە ئیدراك بووە. نامانەوێ درێژەی زیاتر بە بابەتەکە بدەین. بەڵام لەبەر ئەوەی ناتوانین دەستبەرداری ئەو چێژە لەدونییە ببین کە لە باس کردنی ئەوەوە (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) پەخش دەبێ، بۆیە هەر هیچ نەبێ دەچینە خزمەت چەند فەرموودەیەکی تریش.

## ١٦. بەهەشت بە ناڕەحەتی دەورەدراوە و، دۆزەخیش بە شەهوەت.

لە فەرموودەیەکی تردا کە ئیمامی بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێ: حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ وَ حُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ "بەهەشت بەو شتانە دەورەدراوە کە نەفس حەزیان پێ ناکات، دۆزەخیش بە شەهوەت (واتە ئەو شتانەی کە حەز و ئارەزووە جەستەییەکان دەوروژێنن)..."[١]

دۆزەخ بە شەهوەت پەردەپۆش کراوە و پێچراوی ناو بوخچەی شەهوەتە و بەسەر هەرێمی شەهوەتدا دەڕوانێ. هەرچی بەهەشتیشە بە شتانێ پەردەپۆش کراوە کە لە

١ بخاري، رقاق ٢٨؛ مسلم، جنة ١. (دەقی فەرموودەکە لە موسلیمەوە وەرگیراوە.)

ڕوانگەی ڕوانینی ڕواڵەتبینیی ژێرییەوە ناخۆش و زەحمەتن. ئەو شتانەی کەوا لەسەر ڕێگای بەرەو بەهەشت درێژەوەبوودان، هەرگیز لەو چەشنە شتانە نین کەوا چاوی ئەوانەی لە ماددەدا بە دووی هەموو شتێکدا دەگەڕێن، کەیفیان پێ بێت و بەلایانەوە جوان بێ.

لە ڕاستیدا چ بەهەشت و چ دۆزەخیش بۆ ئێمە نیعمەتن. چونکە ئەوەتا هەردووکیان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە لە دەستخستنی ئیستیقامەتدا، یەکێکیان هاندەر و تاسەبزوێن، ئەوی دیکەشیان ئاگادار کەرەوە و ترس بزوێن. وەختێ مرۆڤ تەماشای سیمای تاسە بزوێنی بەهەشت دەکات، یەکپارچە دەبێتە هەوڵ و، دڵی بۆ ئەوێ دەکەوێتە لێدان. هەر کە ڕوخساری گرژ و مۆنی دۆزەخیش دەبینێ، لەپێناو ئەوەی نەکەوێتە ناوی، دەداتە شەقەی باڵ. ئیتر بەم جۆرە هەردووکیان بۆمان دەبن بە ڕەحمەت.

بەڵام خوای باڵادەست هەم بەهەشت و هەم دۆزەخیشی هەریەك لە بوخچەیەك ناوە و، بەم شێوەیە پێشکەشی بازاڕی کردەوەی مرۆڤەکانی فەرمووە. ئیتر مرۆڤیش بەو ئیرادەیەی کە پێی بەخشراوە، سەرپشکی هەڵبژاردنی یەکێکە لەمانە. بە ئەندازەی ئیرادەکەی، هەرکەس بیەوێ، دەبێ بە "سَعید - بەختەوەر" و داخوازی بەهەشت دەبێ، ئەوەشی بیەوێ، دەبێ بە "شَقي - بەدبەخت" و ڕێی دۆزەخ دەگرێتە بەر.

بەڵێ، چواردەورەی دۆزەخ بە بەرگێك لە شەهوەت دەورەدراوە و کەشێکی لەو جۆرە تەنیویەتی. ئەم بەرگەش لە دەرەوە زۆر سەرنجڕاکێش دیارە. هەرچی هەیە لە خواردن، خواردنەوە، خەوتن، پڕ پیاکردنی هەموو ئەو شتانەی نەفس حەزی لێیەتی و تێر بوون لە ڕووی جەستەییەوە، ئەو شتانەی کە بە دەم ئارەزووەکانی مرۆڤەوە دێن، هەر هەمووی بە وێنەی تانوپۆ دەورەی دۆزەخیان تەنیوە. بە کورتییەکەی، ڕێی دۆزەخ مۆزایکێکی شەهوەتە و ختووکەی جیسمانییەتی مرۆڤ دەدات.

بەهەشتیش سەدەفێکە دەورەدراوە بە ناخۆشی. دەستنوێژ گرتن، نوێژ کردن، چوون بۆ حەج، زەکات دان، جیهاد و تێکۆشان، بەرگە گرتنی ناڕەحەتی لە پێناوی خوادا، جار نا جار ڕووبەڕووبوونەوەی مامەڵەی کۆیلە لەنێو کۆمەڵگەدا، بێبەش کردن لە هەموو مافێکی مرۆڤانە، ڕاپێچی ئەم زیندان بۆ ئەو زیندان، لێدان خواردن تەنها لەبەر ئەوەی

وتووتە: "پەروەردگارم اللە"یە، شار بەدەرکردن و بە هیچ دانان و چەندین شتی تر کە بەگوێرەی ڕواڵەتبینیی ژیری بە ناخۆش دەبینرێن. بەڵێ، بەهەشتیش بەمانە دەورەدراوە و بەرگێکی لەم جۆرە چواردەوری تەنیوە. ئەوانەی لە دەرەوە دەڕوانن، هەمیشە دەناڵێنە ئەم پەردانە و لەوێدا گیر دەخۆن. گەر بە پەردە بێت، ئەوا دۆزەخ دەروون تاوسێن و بەهەشتیش ترسێن. لەبەر ئەمەیە کە زۆربەی خەڵکی تەماشای دیوی دەرەوەیان کردووە و هەڵخەڵەتاون، هەر بۆیە دۆزەخ داخوازی زۆرە و، بەهەشتیش تا بڵێی کەم..

زۆرێك لە مرۆڤەکان کەوتوونەتە شوێن مامەڵەی بچووك بچووك. ئەو کەسەی دەڵێ "نوێژ شتێکی باشە بەڵام ڕۆژی پێنج جار بەلامەوە زەحمەتە." کەسێکە نەیتوانیوە باز بدات بەسەر ئەو نەختە زەحمەتەی لە نوێژدایە. ئەوەتا زەحمەتی دەستنوێژ لە زستاندا، کەسانێکی لە ڕێگادا جێهێشتووە. کەچی هەروەك لە فەرموودەکەی پێشووتردا بینیمان، ئەو کەسەی بەرگەی ئەو زەحمەتە کەمە دەگرێت کە لە دەستنوێژدا هەیە، دەستنوێژ دەستی دەگرێت و هەنگاو بە هەنگاو لە بەهەشت نزیکی دەکاتەوە. دەکرێ هەمان شتیش سەبارەت بە ڕۆژوو و زەکات و حەج و جیهادیش بوترێ. چەندین کەس کەوا عەقڵیان ڕێگرە لەوەی عاقڵانە ڕەفتار بکەن، تواناییان نییە بەسەر ئەم ئاستەنگ و هەوراز و نشێوییە بچووکانەدا باز بدەن و، ئەو ناڕەحەتی و ناخۆشییانەی بە چواردەوری بەهەشتدا دەیبینن، بوونەتە ڕێگر لە چوونە بەهەشتیان.

دۆزەخیش جادووگەرێکە، هەوەس و ئارەزووە سادەکانی بۆ خۆی کردووە بە تەڵە. ئەوەتا زۆرێك لە خەڵکی بێئاگا لەوەی کە پاش کەمێکی تر لەسەر ژیانیان دەکەوێت، وەکو باڵەفڕکە کردنی مێش بەرەو هەنگوین، بەرەو ئەم ژەهرە ڕادەکەن. بەڵێ، شەهوەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە هەنگوینێکی ژەهراوییە، یان دەتوانین ئەم مرۆڤانە بەو پەپولانە بچوێنین کە بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو ئاگرەی کە دەیانسووتێنێت و لەناویان دەبات. ئەمانیش بێ عەقڵانە بەرەو ئەو شەهوەتانە دەڕۆن کە دەوری دۆزەخیان داوە، تا لە کۆتاییدا خۆیان لەنێو دۆزەخدا دەبیننەوە. جا لەبەرئەوەی عەقڵیان بەتەواوی پشتی پەردە نابڕێت، بۆیە ئەو شتانەی پەردەداری دۆزەخن، ئارەزووە جەستەییەکانیان دەوروژێنن و بەرەو خۆیان ڕایان دەکێشن.[1]

---

[1] پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەم بابەتەمان بەم نموونەیە بۆ ڕوون دەکاتەوە: إِنَّمَا مَثَلِي وَ مَثَلُ أُمَّتِي

ئەوانەش کەوا لەسەر ڕێی ژیان ئەو زاتەیان ناسیوە کە لە دووڕیانی ڕێگەکاندا وەستاوە و، بەگوێرەی ئەو پەیامەی لەوەوە وەریان گرتووە، ڕێ و ئاڕاستەی خۆیان دیاری کردووە و، دڵیان بە ڕووی حەقیقەتدا هۆشیار بووەتەوە، لە دیوی ناوەوەی ئەو ناخۆشیانە تێگەیشتوون کەوا ئەملا و ئەولای ڕێی بەهەشتیان گرتووە و، بەهیچ جۆرێك پێی هەڵناخەڵەتێن. چونکە ئەو بەهەشتەی کە لە شێوەی تۆوێکدا لە ویژدانیاندا چێنراوە، هەموو ئان و ساتێك لە گەشەسەندندایە و بەردەوام بۆن و بەرامەکەشی دنیای ڕۆحیان دەپێچێت. لە کاتێکدا خەڵکی لە دەرەوە بەدوای بەهەشتدا دەگەڕێن، کەچی ئەمانە هەر لە دنیاشدا لە سایەی ئەو بەهەشتەی لە ناخیاندا دۆزیویانەتەوە، هەر دەڵێی خەریکی کەیف و شادی گێڕانن. ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەوانەی لە بەهەشتە ماددییەکەی دنیادا دەژین، بە درێژایی هەموو ژیانیشیان هێشتا هەر ناتوانن بگەنەوە بە خولەکێکی ئەو بەهەشتەی کە وا ئەوان لە ویژدانی خۆیاندا تێیدا دەژین. ئیمان ناوکێکە بەهەشتی لە خۆیدا هەڵگرتووە، کوفریش تۆوێکی ترە دۆزەخی لە خۆیدا هەڵگرتووە. لە دواڕۆژدا ئەمانە گەشە دەکەن و لق و پۆپ دەردەکەن و دەگۆڕێن بۆ بەهەشت و دۆزەخێکی ڕاستەقینە. کەوابێ ئیماندار تەنانەت لە دنیاشدا لە ژیانی بەهەشتدا دەژی، هەرچەندە بە ڕواڵەت ژیانیشی ناخۆش ببینرێ.

ئەو ڕۆحانەی کە بە ئیشتیاقی گەیشتن بە بەهەشت باڵەفڕکەیانە، لەم ڕێیەدا، کە هەر مەنزڵێکی بەختەوەرییەکە بۆ خۆی، زۆر جار سەرباری ڕۆح، شان دەدەنە بەر ئەو شتانەی بە لای نەفسەوە گرانن. بە وێنەی ئەو ئەزیەتەی کە پەرستشە جەستەییەکانی وەك دەستنوێژ و نوێژ و ڕۆژوو بەدوای خۆیاندا دەیهێنن، یان ئەو ئەرکە قورسانەی کە زەکات و سەدەقە و فەریزە ماڵییەکانی تر دەیخەنە سەر شانی مرۆڤ، ئەمە جگە لەو بەرپرسیارێتیە ماڵی و گیانییەی کە لە شتانێکی وەك حەج و جیهاددا بەرگەیان دەگرێ. بەڵام وەرە ببینە وا ئەم بەرپرسیارییەتیانە ئەم ڕێگەیەیان بۆ هەندێك هێندە زەحمەت

---

كَمَثَلِ رَجُلٍ اِسْتَوْقَدَ نَاراً فَجَعَلَتِ الدَّوَابُّ وَ الْفَرَاشُ يَقَعْنَ فِيهَا فَأَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ وَ أَنْتُمْ تَقَحَّمُونَ فِيهِ
"نموونەی من و نەتەوەکەم وەك نموونەی پیاوێکە کە ئاگرێکی کردبێتەوە، ئاژەڵان و پەروانەکانیش دەکەونە ناوی. من دامێنتان دەگرم، بەڵام ئێوە خۆتان فڕێ دەدەنە ناوی." (بخاري، رقاق ٢٦؛ مسلم فضائل ١٧-١٩. دەقی فەرموودەکە لە موسلیمەوە وەرگیراوە.)

کردووه کە نەتوانن پێیدا بڕۆن.. هی وا هەیە، لەم ڕێیەدا ئیرادەی لە نوێژ و دەستنوێژ دەگیرێ و پەکی دەکەوێت، تیایەتی برسێتی و تینوێتی لێ دەبێتە هەورازێك و ناتوانێت بیبڕێت، هی واش هەیە دەکەوێتە داوی شەیدایی گیان و ماڵی، تیاشیایەتی بەجارێ پێی لە چەند دانەیەك لەمانە دەخلیسکێ و، ناتوانێت بگاتە ئەو بەهەشتەی کەوا چوار هەنگاو لەولاترەوە بە هەموو جوانی و ئارایشتی خۆیەوە چاوەڕێی دەکات.

بەڵێ، ئەگەر بەهەشت ئەو مەملەکەتە ڕەنگاوڕەنگەی خەونەکان بێت کە هەرچی تەسەووڕێکی خۆشبەختی هەیە تێیپەڕاندووە و، ئەو دنیا لوتکەیە بێت کە - هەروەك لە سەریشەوە ئاماژەمان بە هەندێکیان دا - بە سەدەها ئەرك و بەرپرسیارێتی لە سەرەکەی تریدایە و بە دنیایەك بەربەست و نشێوی دەورەدراوە، کە هەرواشە، ئەوا لە بەرامبەریدا دۆزەخ، کەندەڵانێکی تۆقێنەری فەلاکەت زادەی ئەوتۆیە کە بە بارێك لەو ویست و حەز و شەهوەتانەوە کە نەفسی مرۆڤ دەوروژێنن و، تاو بە بڵێسەی ئارەزووە جەستەییەکانی دەدەن، لەسەر ڕێگەی ڕێبوارانی گەشتی هەتا هەتایی وەستاوە و ڕێی پێ گرتوون و، هەرچی حەز و ئارەزوو و شەهوەتی جیسمانی هەیە، هێناویەتیە کەف و کوڵ و خستوونیەتە هەڵچوون، هەر بەوەشەوە نەوەستاوە، بەڵکو هەموو کات، ڕوانینی سەرنجی ڕۆحە لاوازەکانی لەسەر خۆی کۆ کردووەتەوە و، بە وێنەی کونە ڕەشەکان (الثُقوب السَوداء) هەر شتێ بەلایدا بڕوات بە چەقەهێزە کوشندە سامناکەکەی خۆی لووشی دەدات و لە خۆیدا دەیتوێنێتەوە.

ئای چەندە زۆرن ئەوانەی بە تەماشا کردنی پەردەی ڕازاوە و بریق و باقی دۆزەخ فریویان خوارد و خۆیان ڕادەستی ئەو شیوە ترسناکە کرد، بە سەیر کردنی ڕووکەشی پەردەی بەهەشتیش مانەوە و، لەو خانەی بەختەوەرییە هەمیشەییە و، لەو جیهانە پڕ ناوازەیی و پێشبینی نەکراوە سڵەمینەوە و خۆیان بێ بەش کرد لێی!..

بەڵێ، حەقیقەتی مەسەلەکە ئەمەیە کەوا ڕێی تێناچێت کەسێك بەهەشتی بیستبێ و زانیاری لەسەر هەبێ، تاسە و ئیشتیاقی بۆی نەجووڵێ. هەروەك چۆن ڕێی تێناچێت کەسێك دۆزەخی بیستبێ و لێی دوور نەکەوێتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە لەبەر نهێنی تەکلیف و ئیمان بە غەیب و ڕاستی تاقیکردنەوەی دنیا، بەهەشت بە پەچەیەك لە

ناخۆشی و، دۆزەخیش بە فوستانێك لە شەهوەت داپۆشراوە و بەم شێوەیە هاتوونەتە بەردەم مرۆڤ.

ئێستاش وەرەو بڕوانە هێز و ئەفسوون و ناوەڕۆکی گوفتاری پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ)، کە چۆن دوو ڕێگای دوور و درێژی مەزن و ترسناك، بە هەموو بەختەوەری و مەترسییەکیانەوە دەبات و دەیانبەستێتەوە بە دوو دەرەنجامی بڕاوەی دڵخۆشکەر یان تۆقێنەر، هەم - وەك هەموو کارێکی تری - بە ڕەچاو کردنی بنەمای "أَعْظَم تَصَرف" و بەکار هێنانی چوار پێنج وشە بۆ باس کردنی بابەتێکی مەزنی وەك ئەم بابەتە!

جێی خۆیەتی لێرەدا - لە نێو دوو کەوانەدا - ئەوە بڵێم کە بە ڕەچاو کردنی چوارچێوەی گشتی بابەتەکە، لێرەدا ویستمان تەنها بە ئاماژەدان بەو ڕووەی کە ئەم فەرمایشتە پیرۆزانەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) چەند گەوهەرە پەیڤێکن، دەست لە بابەتەکە هەڵبگرین. گەرنا، ئەم فەرموودەیە و فەرموودەکانی هاوشێوەی، لە ڕوانگەی ڕەوانبێژی و زمانەوانییەوە دەرگای چەندین واتای ناسك و ئاماژەی ڕەوانی تریان بۆ خستووینەتە سەر پشت..! خۆ گەر بهاتبایەو لەم ڕووەشەوە فەرموودەکانی پێغەمبەر (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) شی بکرانایەتەوە، کێ دەزانێ شاهێدی چەند چەپکەمانای تر دەبووین. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە بابەتێکی تەواو جیاواز و سەربەخۆیە، بۆیە ئێستا ئەو دەرگایە ناکەینەوە.

## ١٧. سێ ماف: مافی خوا، مافی دەوڵەت، مافی دین

ئیمامی تیرمیذی فەرموودەیەکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوە:

أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ وَ السَّمْعِ وَ الطَّاعَةِ وَ إِنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ، وَ إِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافاً كَثِيراً فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَ سُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ. وَ إِيَّاكُمْ وَ مُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ

"ئامۆژگاریتان دەکەم بە تەقوا و لە خوا ترسان.. وە بە ملکەچی و گوێڕایەڵی

تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی ڕەشیشتان بەسەرەوە بێ. هەرکێ لە ئێوە تەمەنی درێژ بێ، لە ئایندەدا ناکۆکییەکی زۆر دەبینێت. ئێوە ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدییەکان بگرنە بەر و، وەك ئەوەی بە ددانە خڕێکانتان بیگرن، ئاوەها بە توند و تۆڵی دەستی پێوە بگرن. خۆشتان لە بیدعە بپارێزن، بێگومان هەموو بیدعەیەك گومڕاییە."[1]

لێرەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللّٰهُعَلَيۡهِوَسَلَّمۡ) باس لە سێ ماف دەکات. یەکەمیان تەقوایە، کە ئەمەیان مافی خوایە (عَزَّوَجَلَّ). دووەمیان گوێڕایەڵی و ملکەچییە، کە ئەمەشیان مافی کاربەدەست و کارگێڕانی دەوڵەتە. سێیەمیشیان بریتییە لە دەست گرتنی تەواوەتی بە سوننەتەوە کە ئەمەشیان مافی دینە.

تەقوا وشەیەکە لە چاوگی "وقاية"وە هاتووە. بۆیە لە ڕوویەکەوە بریتییە لە چوونە ناو شووړای پاراستنی کردگاری باڵادەستەوە، ئەمەش لە ڕێگەی ڕەچاو کردنی بنەماکانی شەریعەتی فیتری (ڕێسا سروشتییەکان)ەوە، کەواتە تەقوا بە مانای پارێزراوی دێ لە بەرامبەر ڕێساکانی شەریعەتی فیتریدا.[2]

ئەو سەرۆکەی هەڵتان بژاردووە، واتە ئەو کەسەی بە هەڵبژاردنی خۆتان کردووتانە بە سەرۆکی خۆتان، ئەگەر کۆیلەیەکی قژلوولی ڕەش پێستیش بوو، مەرجە گوێڕایەڵی بکەن و گوێی بۆ بگرن. ئەمە دیموکراسیەتێکی سەروو دیموکراسیەتە. دیموکراسیەتێك، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، مرۆڤایەتی نەیتوانیوە بیگاتێ و، واش بڕوا تا ماوەیەکی درێژخایەنی تر پێی ناگات. کەچی ئەوەتا چواردە سەدەی ڕەبەق بەر لەوە بەو جۆرە باسی لێوەکراوە. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە دروست نییە ناوی دیموکراسی بەسەر ئەو کۆڕێسا و سیستەمەدا ببڕین کە لەسەر دەستی پێغەمبەرێك پێشکەشی مرۆڤایەتی کراوە. چونکە

١ ترمذي، علم ١٦؛ أبو داود، سنة ٥؛ بيهقي، السنن الكبرى ١٠/١١٤.

٢ شەریعەتی خوای گەورە دوو شەریعەتە. یەکێکیان ئەو شەرعە زانراوەیە کە لە سیفەتی "کەلام"ی خوای گەورەوە هاتووە و کردار و ڕەفتار و بارودۆخی ئەم مرۆڤە ڕێکدەخات، کە خۆی لە خۆیدا جیهانێکی بچووکە. ئەوی تریان ئەو شەریعەتە فیتریە هەرە مەزنەیە کە لە سیفەتی "ئیرادە"ی خوای گەورەوە هاتووە و جموجووڵەکانی ئەم جیهانە ڕێکدەخات، کە خۆی لە خۆیدا مرۆڤێکی یەکجار گەورەیە و، هەندێ جار - بە هەڵە - ناوی "سروشت"ی لێ دەنرێت (بڕوانە: بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی، مەکتووبات ٨٨٢، وەرگێڕانی فاروق ڕەسوول یەحیا.)

تا ئێستا هیچ چەمکێکی دیموکراسی لە دنیادا نەگەیشتووەتە ئەم ئاسۆیە. تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە وەك پێشکەوتووترین و شارستانیترین وڵاتی دنیا دەبینرێن، هێشتا تێگەیشتن و هزرێکی لەم جۆرە جێگیر نەبووە. تا ئێستاش چەندین وڵات هەیە کە ڕەش پێست بە مرۆڤ لەقەڵەم نادەن. ئەمە لە کاتێکدا کە ئیسلام بەر لە چەندین چەرخ باس لەوە دەکات کە ئەگەر خەڵکی بە ویستی خۆیان کەسێکی وایان کردە سەرکردەیان، ئەوا پێویستە گوێڕایەڵیشی بکەن. لە لایەکی ترەوە، فەرموودەکە سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئەوەی کە ڕێگەی خەلافەت بە ڕووی هەموو کەسێکدا کراوەیە. ئەگەر خەڵك ئارەزووی لێ بوو و ویستی، ئەوا دەتوانن ڕەش پێستێکیش بکەن بە سەرۆك. کاتێکیش ئەو کەسە بوو بە سەرۆك، هەمووان ناچارن کە گوێڕایەڵی بکەن. بۆیە گرنگ نییە کێ هەڵبژێرراوە، گرنگ ئەوەیە زۆرینە کێی هەڵبژاردووە.

بە نازڵبوونی ئایەتی ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ﴾ (المائدة : ٣) "وا ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو کامڵ کرد." دین تەواو کامڵ بوو. ئیدی شتێك نەماوە کە بوترێت و، هیچ شتێکی تازە ناخرێتە ناو دینەوە. چونکە هاتنە ناوەوەی هەر بیدعەیەك، کوشتن و لەناوبردنی سوننەتێکە. بۆیە پێویست دەکات تا هێزمان تێدایە باوەش بکەین سوننەتی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمۡ) و خەلیفە ڕاشیدییەکانیدا. ئەم باوەش پیاکردنەش بە دەست نا، بەڵکو بە ددانەکان دەبێ. سوننەتی ئەو باڵندەی بەختە، ئەگەر بڕیاربێ شتێ ڕاوبکرێ، ئەوا پێویستە ئەو ڕاوبکرێت و بەدەست بهێنرێت. ئەمە جگە لەوەی کە سوننەتەکانی پێغەمبەر (عَلَيۡهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) بە دەم باس دەکرێن بۆ کەسانی تر. هەروەها ددان لەو کەسانە جیڕ دەکرێتەوە کە زماندرێژی لە ئاست سوننەتدا دەکەن و، بواریان پێ نادرێت کە هەروا بێشەرمانە دەربارەی سوننەت قسە بکەن...

ئەو لایەنانەی لێرەدا بە نیوەناچڵی هەوڵماندا باسیان بکەین، گەر ڕاستەوخۆ لەو سوڵتانی گوفتارە (عَلَيۡهِالصَّلَاةُوَالسَّلَام) خۆیەوە بمانبیستبا و توانای تێگەیشتنمان هەبووایە، کێ دەزانێ چ دەوڵەمەندییەك دەڕژایە دنیای خەیاڵمانەوە. هەر خونچەیەکی دەم پشکوتووی نێو گوڵستانی فەرموودەکانی ئەو، واتاگەلێکی تەواو جیاوازیان بە گوێدا دەچرپاندین. جا ئەو کات ئێمەش دوابەدوای فەرمایشتەکەی تەصدیقمان دەکرد و،

دەمانوت: فَصَدَقَ رَسُولُ اللهِ "پێغەمبەری خوا ڕاستی فەرموو..." وە دەشیڵێین.

ئاخر چۆن وا نەڵێین، لە کاتێکدا کە ئەگەر گوفتارەکانی هەنگاوێك زیاتر بنێن، بەرەو ئاسمانی ئیعجازی قورئان بەرز دەبنەوە.

## ١٨. دووجار گەستران لە یەک کونەوە

لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی بوخاری و موسلیم پێکەوە دەیگێڕنەوە، پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەفەرموێ: لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ "ئیماندار دووجار لە هەمان کونەوە ناگەسترێ و پێوەی نادرێ."[1]

بڕیار نییە شتێکی ئەوتۆ لەسەر ئەم فەرموودەیە بڵێین کە پەیوەندییەکی زۆری بە سیاسەتمەدارانی داهاتووەوە هەیە، بەڵکو تەنها لە شێوەی ئاماژەیەکدا بەم چەند دێڕەی خوارەوە واز دێنین.

ئەو ڕۆحە ڕۆشنانەی لە ئایندەدا بە ڕووی کلتوور و فەرهەنگی خۆیاندا هۆشیار دەبنەوە و، هەر لە دنیاکەی خۆیاندا بە شوێن دنیای خۆیاندا دەگەڕێن.. سوپای ڕووناکی.. پێویستە جار لەدوای جار هەڵوێستە لەسەر ئەم فەرموودەیە بکەن و، بیری لێ بکەنەوە و، هەموو سیاسەتێکی ناوخۆیی و دەرەکییان لەسەر بناغەی ئەو پەند و وانانە بنیات بنێن کە لەم فەرموودەیەوە فێر بوون. ئیدی ئەو کات دەتوانین بڵێین کە ڕێگەیەکی گرنگیان بەرەو سەرکەوتن دۆزیوەتەوە. دەنا، هیچ کات سەکۆی سیاسەت هەڵخەڵەتان و هەڵخەڵەتاندنی لێ نابڕێ و، ئوممەتەکەشمان بەردەوام هەڵخەڵەتێنراو و هەڵخەڵەتاو دەبێت.

١ بخاري، الأدب ٨٣؛ مسلم، الزهد ٦٣.

## ١٩. مرۆڤەکان وەک کانزان

پەروەردەکارانی داهاتووش پێویستە توێژینەوەی جددی لەسەر ئەم فەرموودەیە بکەن کە ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە:

اَلنَّاسُ مَعَادِنُ كَمَعَادِنِ الْفِضَّةِ وَ الذَّهَبِ خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا

"مرۆڤەکان هەروەك کانزاکانی زێڕ و زیو وەهان. ئەوانەیان کە لە سەردەمی نەفامیدا چاك بوون، کاتێك دێنە ناو ئیسلامەوە و، تێیدا قووڵ دەبنەوە (و هەرسی دەکەن)، دیسانەوە چاکترین دەبن."[١]

وەك بڵێی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بەم گوفتارەی سەرجەم پەروەرشیار و دەروونناسەکان لە بەردەم خۆیدا دادەنیشێنێت و، ئەم وانەیەیان فێر دەکات:

ناسینی کەسایەتی و سروشتی کەسەکان لە پرۆسەی پەروەردەدا زۆر گرنگە. ئەوەتا هێڵەکانی ڕوخساری مرۆڤ، ڕۆحی ئەو کەسە دەدەن بەدەستەوە. کەوابوو پێویستە بەر لە هەموو شتێك لە جیهانی ڕۆحی مرۆڤەکان تێبگەین، دواتر هەر مرۆڤەو بەگوێرەی ئەو بۆتەیەی کە دەتوانرێ تیایدا بتوێنرێتەوە، بخرێتە ناوی و بتوێنرێتەوە. پەروەردەش لە ڕوویەکەوە شکڵ و شێوە بەخشینە بەو تواوەوەیە. پرۆسەیەکی لەم جۆرەی شکڵ و شێوە پێ بەخشینیش تەنها کاتێك دەبێت کە ئەو مرۆڤە لە بۆتەیەکی دیاریکراودا توێنرابێتەوە.

ئەو پەروەردەیەی کە بەبێ زانیاری و هەروا بە هەڕەمەکی دەکرێت، نەك هەر هیچ کەڵك و سوودێکی نابێ، بەڵکو لەوانەیە ڕێخۆشکەریش بێ بۆ زنجیرە زیانێکی گەورە. بۆیە خوای تەبارەك وە تەعالا ڕوو دەکاتە ئەو زاتەی کە ڕابەری ئەم کارەیە، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ﴾ (يوسف: ١٠٨) "پێیان بڵێ کە: ئەمە ڕێبازی منە؛ منیش و شوێنکەوتووانیشم لەسەر بەسیرەت بانگهێشتی خەڵکی دەکەین بۆ لای خوای گەورە."

---

١ بخاري، مناقب ١؛ مسلم، البر ١٦٠.

بەڵێ، بانگەوازکردن بۆ هەر پەیام و هزرێك دەبێ لەسەر بنەمای بەسیرەت بێ. بەسیرەت، واتە بزانیت چی دەکەیت، بانگەوازی کێ و بۆ چ شتێك و بە چ ئەندازەیەك. ئەنجامدانی هەموو ئەمانەش بە هەست و شعوورێکی دیاریکراوەوە.

کەوایە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە بانگەوازەکەیدا ڕێگای شعووری بۆ خۆی هەڵبژاردووە و، ئامۆژگاری ئوممەتەکەشی دەکات بۆ سەر هەمان ڕێ. جا خۆ لە ڕاستیدا ڕاستەوخۆ خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) خۆی فەرمانی پەیڕەوی کردنی ئەم ڕێگایە دەکات.

کێ و بە چەند پلەیەکی گەرمی دەتوێتەوە و خودی خۆی دەدۆزێتەوە.. کێ و لە چ بۆتەیەکدا ئیشی لەسەر دەکرێ.. کێ و لە کوێدا دەخرێتە ناو کەمۆڵەوە، ڕایەڵەی ڕستنەکە بۆ کامەیان چۆن دێت و چۆن دەڕوات، هەموو ئەمانە شتانێکن کە تەنها لە ڕێگەی بەسیرەتەوە دەتوانرێ هەستیان پێ بکرێت و بزانرێن.

ئەو کەسانەی لە سەردەمی جاهیلیدا و لەنێو مرۆڤەکانی ئەو ڕۆژگارەشدا خاوەن شعوور و، دارای بەصیرەت و حەقیقەت پەرست و بە ویژدان بوون، لە پاش چاو کرانەوەشیان بە ڕووی حەق و حەقیقەتدا و، تێگەیشتنیان لە ئیسلام و لە تێگەیشتنیشدا گەیشتنیان بە حەقیقەت، دیسانەوە لە چاکترینەکان بوون. ئاخر چونکە ئاڵتوون لە پاش تێپەڕبوونیشی بە بۆتەی توانەوەدا هەر بە ئاڵتوونی دەمێنێتەوە. زیو و مسیش هەر بە زیو و مسی و، هەرگیز ناگۆڕێن بۆ کانزایەکی تر. واتە ئەوانەی لە سەردەمی جاهیلیدا کانزاکەیان ئاڵتوون بووبێ، کاتێکیش دێنە ناو ئیسلامەوە هەروا بە ئاڵتوونی دەمێننەوە. بەڵام بە مەرجێك، ئەو مەرجەش دەستەواژەی إِذَا فَقُهُوا بۆمان ڕوون دەکاتەوە. بەڵێ، بەو مەرجەی لە دیندا ببن بە فەقیهـ و شارەزا و، قووڵ ببنەوە تیایدا...

بێگومان بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن بگەن بەم ئاستە، پێویست بە بوونی فێرکار و، مورشیدێك بگرە لە ڕوویەکەوە، پێویست بە بوونی کیمیاگەرێك دەکات تاکو بیانگرێتە دەست و لە بۆتەدا بیانتوێنێتەوە. بەڵێ، فووکردنی ئیسلام بە ویژدانیاندا ، تەنها بەم شێوەیە دەبێ و، ئەوانیش تەنها بەم شێوەیە دەگەن بە فیقهـ.

## ٢٠. ستەم بێ سزا نامێنێتەوە

یەکێکی تر لەو فەرمووده پیرۆزانەی کە ناکرێ ئاماژەی پێ نەدەین، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) کە دەفەرموێ:

إِنَّ اللهَ عَزَّ وَ جَلَّ لِيُمْلِي لِلظَّالِمِ فَإِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ ثُمَّ قَرَأَ: وَ كَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَ هِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ

"خوای گەورە مۆڵەت دەدا بە ستەمکار، بەڵام هەر ئەوەندەی گرتی، ئیتر ڕزگاری نابێ. دواتر پێغەمبەری خوا بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە بەردەوامیی دا بە وتەکانی: 'جا ئیتر تۆڵە و گرتنی پەروەردگار بەم جۆرەیە. ئا بەم جۆرە تۆڵە لە خەڵکی زاڵم و ستەمکار دەکاتەوە و دەیانگرێت. بەڕاستی گرتنی ئەو زۆر توند و بە ئازارە.' (هود : ١٠٢)"[١]

خوای گەورە مۆڵەت لەسەر مۆڵەت دەدات بە ستەمکار. هەمیشە دەرفەت دەدات بەوانەی کە لە بەرامبەریدا بێگوێیی دەکەن و سنگ دەردەپەڕێنن. بەڵام هەر ئەوەندەی جارێك گرتنی، ئیتر ڕزگار بوونیان بۆ نییە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کردەوەکانیان کاری لە "غِيرةُ الله" کردووە و، وەك ئەو دوا دڵۆپەی لێهاتووە کە پەرداخ سەر ڕێژ دەکات.

پەروەردگاری مەزن کۆمەڵە ڕێسایەکی کارڕایی هەیە لە گەردووندا. ئەم ڕێسایانە هەرگیز گۆڕانیان بە سەردا نایەت. ئایەتی: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ (الروم : ٣٠) ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە "هیچ گۆڕانکارییەك لە بەدیهێنانی خوای گەورەدا نابێت و ناکرێت." یەکێکیش لەو یاسایانە بریتییە لەوەی کە ستەمکار دەبێت بە شمشێری خوا. پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) ئەم حاڵەتەمان بۆ باس دەکات و، دەفەرموێ: اَلظَّالِمُ عَدْلُ اللهِ فِي الْأَرضِ يَنْتَقِمُ بِهِ ثُمَّ يَنْتَقِمُ مِنْهُ "ستەمکار، دادپەروەریی خوای گەورەیە لەسەر زەویدا، تۆڵەی پێدەکاتەوە، پاشان تۆڵەی لێدەکاتەوە."[٢]

ستەمکار شمشێری خوایە و ئەوانەی پێ تەمێ دەکات کە سنووری خۆیان نازانن. لە دواییشدا تۆڵەیەکی وا لەو ستەمکارەکە دەسەنێتەوە، ئێوەش سەرتان سووڕ دەمێنێ.

١ بخاري، تفسير (١١) ٥؛ مسلم، البر ٦١.
٢ عجلوني، كشف الخفاء ٣٠/٣٠.

ئەوەتا ستەمکاران لەمرۆدا جڵەویان گرتووەتە دەست و لە سەرەڕۆییدان، بەڵام نەکەن سەیری ئەم بارودۆخە بکەن و بێئومێدی بتانگرێ. چونکە چەند "قَرِيَةَ"ی وا هەبووە خوای گەورە مۆڵەت و دەرفەتی پێداون و، وەك بڵێی پێی وتن: ''بخۆن و بخۆنەوە و ڕابوێرن.'' کەچی هەر ئەوەندەی دەزانیت گرتوونی و کاری تەواو کردوون.[1]

ئەگەر بە چاوێکی پەندبینەوە تەماشایەکی دەوروبەرتان بکەن، ئەوا ئێوەش چەندین نموونەی زیندوو و ئاشکرای ئەمەتان بەرچاو دەکەوێت. "سەدۆم، عاموورا، پۆمپێی" تەنها سێ نموونەی ئەمەن. کێ دەزانێ، لەوانەیە چەندین نموونەی تر هەبن کە ناومان نەبیستبێتنن، یان لەبەر ئەوەی هێندەی ئەوانی دیکە پەند ئامێز نەبوون، لەبیر کراون. هەمووشیان بە زمانی حاڵیان شایەتی لەسەر ئەم یاسا خواییە دەدەن.

چ پێویست دەکات ئەوەندە دوور بڕۆین؟ ئەوەتا سەردەمانێك لەم خاکەدا کە ئێستا لە سەری دەژین، دەوڵەتێکی مەزن هەبوو. تەنانەت بە خەونی کەسیشدا نەدەهات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بڕووخێت. کەچی ئەو ڕووخانەی کە بە گۆشەی مێشکی هیچ کەسێکیشدا گوزەری نەدەکرد، وا ئەمڕۆ وەك خەمێکی تاڵی جەرگبڕ، نەیتوانیوە ڕزگاری بێ لە تۆمارکردنی لە یادگەی مێژوودا. ئەمڕۆش مشتێك مرۆڤ لەم وڵاتە بچووکەدا، کە سنوورەکانی لە چوارچێوەی "میثاقی میللی"دا دیاری کراوە، لە خەبات کردندان بۆ پاراستنی بوونی خۆیان. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەوتە شەڕەنگێزە ناوخۆیی و دەرەکییەکان تەنانەت ئەم تۆزە مافی ژیانەشیان پێ ڕەوا نابینن.

ئەمەش یاسایەکی نەگۆڕە.. "جا ئیتر تۆڵە و گرتنی پەروەردگارت بەم جۆرەیە..!" مێژوونووس و کۆمەڵناسە ڕاستەقینەکانی ئاییندە سوودێکی زۆر وەردەگرن لەم یاسا نەگۆڕە خواییە و، ئەو نموونانەش کە لە گۆڕستانی مێژوودا نێژراون. لەوانەشە ئەم سوود وەرگرتنەیان ببێتە هۆی ئەوەی کە بەدرێژایی چەندین سەدە زیندوو و لە سەرپێ بمێنن. وەك چۆن زۆرێك لە مەسەلە و ڕوونکردنەوەکانمان سپاردەی گەوهەری گوفتاری ئەو سوڵتانە کردووە کە ئاسۆمانی ڕازاندووەتەوە، هەر بەو جۆرە، ڕاڤە و لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەشی پێ دەسپێرین و، دەچینە خزمەت فەرموودەیەکی تر.

---

[1] بڕوانە: سورەتی حج، ئایەتی ٤٨.

## ٢١. حەوت کۆمەڵ لە سێبەری عەرشدا

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەفەرموێ:

سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: اَلْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَ شَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللهِ، وَ رَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَ رَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللهِ اِجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَ تَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَ رَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَ جَمَالٍ فَقَالَ إِنِّي أَخَافُ اللهَ، وَ رَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لَا تَعْلَمَ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، وَ رَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ

"خوای گەورە لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) کە هیچ پەناگەیەك نییە جگە لە سێبەری خۆی، حەوت کەس لەژێر سێبەرەکەیدا پەنا دەدات. (یەکەمیان) ئیمام و پێشەوایەکی دادپەروەر. (دووەمیان) ئەو گەنجەی تەمەنی لە نێو نەشوەی پەرستشدا بەسەر دەبات. (سێیەمیان) ئەو کەسەی دڵبەستەی مزگەوتەکانە. (چوارەمیان) هەریەك لەو دوو کەسەی کە لەبەر خوا یەکتریان خۆشدەوێ، لەبەر خوا کۆ دەبنەوە و، هەر لەبەر خواش جیادەبنەوە. (پێنجەمیان) ئەو کەسەی لە بەرامبەر داوی خواستی ئافرەتێکی خاوەن پلەوپایە و جوانیدا (بەرپەرچی نەفسی دەداتەوە) دەڵێ "من لە خوا دەترسم". (شەشەمیان) ئەو کەسەی سەدەقە هێندە بە نهێنی دەبەخشێ، ئەوەی لە لای ڕاستییەوەیەتی، نازانێ چی بەوی لای چەپی داوە. (حەوتەمیان) ئەو کەسەی لە تەنهاییدا یادی خوای گەورە دەکاتەوە و چاوی پڕ دەبێت لە فرمێسك."[1]

ئەم لایەنانەی سەرەوە، کە هەریەکەیان بۆ خۆی دارای بایەخێکی تایبەتییە لە ڕوانگەی ئیرادەی مرۆڤەوە، کۆمەڵە بابەتێکی ئەوتۆن، کە بەجێهێنانی هەندێکیان کارێکی سەخت و دژوارە و، هەندێکی تریشیان پاشقولی جددی لە ڕۆح دەگرن. خۆ گەر مرۆڤ لە هەندێکیشیان ڕزگاری بێ، ئەوا هەردەم ئەگەری کەوتنەناو داوی ئەوانی تری هەیە. دەربازبوونیش لەم بۆسە بکوژانەی کە ئەگەر پارێزگاری و چاودێری خوای گەورە نەبێ، هەرگیز دەربازبوون لێیان مەیسەر نابێ، هەروەها بەجێ گەیاندنی ئەم بەرپرسیارییەتە

١ بخاري، أذان ٣٦؛ مسلم، زكاة ٩١.

دژواره تاقەت پرووكێن بگره تاقەت بەزێنانەش بە سەركەوتوویی، دیسانەوە لە ڕێی ئەو ئیرادەیەوە دەبێ كە بە پەسەندترین و بەهێزترین هۆكاری ڕاكێشانی پارێزگاری و چاودێری خوای گەورە دادەنرێت، بەوەش كە مرۆڤ پەیوەندییەكی توندوتۆڵی لەگەڵ پەروەردگاریدا هەبێ...

جا فەرموودەكە بە باسكردنی ئەم دیمەنە لە سەرگوزشتەی ئەو كۆمەڵە قودسییەی كە هەمیشە بە ئیرادەیانەوە لەسەر پێ وەستاون و توانیویانە بوونیان هەبێت و هەمیشە پتەویی وابەستەیی خۆیانیان بە پەروەردگاریانەوە سەلماندووە، لە ڕاستیدا وێنای ئەو كۆمەڵگە ویژدانییەمان بۆ دەكات كە لە یوتۆپیاكاندا بەدوایدا دەگەڕاین، بەردەوام بەدوایدا دەگەڕاین بەڵام هەرچیمان دەكرد بۆمان نەدەدۆزرایەوە. جا فەرموودەكە بە مەبەستی گەیشتنەوە بەم بەختیارانە، ئاخمان پڕ دەكات لە تاسە و، دڵمان دەخاتە پەرواز.

بەڵێ، لەو ڕۆژەدا كە خۆر جێی هەورەكان دەگرێتەوە و بە تینی بەتینی هەموو لایەك دەبرژێنێ و مێشكەكان دێنە كوڵین و ئارەق تەنگ بە گەرووەكان هەڵدەچنێت و هۆكارەكان بەجارێك لەكار دەكەون و هەموو شتەكان لە دژی مرۆڤ دەكەونە كار، بەڵێ، لەو ڕۆژەدا، جگە لە پارێزگاری و چاودێری پەروەردگار، هیچ سێبەرێكی تر نابێت، هەر ئاشكرێ هەبێت. جا گرنگ نییە ئەو سێبەرە سێبەری عەرش بێت یان هی شتێكی تر، گرنگ ئەوەیە كە ئەم سیستەم و ڕێسایەی ئێستا هەیە، دەگۆڕێت و پێوەرەكان سەروژێر دەبنەوە و ئاسمان و زەویش دەگۆڕێن بۆ شتێكی تر.

ئاشكرایە لەو ڕۆژە سامناكەدا كەس پشتیوانیی كەسی بۆ ناكرێ و، پارێزگاری و تكای كەسیش كەڵكی نابێت. جا لەو ڕۆژەدا كەهەموو لایەك كشومات دەبن و، گیانەكان دێنە قورقوڕاگە و، سەران دەسووڕێن و، چاوان ئەبڵەق دەبن، كەس دەتوانێ كەس بپارێزێ.

بەڵێ، لە وەها ڕۆژێكدا تەنها یەك پەناگە هەیە، ئەویش سێبەری پارێزگاریی خوای گەورەیە. ئەوانەش كە سوود لەم سێبەرە وەردەگرن بریتیین لە:

أ) ئەو سەرۆك وڵات و پێشەوایەیە كە لە دنیادا لە ئاست هەستی بەرپرسیارێتییەكەیدا

بووه و، له پاڵ چاودێری کردنی ئەو ڕاسپاردانەی که له ئەستۆیدا بوون، نوێنەرایەتی دادگەری و ڕاستڕەویشی کردووه.

ب) ئەو گەنجە خوێنگەرمەی له هەرەتی کەفوکوڵی خواستە نەفسانییەکانیدا، سەرباری ئارەزووە جەستەیی و لاشەییەکانی، خۆی تەرخان کردووە بۆ بەندایەتی خوای گەورە.

ج) ئەو مەردی مەیدانی بەندایەتییەی کە حەز و ئارەزووی بەندایەتییەکەی لە پێش داخوازییە جەستەییەکانییەوەیە و، بەردەوام دڵی بۆ مزگەوت لێ دەدات.

د) ئەو گیانفیدایانەی خۆشەویستی کە لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆشدەوێت، کاتێك کۆ دەبنەوە، لەبەر خوا کۆدەبنەوە، کاتێکیش لێك جیا دەبنەوە، هەر لەبەر خوا لە یەك جیا دەبنەوە و، ڕەزامەندی و خۆشەویستی خوایان کردووە بە میحراب.

هـ) ئەو دلاوەرەی هەمیشە لە چوارچێوەی پەرژینی (مَخَافَةُ الله) و (مَحَبَّةُ الله)دا ژیانی بەسەر دەبات و تا بڵێی هەستیارە لە پاراستنی عیففەت و عیصمەتیدا و، ئەوپەڕی خۆڕاگرە لە ئاست خواستە شەهەوانییەکانیدا و، داواکارییە خراپەکانی نەفسی بە هزر و نەعرەتەی "من لە خوا دەترسم." وەدەر دەنێت و لەخۆی دوور دەخاتەوە.

و) ئەو پاڵەوانی ئیخلاس و جوامێرییەی کە وەك هێمای صەداقەت و وەفا لە بەرامبەر پەروەردگاردا، ماڵ و سامانەکەی لە دەمی خۆی دەگرێتەوە لە پێناو ڕەزامەندی خوادا دەیبەخشێت. ئەم کارەش بە ڕۆحیەتێکی واوە ئەنجام دەدات کە دەگاتە پلەی ئیرەیی و، حەز ناکات جگە لە خوا کەسی تر پێی بزانێت.. ئەم حەز نەکردنەشی لە ئاستێکدایە، کاتێك شتێك بەوەی (لای) دەستەڕاستی دەبەخشێت، هەوڵ دەدات لەوەی (لای) دەستە چەپی بشارێتەوە.

ز) ئەو قارەمانە بە هەست و دڵ زیندووەی کە بە تێفکرین و چاودێریکردنی نەفسی ساتەکانی تەنهایی قووڵتر دەکاتەوە و، تا و ناتاوێکیش بە فرمێسکەکانی بەستەی هەستەکانی دەروونی دەچڕێ و، هەردەم هێزی ئیرادەی لە خواوە وەردەگرێ و، بەو ئیرادە پۆڵایینەشی، ئارەزووی سەرپێچییەکانی نەفسی دەشکێنێت و وردوخاشیان دەکات.

بەڵێ، هەروەك لە چەند فەرمایشتێکی تریشدا هاتووە، ئەو کاربەدەستەی کە بە دادگەری فەرمانڕەوایی دەکات، لە قیامەتدا لەسەر مینبەری نوورین دادەنرێ و، بەهرەمەندی خەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی پەروەردگاری میهرەبان دەبێ.. ئەو گەنجەی کە لە تافی گەنجێتییدا بەندی چوارچێوەی گەنجییەتەکەی نەبووە، بە ڕەزامەندی خوای گەورە خەڵات دەکرێ.. هەروەك چۆن ئەو پاڵەوانی پەرستشەی کە نەخشی ژیانی لە نێوان مزگەوت و ماڵ و شوێنی کاردا دەچنێ، خوای گەورە دەیخاتە پەنا و پارێزگاری خۆیەوە.. ئەوانەشی کەوا بە چاوی "لانکەی برایەتی"یەوە دەڕواننە گەردوون و ژیانیان لە خۆشەویستی و خۆشویسترانیان لە پێناو خوادا بەسەر دەبەن، لە مەحشەردا بەهرەمەندی (مَحَبَّةُ الله) دەبن.. ئەو خاوەن دڵە هۆشیارەشی کە ژیانی دنیای بە دەزووی "مَهابة" و "مَخافة" دەهۆنێتەوە، لە دواڕۆژدا دڵنیادەبێت لەو شتانەی کە لێیان دەترسێ.. هەروەها ئەو وەفادۆستەی کە سەدەقەکەی، وەك پێوەرێك بۆ صەداقەتەکەی دەبەخشێ، لە لایەن ئەو زاتە "هەرە بەوەفا"یەوە پاداشتێکی دەدرێتەوە کە بە خەیاڵیشدا نەهاتبێ..لە کۆتاییشدا ئەو خاوەن هەست و دڵە بێدارەی کە ڕواڵەتی پڕ واتا و، ناوەڕۆکی قووڵ و، لەو ڕووانەوە کە خەڵکی دەیناسن کامڵترین سەرمەشقە بۆیان و، لە دەمی خەڵوەتی لە خزمەت دۆستدا، بە فرمێسکەکانی ناخی خۆی بۆ دەڕێژێ، هەموو سەختییەکان دەبەزێنێ و بە ئاواتەکانی دەگات. جا ئیتر لەپاڵ باسکردنی ئەم خەڵات و پاداشتە ئوخرەوییانەدا کە ئەم کەسانە لە دواڕۆژدا بەهرەمەندی دەبن، فەرموودەکە لە شێوەی تابلۆیەکدا بڕگەیەك لەو کۆمەڵگا نموونەییەشمان دەخاتە پێش چاو، کە هێڵە گشتییەکانی نەتەوەیەکی کامڵ دەکێشێت و، ئەو بناغانەش ڕوون دەکاتەوە کە مرۆڤایەتی بەرەو ئەو ئامانجە دەبەن.

جا نازانم پێویست دەکات دووبارە بڵێینەوە کە: جێ کردنەوەی ئەو هەموو ناوەڕۆکە قووڵەی کە مەگەر بە چەندین بەرگ کتێب ئینجا باس بکرێت، لە چەند دێڕێکدا، هەروەك باسکردنی دەریایەکە لە دڵۆپێکدا..؟

## ٢٢. دنیا سێبەرێکە

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) دەفەرموێ:

مَا لِي وَ مَا لِلدُّنْيَا مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا كَرَاكِبٍ اِسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَ تَرَكَهَا

"من چیم داوە لە دنیا. من لە دنیادا وەك ڕێبوارێك وام کە لەژێر سێبەری دارێکدا کەمێك مابێتەوە و پاشان ڕۆشتبێت و بەجێی هێشتبێت."[١]

دنیا چییە؟ مرۆڤ دەبێت لە بەرامبەر شتە فانی و کاتییەکاندا چۆن هەڵوێستەیەك بکات؟ ئەی باشە مرۆڤ بۆچی هاتووەتە ئەم دنیایەوە و، بۆ کوێ دەچێ؟

ئیدی ئەمە بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفە و، ئەو باسانەش کە چەندین سەدەیە قسەیان لەسەر دەکرێ.. کەچی دەبینین کەوا ئەو پێغەمبەرە نازدارە بە دەربڕینێکی زۆر کورتی ڕەوان هەموو ئەوانەی ڕوون کردووەتەوە. ئەم بابەتە و هاوشێوەکانی، کە کەسانی تر بە چەندین بەرگ کتێب و بەرهەمی بێ شومار کە خۆیان دەدەن لە قەبارەی کتێبخانەکان، نەیانتوانیوە بەشێوەیەکی ڕوون و گومانبڕ بیخەنە ڕوو، وا ئەم سوڵتانی گوفتارە دێت و لەنێو دەربڕینە لەعل و گەوهەرئاساکانیدا بە ڕوونترین و گومانبڕترین شێوە ڕوونی دەکاتەوە. بەڵێ، سەرجەمی مرۆڤایەتی حەیرانی کورتبڕی و ڕەوانیی گوفتارەکانی پێغەمبەری سەروەرمانن (صَلَوَاتُاللهِوَسَلَامُهُعَلَيْهِ).

## ٢٣. پێنج شت کە نەدراوە بەوانەی پێشووتر

أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَ جُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَ طَهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ مَنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ. وَ أُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ وَ لَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَ أُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَ كَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَ بُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً

[١] ترمذي، زهد ٤٤؛ إبن ماجة، زهد ٣.

"پێنج شتم پێدراوە کە پێش من نەدراوە بە هیچ کەسێکی تر. بەهرەمەندی سەرخستنی (خوایی) بووم بە ترس خستنە دڵی دوژمنەوە لە ماوەیەکی درێژی وەك مانگە ڕێیەکەوە. سەرڕووی زەویشم بۆ کراوە بە مزگەوت و هۆکاری پاکژی، جا بۆیە هەرکەس لە ئوممەتەکەم کەوتە کاتی نوێژەوە، (لە هەرکوێ بوو) با نوێژەکەی بکات. غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ کراوە کە پێشتر بۆ کەس حەڵاڵ نەبوو.هەروەرها (مافی) شەفاعەتیشم پێدراوە. (دیسانەوە پێش من) هەموو پێغەمبەرێك تەنها بۆ گەلەکەی خۆی ڕەوانە دەکرا، بەڵام من بۆ تەواوی مرۆڤایەتی ڕەوانە کراوم."[١]

خوای گەورە بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەموان و، بە شێوەیەکی تایبەتیش بۆ هەر ئوممەت و پێغەمبەرێك لوتفێك و چاکەیەکی جیاوازی هەبووە:

ئەوەتا حەزرەتی ئادەم و منداڵەکانی بەهرەمەند بوون بە هەڵبژاردەیی و ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە.. حەزرەتی نوح، بە خەبات و پێداگری و عەزیمەت.. حەزرەتی ئیبراهیمیش بە پلەی باوکایەتی زۆرێك لە پێغەمبەران و، عەشقی تەوحید و دۆستایەتی لەگەڵ خوادا.. حەزرەتی موساش بە پەروەردە و فێرکردن و زانستە کۆمەڵایەتییەکان و شارەزایی لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەدا.. حەزرەتی عیساش بە نەرمونیانی لە مامەڵە ڕۆحیەکاندا و، ئارامی و خۆڕاگری و لێبووردەیی و شەفەقەت و خۆشەویستی.. سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) و ئوممەتەکەشی، وەك زیادەیەك بۆ سەر ئەو تایبەتمەندییانەی کە پێغەمبەرانی پێشوو پێی بەهرەمەند بوون، ئیرادە، حیکمەت، هاوسەنگی، پێکەوە گونجاندن و پێکهێنانیان پێبەخشراوە، کە هەریەك لەمانەش بۆ خۆی تایبەتمەندییەکە لە تایبەتمەندییەکانی جیهانی بوون و کامڵی.

بەم پێیە، لە بەرامبەر ئەوەدا کە ئیسلام لە چاو دینەکانی تردا ئەرك و بەرپرسیارێتی زیاترە، کەچی لە هەمان کاتدا دەتوانین بڵێین لە هەمووان نەرمونیانتر و بەرزتر و بەرەکەتدارتر و مرۆییانەترە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە یەکێك لە خەسڵەتەکانی جیهانی بوونەکەی دادەنرێت.

---

[١] بخاري، تيمم ١؛ مسلم، مساجد ٣.

ئەو فەرموودەیەشی کە لەسەرەوە هێنامانەوە، پێغەمبەری ئیسلام و جیهانی بوونی پەیامەکەی بەشێوەیەکی کاریگەرتر و شێوازێکی ڕەنگینتر دەخاتە بەرچاو.

ئەوەتا کاتێك ڕاگەیەنەرە بەشەرەفەکەی ئەم دینە جیهانی و پەیامە سەرتاسەرییە و یەکەمین نوێنەرەکانی، ئەم سیستەمە جیهانییەیان بە هەموو لایەکی دنیا دەگەیاند، لە ئاست هەستی بەرپرسیارێتی و شعووری ئەرکەکەیاندا بوون. بۆیە دەبینی لە پێناو ڕامکردنی سەرتاسەری جیهاندا، لەم بەرەی جەنگ بۆ ئەو بەرەی جەنگ ڕایان دەکرد و، لە پێناو خوادا تێدەکۆشان و دەکوژران و دەیانکوشت و، بەم شێوەیەش لێوەشاوەیی و لێهاتنی خۆیان بۆ چوونە بەهەشت و بینینی "جَمَالُ الله" دەسەلماند... لەپێناو ئەو پەیامەی بۆی دەژیان، گاڵتەیان بە ژیان دەهات. بەلای کەمەوە، هێندەی حەز و ئارەزووی کەسانی دی بۆ ژیان، ئەمان بە تاسەی گەیشتن بە پەروەردگار گڕیان تێ بەربووبوو و ئاخیان داگیرسابوو و لە هەوڵی هێنانەدی جێنشینیی سەر زەویدا بوون. هەر بۆیە بەرەنگاربوونەوەی ئەم کەسانەی کەوا ژیانیان لەسەر خولگەی ئاوەها وابەستەییەك بە دوارۆژەوە بنیات نابوو، لە توانای کەسدا نەبوو. ئەوانەش کە بە هەڵە یاخود نەزانی، خۆیان دووچاری بەدبەختییەکی لەو جۆرە دەکرد، بە ترسێك کە هەر لە دوورەوە مرۆڤ دەتۆقێنێت، دەکەوتنە لەرزە و، هەر لە یەکەم هەنگاوی ڕێدا پەکیان دەکەوت و ئیفلیج دەبوون. جا با ئەوە لەولاوە بوەستێ کە بە گەورە گرتنی پەروەردگار لەلایەن بەرەی ئیمانەوە لە شێوەی سام و هەیبەتدا لە ئیمانداراندا ڕەنگی دەدایەوە. بۆ ئەوانەی ئیمانی ڕاستەقینەیان بە دەست هێناوە: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ چەکێکی چ ناوازە و تەڵایەکی چەندە پتەوە...

ئەوەش کە زەوی بۆ شوێنکەوتووانی ئەم دینە کراوە بە مزگەوت، واتە، بەجێهێنانی پەرستش لەلایەن هەر موسوڵمانێکەوە کە بیەوێ، لە هەر شوێنێ کە ئارەزووی لێبێ و بێ ئەوەی پێویست بە پەرستگا یان شوێنی نوێژ بێت، یەکێکە لە ڕەهەندەکانی جهیانی بوونی ئیسلام. حەلاڵ کردنی غەنیمەتیش ڕەهەندێکی ترە و مەبەست لێی بەردەوامی پێدانی فەرمانبەریی جیهادە کە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، بێ هیچ گیرخواردن و پەککەوتنێك. ڕەهەندێکی تریش بریتییە لەو شەفاعەتەی کە لەودنیا بە شەفاعەتی

هەرەمەزن "الشَّفَاعَة العُظمَی" ناسراوە و تا ڕادەیەك دەستی هەموو کەسێك دەگیرێت و دەگەیەنرێتە ئاستێکی دیاریکراوی سەلامەتی. ئەوەش کە هەر پێغەمبەرێك بەتەنها بۆ گەلەکەی خۆی نێردراوە و، ئەویش (صَلَّیاللهُعَلَیهِوَسَلَّمْ) بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، ڕەهەندی ڕاشکاویی بابەتەکەیە.

جگە لەمە، بێ هیچ جۆرە زۆر لە خۆکردنێك دەتوانین ئەم چەند خاڵەش لە فەرموودەکە هەڵێنجێنین:

أ) پێغەمبەرایەتی و ئەو پەیامەش کە پێوەیەوە ڕەوانەکراوە، بەخشش و بەهرەمەندییەکی خوایی ئەوتۆیە کە بە هیچ جۆرێك بە هەوڵ و تێکۆشان بەدەست نایەت.

ب) ئەم پێنج تایبەتمەندییە، بە تەواوی مانا "مەزهەریەتی موحەممەدی"ن و، نەدراون بە هیچ "نەبی" و "مورسەل"ێکی تر.

ج) ترس و بیم خستنە دڵی دوژمن لە مەودایەکی دوورەوە، دەرکەوتەی حاڵەتێکی پێغەمبەرانەیە و، تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەو جەمسەرەدا دەژین.

د) نەبەستنەوەی پەرستشەکان بە پەرستگا و پیاوانی ئایینییەوە، وەك چۆن مەودایەك لە مەوداکانی جیهانی بوونی ئیسلام پێك دەهێنێت، لە هەمان کاتدا ئاماژەش بۆ ئەو ئاسانکارییە دەکات کە مرۆڤ لە هەموو کات و لە هەموو جێیەکدا دەتوانێت لە چوارچێوەی پەیوەندی خالق و مەخلوقدا پەیوەندی بە خوای خۆیەوە ببەستێت. یەکێکی تر لەو لایەنانەی کە لەگەڵ ئیسلامدا هاتووە و جێی خۆیەتی لێرەدا تۆماری بکەین، توانای پاکژکاری گڵە هەروەك ئاو. جا نازانم تۆ بڵێی پێویست بکات هەڵوێستە لەسەر گرنگی خۆشۆردن لە ئیسلامدا و ، پاکژکاری و گرنگی ئاو و، توانای گۆڕانی گڵ بکەین؟

هـ) غەنیمەت خۆی لە خۆیدا حەرام نەبووە، بەڵکو ئەو یاساغە، تاقی کردنەوەیەك بووە و وابەستەی کاتێکی دیاریکراو بووە. لە سەردەمی پێغەمبەری سەروەریشماندا (صَلَّیاللهُ عَلَیهِوَسَلَّمْ) ئەو هۆکارانەی کە ئەم حوکمەیان لێ کەوتبووەوە، تێپەڕێندرابوون، یاخود هەر نەمابوون. هەروەها لەو ڕوانگەیەوە کە یەکەمین سەرچاوەی غەنیمەت و گرنگترینیان بریتییە لە جیهاد، جیهادیش هەروەك لە ناوەرۆکی ئەم فەرموودەیەوە تێدەگەین: اَلْجِهَادُ

مَاضٍ إِلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ کردەوەیەکە کە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، بۆیە لەو ڕووەوە کە ئەم غەنیمەتە دەبێتە سەرچاوەی بژێوی و هاندان و خەڵاتکردنی ئەوانەی خۆیان بۆ ئەم کارە یەکلایی کردووەتەوە و، لە هەمان کاتیشدا لە ڕووی ماددییەوە زیان بە بەرەی دوژمن دەگەیەنێت و لاوازیان دەکات و دەرفەتی خۆ کۆکردنەوەیان بۆ ناهێڵێتەوە، کارێکی لەڕادەبەدەر گرنگە. ئیتر لەبەر گرنگییەکەی، گەر واجبیش نەکرابێت، ئەوا ڕێگە پێدراوە و کراوە بە "موباح". ئەمە وێڕای ئەوەی کە نابێتە ڕێگر لە بەردەم ئیخلاسدا، کە یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی "إِعلَاءُ كَلِمَةِ الله".

و) شەفاعەت حەقە.. بە ئیزنی خوا هەموو کەسێ دەتوانێ شەفاعەت بکات. بەڵام ئەو شەفاعەتە هەرەمەزنەی کە لە ڕوانگەی گشتگیری و هەمەکێتی و چۆنێتییەکەیەوە تا ڕادەیەك پەیوەندی بە هەموو کەسێکەوە هەیە، تەنها دەبەخشرێتە ئەو زاتە و، یەکێکە لە "تایبەتمەندییەکانی ئەحمەدی" و بە دڵنیاییەوە بۆ ئێمەش مایەی شانازی و شادمانییە.

ز) ناردنی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ السَّلام) لە چوارچێوەیەکی بەرتەسك و تەنها بۆ گەل و هۆزەکانی خۆیان، ناردنی سوڵتانی پێغەمبەرانیش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی بگرە بۆ سەرجەمی بوونەوەران، دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆ گەل و هۆزە جیاوازەکان نێرراون، بەندە بە مانەوەی ئەو گەل و هۆزانەوە. لە بەرامبەریشدا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو پەیامە مەزنەی کە پەیوەندی بە هەموو گەردوونەوە هەیە، تا دنیا دنیا بێت هەر بەردەوام دەبێت.

فەرموون ئەمەش ڕشتەپەیڤێك لە ڕووناکی، کە لە ڕوانگەی ناوەڕۆك و هێزی دەربڕین و پتەویی و گشتگیرییەوە بە دەوری ڕووگەیەکی کۆکەرەوەی زۆر گرنگدا هۆنراوەتەوە.

## ٢٤. ئیماندار مرۆڤی بەرپرسیارێتییە

كُلُّكُمْ رَاعٍ وَ كُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ. اَلْإِمَامُ رَاعٍ وَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ. وَ الرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَ هُوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَ الْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَ مَسْؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا. وَ الْخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ

"هەریەك لە ئێوە شوان (سەرپەرشتیار)ن و بەرپرسیارن لەوەی لەژێر دەستاندایە. سەرۆكی وڵات شوانە و لێپرسراوە لەوانەی لەژێر دەستیدان. هەر تاكێك شوانی ماڵ و منداڵەكەیەتی و لێیان بەرپرسە. ئافرەت شوانی ماڵی مێردەكەیەتی و بەرپرسە لەو شتانەی لە بازنەی چاودێری ئەودان. خزمەتكار شوانی ماڵی گەورەكەیەتی و لێپرسراوە لەو شتانەی لەبەردەستیدان. هەمووتان شوانن و، هەمووشتان بەرپرسن لەو شتەی لەژێر دەستاندایە."[١]

وشەی "رَاعٍ" بە واتای ئەو كەسە دێت كە پاسەوانی و پارێزگاری و چاودێری شتێك دەكات. بۆیە بە شوانیش دەوترێ "الرَاعِي" چونكە ئەو ئاژەڵانەی كە خراونەتە ئەستۆی لە سەلامەتترین و گونجاوترین لەوەڕگادا دەلەوەڕێنێت و، لە ئاژەڵی دڕندە دەیانپارێزێت و، ئەگەر لە حاڵێكیشدا تووشی شتێك ببن، ئەوا دڵسۆزانە لەنزیكەوە گرنگییان پێ دەدات. لە دەمی ڕاپەڕاندنی ئەم ئەركە پیرۆزەشدا، پاڵفتەیی فیترەتی دەپارێزێت و هەموو كاتێ خۆی لە دزینی نامەردانە بەدوور دەگرێ و، لە سایەی ئەو هەستی شەفەقەتە قووڵ و، بەزەییە فراوانەیەوە كە بەرامبەر بە ڕانەكەی لە دڵیدایە، بە ئازاریان ئازار دەچێژێ و بە خۆشیشیان خۆشحاڵ دەبێ.

جا ئیتر پەیوەندی نێوان سەرۆكی وڵات و هاوڵاتیانیش لە ڕوویەكەوە لەم پەیوەندییە دەچێت. هەر بۆیە ئەركی سەرشانی سەرۆكی وڵات و نوێنەرەكانیەتی لە بازنە جیاوازەكانی كارگێڕیدا - بێ گومان هەریەكەو بەگوێرەی ئاستی خۆی - كە ئاگایان لە هاوڵاتیانی

١ بخاري، جمعة ١١؛ مسلم، الإمارة ٢٠.

ژێر دەستیان بێ و لە شین و شادیدا هاوبەشیان بن و دوارۆژی گەشیان بۆ دابین بکەن و چارەسەر بۆ کێشەکانیان بدۆزنەوە.

هەمان پەیوەندییش لە نێوان سەرۆکی خێزان و ئەندامانی خێزانەکەیدا بەرچاو دەکەوێت. وەك چۆن سەرۆك خێزان بەرپرسی یەکەمە لە دابینکردنی خەرجی و پۆشاك و نیشتەجێ کردنی خێزانەکەی لە جێگەی گونجاودا، هەر بەو جۆرەش بەرپرسیارە لە پەروەردە و فێرکردنیان و، جوان مامەڵە لەگەڵ کردنیان و، دەستەبەر کردنی بەختەوەری دنیا و دوارۆژ بۆیان.

هەمان حاڵەت بەسەر مامەڵەی نێوان ژن و مێردیشدا دەچەسپێت. ئەوەتا ئافرەت لە هەڵسووڕاندنی کاروباری ناوماڵ و، پاراستنی سەروەت و ئابڕوو و نامووسی مێردەکەیدا، هاوشێوەی ئەو شوانەیە کە بەرپرسی ڕانەکەیەتی.

پاراستن و چاودێریکردنی خزمەتکار بۆ ماڵ و موڵکی گەورەکەی و، ڕۆڵە بۆ سەروەت و نامووس و کەسایەتی باوکی، دەکرێ هەر لە هەمان چوارچێوەی "راعٍ" و "رَعية"دا خوێندنەوەی بۆ بکرێ. تەنانەت دەکرێ بوترێ: لە دیدی ئیسلامدا هیچ مرۆڤێك نییە گەیشتبێتە ئاستی بەرپرسیارێتی و خۆی لە بازنەی "راعٍ" و "مَرعي"دا نەبینێتەوە. تەنانەت ئەگەر شوانێك هیچ رەعییەتێکیشی نەبێت کە ئاڕاستەی بکات، ئەوا هەر بەرپرسیارە. بەڵێ، هەموو کەس ناچارە کە نەفس و عەقڵ و تەواوی هەست و ئەندامەکانی، هەروەك ئەمانەت بپارێزێت و چاودێرییان بکات.

لەناو هەموو ڕژێم و ئایینەکاندا ئیسلام تاکە ڕێسای ژیانە کەوا ئەرك و بەرپرسیارێتی هەموو تاکێکی بە بچووکترین وردەکارییەوە، هەر لە سەرۆکی وڵاتەوە تا دەگاتە خزمەتکاری ماڵێك، دیاری کردووە. ئەمەش لە سەردەمێکدا کە تەنانەت کەس خەونی بە دیموکراسییەتەوە نەدیبوو. جا بۆیە هیچ ڕژێمێك نییە لە دنیادا کە بتوانێت لەم بوارەدا کێبەرکێی بکات.

ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام دەفەرموێ: "سەرۆکی وڵات بەرپرسە." ئینجا بەدوایدا بەرپرسیارێتی و سنووری بەرپرسیارێتییەکانی، هاودەم لەگەڵ ئەرك و فەرمانبەرێتییەکانیدا

یەك بە یەك ڕیز دەكات.. ئەرك و بەرپرسیارێتی ئافرەت و پیاویش وەبیر دێنێتەوە و، لە كۆمەڵە مەیدانێكی جیا جیادا كۆمەڵە بەرپرسیارێتییەكی دیاریكراو دەخاتە ئەستۆی هەر یەكەیانەوە.. قسە لە بەرپرسیارێتی باوك بەرامبەر بە ڕۆڵەكەی و، ڕۆڵەش بەرامبەر باوك دەكات و، تیشك دەخاتە سەر ئەرك و مافی هەردوو لایان. خۆ ئەگەر پێشكەوتنەكانی جیهان بە هەند وەربگرین، ئەوا دەبینین كە هەر لە سەردەمانێكی زۆر زووەوە قسە لەسەر ئەرك و مافەكانی خزمەتكار و كرێكار كراوە. بەم پێیەش، بە ماوەیەكی زۆر بەر لە شڵەژانە كۆمەڵایەتییەكانی نێو مێژووی مرۆڤایەتی، ڕێگەچارەی دروست بۆ گرفتێكی كۆمەڵایەتی پێشكەش كراوە.

ئەمەش دەربڕینێكی تری پێغەمبەرانەیە كە هەر لە مافی دوو لایەنەی سەرۆكی وڵات و هاوڵاتییەكانییەوە بیگرە - كە زۆربەیان لە "الأحكام السلطانية"دا باسكراون -، تاوەكو مافی ڕۆڵە و دایك و باوك، لەوێشەوە تا دەگاتە مافی ژن و مێرد و، خاوەن كار و كرێكار، هەموویی بە چەند وشەیەكی كەم دەربڕیوە. ئەمە لە كاتێكدا كە ئەم بابەتانە لە كتێبە فیقهی و پەڕاوە ئەخلاقی و پەروەردەییەكان و تۆمارە كۆمەڵایەتی و یاساییەكاندا هەریەكەیان پانتاییەكی فراوانی داگیر كردووە.

## ٢٥. چەند حەرام و مەكرووهێک

إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ وَ وَأْدَ الْبَنَاتِ وَ مَنعاً وَ هَاتِ وَ كَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَ قَالَ وَ كَثْرَةَ السُّؤالِ وَ إِضاعَةَ الْمَالِ

"خوای گەورە یاخی بوون لە دایكان و، زیندەبەچاڵ كردنی كچان و، جێبەجێ نەكردنی (ئەو ماف و قەرزانەی لەسەرتانە) و، وەرگرتنی (شتانێك كە مافتان پێوەی نییە) حەرام كردووە لەسەرتان. هەروەها قسە و قسەڵۆك و، زۆر پرسیار كردن و، ماڵ بەفیڕۆدانی (لێرە و لەوێ) مەكروهـ كردووە بۆتان."[١]

١ بخاري، إستقراض ١٩، الأدب ٦؛ مسلم، أقضية ١٢، ١٤.

## یاخی بوون له دایک

یاخی بوون و سەرکەشی نواندن بەرامبەر بە دایك، بە" عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ" گوزارشتی لێکراوە. ئەم دەستەواژەیەش واتایەکی وا بە مێشکی مرۆڤدا دێنێت وەك بڵێی ئەو منداڵەی لە دایکی هەڵدەگەڕێتەوە و لێی یاخی دەبێت، هەموو پەیوەندییەکی مافداری لەگەڵ دایکیدا دەپچڕێنێ و دەیهاوێژێتە کونجی تەنیاییەوە. ئەگەرچی یاخیبوون لە باوکیش بە هەمان شێوە حەرامە، کەچی لە فەرموودەکەدا تەنها باسی دایك کراوە. دەتوانین هۆکاری ئەمەش بگەڕێنینەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەتان زۆرتر پێویستیان بە پاراستنە و، لە سۆز و لاوازییەکانیشیاندا لەپێش پیاوانەوەن. لەم نێوەندەشدا، ناسك و نیانی و توانای بەرگە نەگرتنی سروشتییان وای لێ کردوون کە زووتر و زۆرتر کاریگەر بن بەم جۆرە مامەڵانە. ئینجا لەو ڕووەوە کە باوکانیش خاوەنی هەمان ئەو مافانەن کە دایکان هەیانە، ئەوا فەرموودەکە پێمان دەڵێت کە هەر سەرپێچی و هەڵگەڕانەوەیەك بەرامبەر بە باوکیش هەر بە یاخی بوون دادەنرێت. بەڵام هەرگیز ناگاتەوە بەو یاخی بوونەی لە بەرامبەر دایکدا دەنوێنرێت.

## زیندەبەچاڵ کردنی کچان

زیندەبەچاڵ کردنی کچان لە سەردەمی جاهیلیدا بە دەستەواژەی "وَأْدَ الْبَنَاتِ" ئاماژەی بۆ کراوە. لەو سەردەمەدا، لە هەندێك ناوچەی دیاریکراو و لەنێو هەندێك توێژی دیاریکراوی کۆمەڵگەدا، زۆرینەی ئەو کۆرپە کیژانەی دەهاتنە دنیاوە، هەروا بە زیندوویی دەخرانە ژێر گڵەوە. هۆکار و پاڵنەرەکانی ئەم نەریتە دڕندانەیە جۆراوجۆر بوون هەندێکیان بە پاڵنەری غیرەتێکی سەیری نەفامییانە، هەندێکی تریش بە بیانووی سەختی بژێوی ژیان یان لە ترسی ئەوەی نەبادا لە ڕێگەی کچەکانیانەوە سەروەت و سامانەکەیان بکەوێتە دەستی بێگانە، هەندێکیش تەنها لەبەر دەمارگیریی خێڵەکی دەستیان دەچووە ئەم کارە قێزەونە. هۆکار و پاڵنەری ئەو کارە هەرچییەك بووبێت، ئەمە کارێکی دزێو و دڕندانە بووە و دەبوایە بەری پێبگیرایە. بەریشی پێگیرا.. بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە شێوەیەکی چڕ و پڕ لەسەر ئەم بابەتە دەوەستان.

## ناپاكی لە ئەمانەتدا

فەرموودەكە بە وشەی "مَنْعاً" ئاماژە بۆ نەگێڕانەوەی ئەو قەرز و مافانە دەكات كە دەبێ بگێڕدرێنەوە. بە وشەی "هَاتِ"یش ئاماژەی كردووە بۆ گرتنە بەری شێواز و ڕێگای جۆراوجۆر بۆ وەرگرتن و داواكردنی ئەو شتانەی كە وەرگرتن و داواكردنیان قەدەغەیە. هەردووكیشیان، واتە نەگێڕانەوەی ئەو شتەی كە پێویستە بگەڕێنرێتەوە و، وەرگرتنی ئەو شتەش كە نابێت وەربگیرێت، حەرامن. حەرامیی ئەمەش هەروەك حەرامی سەركەشی بەرامبەر دایك و باوك و زیندەبەچاڵ كردنی كچانە. لە هەمان كاتدا دەكرێ ئەم دوو وشەیە ئاماژەیان بۆ واتاگەلێكی تریش تێدا بێت. ئەوەتا وشەی یەكەمیان ڕووی لەو كەسەیە كە مافەكانی سەرشانی، هەر لە زەكات و سەدەقەوە، تا دەگاتە كۆمەكییە مادديیەكانی تر، بەرامبەر بە هەژاران و ئەو كەسانەی وان لە ئەستۆیدا، بەجێ ناهێنێت. وشەی دووەمیشیان دەڕوانێتە ئەو كەسەی كە خەریكی سواڵكردن و دەست پانكردنەوەیە. لە شوێنی خۆمانەوە، هەنگاوێك بەرەو پێشتر دەنێین و، دەڵێین: وشەی یەكەم هەموو ئەو قازانجە ناڕەوایانە دەگرێتەوە كە بە ڕێگەی نایاسایی بەدەست هاتوون، هەر لە نكوولّی كردن و زەوت كردنی ئەو سامانانەی كە ڕاستەوخۆ خراونەتە ئەستۆت، تاوەكو نەگێڕانەوەی بەهای چەك و سەنەدەكان و، دەستدانە چەواشەكاری لە ڕێگەی ئیفلاسی ساختە و، هەموو چەشنە قۆستنەوەیەكی جیاوازی نرخەكان، ئینجا دوای هەموو ئەمانەش نەگێڕانەوەی ئەم ناحەقیانە و یاخی بوون. وشەی دووەمیش هەموو چەشنە "وەرگرتن"ێكی زیانبەخش دەگرێتەوە، هەر لە سواڵكردنێكی ئاساییەوە بیگرە هەتاوەكو قۆستنەوەی هەستە ئایینی و نەتەوایەتییەكانی نەتەوەیەك و، داواكاری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی هەندێك هێزی زۆردار، فەرمی بن یان نافەرمی، كە مەبەستیان تێركردنی ئارەزووەكانیانە و، دەستدرێژی گرووپە مافیا گەورە و بچووكەكان و، پەنابردنیان بۆ هەزار و یەك ڕێگای بۆ بە تالّان بردنی سەروەت و سامانی خەڵكی.

ئەم فەرمایشتە پیرۆزە بە دەربڕینێكی كورت و پڕ واتا، ئاماژە بۆ كۆمەڵە مەسەلەیەكی گرنگ دەكات. ئەوەتا باس لەو منداڵانە دەكات كە سیلەی ڕەحمیان لەگەڵ دایك و باوكیاندا بچڕاندووە و كەوتوونەتە سەرگەردانییەوە. ئەو دایك و باوكانەش كە چاوی

خۆیان لە ئاست ئەو سۆز و میهرەبانییەدا دەنوقێنن کە لە سروشتیاندا دانراوە، تەنانەت دەگاتە ئەوەی نکوولی بکەن و، دوور لە بەزەیی و بە شێوەیەکی نامرۆڤانە مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەن. ئینجا دێتە سەر باسی کۆمەڵگا، کە خۆی لە خۆیدا خێزانێکی گەورەیە. لێرەشدا ئاماژە بۆ کۆمەڵە خۆپەرستێك دەکات کە بەرژەوەندی و سوودی خۆیان لە هەموو بەهایەك بەرزتر ڕادەگرن و، بە پێشێلکردنی ئارامی و ئاسایش و ماف و دادپەروەری، کۆمەڵگە دەخەنە مەترسییەوە. جا لەبەر بوونی خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا، هەر هەموویان حەرام کراون. پاشان باس لە سێ حاڵەتی قەدەغە کراوی تر - با نەشگەنە ئاستی ئەوانەی سەرەوە - دەکات کە ئەوانیش بریتین لە: "قِيلَ وَ قَالَ" وتی وتی، "كَثْرَةَ السُّؤالِ" پرسیاری بەجێ و نابەجێ، یان بە هونەرکردنی سواڵ، سێهەمیشیان "إِضاعَةَ الْمَالِ" بە فیڕۆدانی سەروەت و سامان لێرە و لەوێ.

## قسە و قسەلۆك

"قِيلَ وَ قَالَ" بە واتای قسە و قسەلۆك دێت. ئێمە لێرەدا قسە لەسەر بنەڕەتی وشەکان ناکەین. بەڵکو دەمانەوێت کەمێك هەڵوێستە لەسەر ناوەرۆکەکانیان بکەین. قسە و قسەلۆك بەو قسانە دەوترێت کە هیچ کەڵك و سوودێکیان نییە، نە بۆ دنیا، نە بۆ ئاخیرەت، بەڵکو تەنها قسەی زیاد و ناپێویستن. قسەیەکی لەم جۆرە، جا چ لە شێوەی ئەو دەربڕینانە بێت کە هیچ پەیوەندییەکیان پێیانەوە نییە، یان لە چەشنی ئەو قسانە بێت کە لە سنووری قەدەغە کراوەکاندا دێن و دەچن، هەر کامێکیان بێت، بەگوێرەی ئاستی کۆمەڵایەتی ئەوانەی بەم کارەوە خەریکن و، بە لەبەر چاوگرتنی فراوانی گۆڕەپانی بڵاوبوونەوەکەی (هاوشێوەی ڕۆژنامە و بڵاوکراوە و تەلەفزیۆن) دەردێکی کۆمەڵایەتییە لەو کۆمەڵگایانەدا کە تاکەکانی لەکارکەوتوو و، خەڵکەکەشی بێ ئاسۆ و دوور لە ئامانجن، هەرچی چڵك و چەپەڵی کوشندە هەیە کە ئیسلام بە گوناهی نێوان لێوەکانی داناوە، هەر هەمووی لە شەتڵگەی ئەم قسە و قسەلۆکانەوە چەکەرە دەکەن و گەشە دەسێنن. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) قسە کردن یان قسە نەکردن دەخاتە نێو ئەو سێ شتەوە کە لە یەك ئاستدا ڕیزی کردوون و، دەفەرموێ:

مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ، وَ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ، وَ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ

"هەرکەسێ بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بكات یان بێدەنگ بێت. هەرکەسێ بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با ئازاری دراوسێکەی نەدات. هەرکەسێ بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت."[1]

## پرسیاری زۆر

دەتوانین "كَثْرَةَ السُّؤَالِ" بە پرسیار کردنی نابەجێ و بێ مانا، یاخود سواڵکردن بێ ئەوەی پێویستیشی پێی بێت، بگرە کردنیشی بە خوو، لێکبدەینەوە. دیارە هەردووکیشیان لۆمەکراو و زیانبەخشن. لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحدا هەروەك چۆن سواڵکردنی بەدەر لە حاڵەتی ناچاری و ئاتاجی، سەرزەنشت کراوە، ئاوەهاش لۆمەی پرسیارکردنی بێ ئەندازە و بەردەوام کراوە. ئینجا لە هەموو دەرفەتێکدا مرۆڤەکانیان ئاڕاستە کردووە بۆ فێربوونی شتانێك کە سوودی هەبێت بۆ هەست و هزریان. لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین کە قورئانی پیرۆز پرسیار کردن دەکات بە دوو بەشەوە: بەشێکیان پەسەند و، ئەوی تریشیان ناپەسەند. دەتوانین ئەم ئایەتە وەك نموونە بۆ پرسیاری پەسەند و دروست بهێنینەوە: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ .. ﴾ (البقرة : ٢١٥) "هاوەڵان پرسیاری ئەوەت لێدەکەن کە چی ببەخشن." دەتوانین ئەم ئایەتەش وەك نموونە بۆ پرسیاری لۆمەکراو بهێنینەوە: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ .. ﴾ (الإسراء : ٨٥) "حەقیقەتی ڕۆحت لێ دەپرسن."

پرسین یان نەپرسین، سواڵکردن یان سواڵ نەکردن، جا ئیتر هەموو ئەمانە بەگوێرەی ئەوەی پاڵیان داوەتەوە بە پێویستییەکەوە یان نا، لە ئاتاجییەکەوە سەرچاوەیان گرتووە یاخود پێچەوانەکەی، لەنێو "أَفْعَالِ الْمُكَلَّفِينَ"دا لە سەروو ئەو هێڵەوە یان لە ژێریەوە

[1] بخاري، الأدب ٣١؛ مسلم، الإيمان ٧٤-٧٧.

جێی خۆیان دەکەنەوە و، دەردەکەوێت کە ئایا واجبن یا حەرام، موباحن یا مەکروهـ. بۆیە بڕوامان وایە کە ڕاڤە کردن و لێکدانەوەی هاوبەشی ئەو دوو بابەتە، کە وەك دوو مەسەلەی جیاواز دێنە بەرچاو، لە دەوری ئەو ڕووگە یەکخەرەی کە ئاماژەمان پێدا، هۆکارێك بێت بۆ نزیك بوونەوەی زیاترمان لە مەبەستی فەرموودەکە.

## بەفیرۆدانی سەروەت و سامان

دەتوانین "إِضاعَةَ الْمَالِ" بەوە پێناسە بکەین کە بریتییە لە بەهەدەردان و پەرش و بڵاوکردنەوەی سەروەت و سامان بەملا و ئەولادا، بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ جۆرە سوودێکی ماددی یان مەعنەوی، دنیایی یان ئاخیرەتی. کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەردێکی کۆمەڵایەتییە. بەڵێ، بەفیرۆدانی سەروەت و سامان لە شتانێکدا کە هیچ کەڵك و بایەخێکیان نییە، گەر لە یەکەم ڕوانینیشدا وا دەربکەوێت کە زیانێکە و بە تەنها لە خاوەنەکەی دەکەوێت، ئەوا لەو ڕووەوە کە موڵکی ئەو کەسەش بەشێکە لە موڵکی گشتی، هەر بۆیە، ئەو هەڵە خەرجییە کە زیانێکی هەندەکی و تاکەکەسی بوو، دەبێت بە ڕووداوێك کە پەیوەندی بە هەموو گەلەوە هەیە و، زیان گەیاندنە بە تەواوی کۆمەڵگە.

لەگەڵ کۆتایی هێنان بەم بڕگەیە، کە دەست پێوەگرتن و دروستخەرجیی کردبووە تەوەری باسەکەی و، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دارای گرنگییەکی زۆرە و واش دیارە کە لە داهاتوودا گرنگی و بایەخی زیاتر بەدەست دێنێت، دەمانەوێت جارێکی تر ئەو قووڵی و فراوانی و هەمەڕەنگییەتان بخەینەوە پێش چاو، کە ئەو سوڵتانی گوفتارە بەخشیوێتی بە وتەکانی لە ڕێی هەڵبژاردنی ئەو وشانەی بەکاریان دەهێنێت و ئەو جێیانەش کە ئەو وشانەی تێدا دادەنێت.

## ٢٦. ئیحسان

اَلْإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللّٰهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ

"ئیحسان ئەوەیە بە شێوەیەك خوا بپەرستیت هەروەك ئەوەی ببینیت، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی، ئەو تۆ دەبینیٚ."[1]

ئاوێتە بوونی "ئیمان" لەگەڵ "ئیسلام"، بە "ئیسلام"ەوە ژیان لە جەمسەری "ئیحسان"، دروشمی ئیماندارە کامڵەکانە. گەیشتنی ئیماندار لەناو ئیسلام و ئیمانەوە بە مەودایەك، لەسەروو ئیمان و ئیسلامەوە، ئینجا بەجێهێنانی ئەوەی پێویست دەکات بەرامبەر بەم کۆتا خاڵە، ئیحسانە. وەڵامی پەروەردگاریش، کە شایانی شکۆمەندی و مەزنی زاتی خۆیەتی، بەرامبەر بەم ڕووتێکردنە دڵسۆزانەیە، بەگوێرەی دەستووری "چاکە، چاکە بەرهەم دێنێت." ئیحسانێکی ترە.. ئیحسانێك لە جۆری خەڵاتە سەرسوورهێنەرەکان: "شتانێك، نە چاو دیویەتی، نە گوێ بیستوویەتی، نە بە دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا هاتووە."[2] جا خۆ ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَـٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَـٰنُ ﴾ (الرحمن: ٦٠) "پاداشتی ئیحسان، شتێکی تر نییە جگە لە ئیحسان." بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئیحسانی بەندە هەر هێندەی قووڵاییەکەیەتی. واتە لەسەر شێوەی ئیخلاس و ئەدەب و ڕێز و ترسدا خۆی دەنوێنێت. ئەوەی خوای گەورەش (جَلَّ جَلَالُهُ)، بەگوێرەی مەزنی و موڵکەکەیەتی. واتە، بە هەزار و یەك واریداتەوە دڵی بەندەکەی بە ئیمان دەڕازێنێتەوە، بە ئیلهام دەیهێنێتە جۆش و، پەردەی سەر چاوی لادەبات و، حەقیقەتی شتانی پیشان دەدات و دەمی لەوەی پەیوەندی پێوەی نییە دەپارێزێت و، زمانی بە حیکمەت دەخاتە گۆ و، هەستەکانی بێدار دەکاتەوە و بە هەڵاتگەکانی تەجەللیدا دەیگێڕێ. هەر ئەوەندەی ئیماندار گەیشتە ئەو خاڵەی کە تیایدا پەردەی سەر ڕوخساری بوون کەمێك لادەدرێت، ئیدی وەك ئەوە وایە کە "بەبێ چەند و چوون" ئەو زاتە ببینێت. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو زاتە (عَزَّوَجَلَّ) خاوەنی حەقیقەتی ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴾ (الأنعام: ١٠٣) "بینین و بیناییەکان ناتوانن دەرکی بکەن."ە، ئەوا بەندە بەو یەقینەوە کە ئەو زاتە ئاگای لێیەتی و دەیبینیٚ،

١ بخاري، الإيمان ٣٧؛ مسلم، الإيمان ١-٧.

٢ بخاري، توحيد ٣٥؛ مسلم، الجنة ٢-٥.

هەروەها لەتاو چێژی بینینی و، سام و هەیبەتی بینراندی لە لایەن ئەوەوە، لە هۆش خۆی دەچێ. تا ئەوەی لە سایەی ڕەنگداربوونی بە خواپەرستی و ئیخلاس و خشوع و خضوعدا، هەر لە دووتوێی دیتنی ناتەواوی ئەم دنیایەدا، چێژی دیتنی تەواویی ئەو دنیا وەردەگرێت و، بە وێنەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژووەوانێك كە چۆن بەدرێژایی ڕۆژەكەی چێژی ساتەكانی بەربانگ لە ڕۆحیدا هەست پێ دەكات، ئەمیش هەروا، لەو چەند ڕۆژەی صەومی ویصالی دنیادا، چێژە قات قاتبووەكانی عاشیرەكانی وەصلی دۆست هەست پێ دەكات و، لە نێوەندی یەك ژیاندا، بە یەك جار تامی هەزاران ژیان دەكات.

بەڵێ، ئەوەندەی كە بەندە حەز دەكات ئەو سوڵتانی ئەزەل و ئەبەدە ببینێ و، لە ئاسمانی چێژی دیتنیدا شاباڵ بگرێ، ئەوەندەش چێژ لە بینراویی و چاودێری كراویی وەردەگرێ. چونكە دڵنیایە لەوەی كە لەو خزمەتانەیدا كە لە پێناو گەورەكەیدا ئەنجامی دەدات، لە لایەن گەورەكەیەوە دەبینرێ و چاودێری دەكرێ... لە سایەی ئەم چێژەشدا، تەنانەت بچووكترین كردەوەشی كە لەم پێناوەدا دەیكات، ڕەنگی نەشوەیەكی قووڵ و بێپایانی پەرستش دەگرێ.

ئەمەش دەلاقەیەكی بچووك بەڕووی گوفتاری پێغەمبەردا و.. سێ چوار وشەی موبارەكی لەعل و گەوهەرئاسای ئەو سوڵتانی گوفتارە و.. ئەو ناوەرۆكە بەرینەی كە لە چەندین بەرگدا جێی نابێتەوە.

جا ئیتر ئەمە دڵۆپێك لە دەریایەك و، گەردیلەیەك لە خۆر و، چەند ورشەیەك لەو جیهانانەی ئەستێرەكان دەینەخشێنن. پێم وایە هەڵوێستە لەسەر كردن و گوزارشت كردنێك كە شایستەی قەدر و بەهای ئەو گوفتارە نووربەخشانانە بێ كە ئاوێنەی درەوشانەوەی حەقیقەتی ئەحمەدی (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)ن، كاری ئەو نەزانانە نەبێ كە سەریان لە گوفتار دەرناچێ، ئەمە لە كاتێكدا كە خۆشمان كەوتووینەتە بێڕێزییەكی لەم جۆرەوە.. لە سەرەتا و كۆتاییشدا هەر پشت بە خوای گەورە دەبەستین و لێی دەپاڕێینەوە كە لەم پڕكێشییەمان خۆش ببێت.

گەر یادتان مابێت، لە سەرەتادا عەرزم كردن كە ڕاڤە كردن و لێكدانەوەی فەرموودە

پرشنگدارەکانی ئەو سەروەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە تەواوی ڕەهەند و لایەنەکانیەوە، کارێکە لە سەروو وزە و توانای ئێمەوەیە، چاوەڕوانی خۆشمان بۆ دەرکەوتنی مەردانی ئەم مەیدانە دەربڕیبوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەگەر دیسانەوە پڕکێشییەکمان نواندبێ و هەوڵمان دابێت کە چەند لایەنێکی چەند فەرموودەیەك شی بکەینەوە، ئەوا ئەو لایەنانەی کە زاتمان کردووە شیکاریان بکەین، تەنها چەند وتەیەکی نوورانی بوون لە دنیای بەرینی ئەو فەرموودەیە. ئەویش تەنها لەو ڕووەوە کە پەیوەندییان بە قووڵی ناوەرۆك و، پتەوی پەیڤ و هێزی دەربڕینەوە هەبووە، هەموو ئەمانەش بە زمانی عەوام...

جا بۆیە ئومێد دەکەم کە خوای باڵادەست لێمان خۆشبێت و، شارەزایانیش بە چاوی لێبووردەییەوە بۆ کەموکورتییەکان بڕوانن...



# نووری نەمر

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و، وێڵی لقێکن کە خۆیانی پێوە ڕاگیربکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و، لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یان درەنگ، مایەپووچی و بێ ناکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و، بە پرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) ڕادەکەن، ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە.

ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تەختی دڵانە، بە شێوەیەك شایانی قەدر و قیمەتی ئەو بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و، بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و، چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. ئیتر ئەو کات بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە، دەکەوتە پەرواز و لە پێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی، کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکا ...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا، ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیووە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و، بە وێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵێن: ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟ " بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بێت و هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبێت..









نرخ ٣٠٠٠ دینار